# مەملەکەتی

# پێغەمبەران

## بەرگی سێیەم

دیدێکی نوێیە لە قورئان و سوننەت و خوێندنەوەیەکی
واقیعیانەی مێژووە لە ژیانی پێغەمبەران

ماکوان کەریم

بسم الله الرحمن الرحیم

# مەملەکەتی پێغەمبەران

## بەرگی سێیەم

دیدێکی نوێیە لە قورئان و سوننەت

و خوێندنەوەیەکی واقیعیانەی مێژووە لە ژیانی پێغەمبەران

نووسین: ماکوان کەریم

پێداچوونەوە و نووسینەوەی: باران ئاریایی

کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی



**بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خضر ئەحمەد 07824671394 - 07504671394**
**بەڕێوەبەری هونەری: موستەفا موحەممەد کوردی 07509998182**
**فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana**
**ئینستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana**
**لقی یەکەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری**
**لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحمود - بەرانبەر مزگەوتی مەحمود عەلاف**
**ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com**

نەخشەسازی ناوەوە: موستەفا موحەممەد کوردی

نەخشەسازی بەرگ: برەو نەججاڕ

چاپی یەکەم: ٢٠٢٥

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ: ٢٠٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی (١٢٠٠) ـی ساڵی (٢٠٢٤)ـی پێ دراوە.

# مەملەکەتی پێغەمبەران

## بەرگی سێیەم

دیدێکی نوێیە لە قورئان و سوننەت و

خوێندنەوەیەکی واقیعیانەی مێژووە

لە ژیانی پێغەمبەران

نووسین:

ماکوان کەریم

چاپی یەکەم:

٢٠٢٥

له هەر شوێنێک و له هەر کاتێکدا پێغەمبەرێک هاتبێت، مۆری ڕەزامەندی محمد -ﷺی بووە لەسەر زمان.

هیچ نیشانەیەکی ئەحمەدی ئومی نەدابێت، بێ گومان پەروەردگار سرووشی بۆ نەناردووە.

ناوی ئەحمەد ڕەمزی وەحی سەرمەدە و ئەحمەدیشە شایەتحاڵی هەموو پەیامەکان!

# مەملەکەتی پانزەیەم:
# ڕووداوی ژیانی حەزرەتی (یونس)ی کوڕی مەتاء/مەتاو

## ئەشعیا، ئەرمیا، دانیال، عوزێر و زەردەشت

پێش چوونە ناو باسی ڕووداوەکانی (یونس عَلَيهِالسَّلَامُ) پێویستە باسێکی جیهان بکەین و سەنتەری هێز و توانا لەو سەردەمانەدا دەست نیشان بکەین.

زۆرجار مێژوونووسانی ئیسلامیش کاتی پێغەمبەرەکانیان بۆ دەست نیشان نەکراوە، بۆ نموونە حەزرەتی (یونس)، ئیبن کەثیر کە سەیری پێش (داوود) و (سولەیمان) سەلامی خوایان لێ بێت، تەنانەت پێش حەزرەتی (موسا عَلَيهِالسَّلَامُ) باسی ژیانی کردووە بە پێچەوانەی ئەویشەوە جەنابی طەبەری و ئین ئەثیری جەزەری لە دوای حەزرەتی (عیسا عَلَيهِالسَّلَامُ) باسیان کردووە، کتێبی پیرۆز لە دوای (عیسا) کوڕی مەریم باسی کردووە، هەندێک ئینجیلی تریش پێش ئەو باسی کردووە لە کتێبێکدا خاوەنی سفری تایبەتی خۆیەتی بە ناوی سفری یۆنان لێرەدا (یۆنان) مەبەست حەزرەتی (یونس)ە، پێغەمبەرێکی گەورەی نەسارایە، یەکێکە لە پێنج پێغەمبەرە گەورەکە، پێشتر ئاماژەمان پێدا کە ناسارا تەنها بڕوای بە پێنج پێغەمبەری گەورە و ١٢ پێغەمبەری بچووک هەیە، لێرەدا ئێمە شوێن تەرتیب و پلە بەندی نووسەری کتێبی ژیانی پێغەمبەران ( مع الأنبياء) ( عفيق عبدالفتاح طبارة) دەکەوین کە (یونس)ی لە دوای (داوود) و (سولەیمان) هێناوە، ڕاکەی ئەو پەسەند تر بوو، تا ڕای مێژووناسانی تری ئیسلامی.

حەزرەتی (یونس) پێناچێت لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل بێت وەکو (زەردەشت) پێغەمبەر خاوەنی ناوچەو بانگەواز و شەریعەتی تایبەت بووە، لەم کتێبەدا ئێمە لە هەوڵی دەستنیشان کردنی جێگاو ڕووداوی ژیانی پێغەمبەرانی بەرێزداین، واتا مێژووی ژیانی ئەو سەروەرانە دەنووسینەوە، بۆیە ناچار زۆرجار باسی ژیانی پادشای ئێران و میدیاو بابل و...هتد دەکەین بۆ زانیاری خوێنەرە بۆ ئەوەی دەست نیشانی کات و سەردەم و جێگای پێغەمبەرەکان بکەین، سەلامی خوا لە هەموویان بێت، ئەگەر لە ناوچەی گەلی ئیسرائیل واتا مێزۆپۆتامیا بە گشتی کە جێگای بانگەوازی ئەو گەلە بووە، هاوکات لە جێگای تر پێغەمبەری تریش هاتووە وەکو ئێران ناسراوە بە پارسا و هیندستان ناوچەی توبا، یاخود ڕۆژهەڵاتی دوور، بە واتای چین و ژاپۆن و ئەو ناوچانەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بە گشتی.

بێجگە لەئەو ناوچانە سەر لە نوێ لە ئەوروپای ئێستا و لە سەردەمی (یونس) دا دەوڵەت و شارستانیەت دروست دەبێت بەناوی (یۆنان) کە پێدەچێت، ئەم پێغەمبەرە بەرێزە بناغەی دارێژەری ژیار و شارستانیەتەکە دەبێت، هەروەکو چۆن بناغەی دامەزراندنی ڕۆم زەردەشت پێغەمبەرە سەلامی خوا لە هەموویان بێت.

کەواتە لەم کتێبەدا کە ڕوونکردنەوەی زیاتر نادەین لەسەر پادشا و شارستانییەتەکان، چونکە کاری ئەم کتێبە نییە، ئێمە دەمانەوێت تەنها ژیانی پێغەمبەران دەست نیشان بکەین، بەڵام ئەگەر کەسایەتی گرنگ بوو وەکو ئەسکەندەری گەورە، کوروشی گەورە و کەسایەتییەکانی چین کە بە پێغەمبەر ناسراون وەکو (بوزاو لاوتیستۆ، کۆنفۆشیۆس، یەزگورد، یان پیاوانی ڕۆم هەندێکیان و... هتد، ئەم کەسایەتی و ناوانە بۆ زیاتر تێگەیشتن و بەرچاو ڕوونییە بۆ ئەوەی زیاتر کات وسەردەم و جێگای پێغەمبەران بزانیت، کورت و پوخت، هێندەی پێداویستی بابەتەکەمان باسی مێژووی گەلان دەکەین، نووسەر- مەبەستیەتی وەکو کتێبەکانی ڕابردووی ژیانی پێغەمبەران نەبێت کە پەرش و بڵاو بێت و خوێنەر کات و سەردەم جێگاکانی لادیار نەبێت، هەوڵی تەواوەتیمان داوە کە واقیعیانە و جێگا و شوێنەکانی بە دەست بخەین و لە سەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە.

لەبەر ئەوەی ژیان تا ڕادەیەکی زۆر بەرەو پێشکەوتن چوو، خەڵکی زیاتر چاوی کرایەوە و بە جیهان ئاشنا بوون، خوای گەورەش وردە وردە پێغەمبەرانی کەم کردەوە و ڕۆڵەکە ئەداتە دەست بانگەوازچیان و شوێنکەوتوانی پێغەمبەران، هەڵبەت بە ئەندازەی ڕابردوو ئیتر پێغەمبەر نانێرێت واتا لە ماوەیەکدا سێ پێغەمبەر یاخود چوار پێغەمبەر وجودیان هەبێت، بەڵکو لەمەودا ساڵانێکی تولانی دەکەوێتە نێوانی پێغەمبەرانی سەروەرمان سەلامی خوایان لێبێت.




## گەڕانەوە بۆ ناو ڕووداوی یونس (عَلَيْهِ السَّلَامُ)

ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە (٤) چوار جار ناوی لە قورئاندا هاتووە، ناوی (یونس)-ی کوڕی مەتایە، هەندێک لە زانایان دەڵێن مەتا ناوی دایکیەتی بەڵام زانراوە کە مەتا ناوی پیاوە، بە بەڵگەی ئەوەی یەکێک لە نووسەرانی ئینجیلەکان ناوی مەتایە..

هەروەها خوای پەروەدگار بە ناوی ( ذا النون) ناوی بردووە، پاشان بە ( کصاحب الحوت) ناوبراوە، ئەهلی کیتاب بە ( یۆنانی کوڕی ئەمتا) ناویان بردووە.

زانایانی تەفسیر دەڵێن: خوای پەروەدگار ناردوویەتی بۆ خەڵکی ( نەینەوا) کە شاری موصڵی ئێستایە لە وڵاتی عێراق، ئەو دەمە پایتەختی وڵاتی ئاشورییەکان بووە.

ئەو وڵاتە زۆرێک لە ناوچەکانی لە بندەستدا بووە لە باکوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا واتا ئازەربایجان، ئەرمەنیا و... هتد، خەڵکی ئەو وڵاتە لە خێر و خۆشی و شادی دابوون، خوای پەروەردگار ڕزق و ڕۆژی بەسەردا ڕژاندبوون، بەڵام ئەم گەلە سوپاسگوزار نەبوون و بت پەرست بوون.

کۆمەڵێک لە مێژوونووسان دەڵێن، (یونس) خەڵکی ( یافا)یە، بەڵام خوای گەورە ڕەوانەی کردووە بۆ نەینەوا، بۆ ئەوەی لەوێ بانگەواز بکات.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ۝١٣٩﴾ الصافات

واتە: (یونس)-یش عَلَيْهِ السَّلَامُ کە (ذا النون)ی پێ وتراوە بە دڵنیایی یەکێك بووە لە پێغەمبەرانی خوای گەورە۝١٣٩

(یونس) ماوەی ساڵانێکی کەم کە دەڵێن: ماوەی شەش ساڵ بانگەوازی کردووە، بەڵام خەڵکی ناوچەکە هەر یاخی بوون و گوێیان نەداوەتە بە بانگەوازی و لەسەر بێباوەڕی خۆیان ماونەتەوە، حەزرەتی (یونس) ئاگاداری کردوونەتەوە لە تۆڵە و سزای خوای پەروەردگار، لەبەر ئەوەی هیچ وڵامێکیان نەبووە توڕە بووە و ناوچەکەی جێهێشتووە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَـٰفِرُونَ ۝٣٤﴾ سبأ

واتە: ئێمە بۆ هیچ شارێك ترسێنەرو ئاگادارکەرو پێغەمبەرێکمان نەناردووە ئیلا دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارە خراپەکان وتوویانە ئێمە بێباوەڕین بەو تەوحیدو ئیمان و دینەی کە ئێوەی پێ نێردراون و باوەڕمان پێی نییەو شوێنی نەکەوتوون، بەڵکو خەڵکی هەژارو لاوازو چەوساوە شوێنی کەوتوون۝٣٤

هەڵبەتە (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئاگاداری تەواوی کردنەوە لەو نازو نیعمەتانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیون، بەڵام ئەوان بە زیرەکی و توانا دەسەڵاتی خۆیانیان دەزانی، دەیانوت ئێمە خاوەن پارە و سامان منداڵی زۆرین.

خوای گەورە دیمەنەکەمان بۆ باس دەکات دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَـٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ۝٣٥ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ۝٣٦ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَأُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُواْ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَـٰتِ ءَامِنُونَ۝٣٧ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا مُعَـٰجِزِينَ أُوْلَـٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ۝٣٨ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ۝٣٩﴾ سبأ

واتە: ئەوان شانازییان بە زۆری ماڵ و منداڵیانەوە دەکردو وایان دەزانی بەڵگەیە لەسەر خۆشویستنی خوای گەورە بۆیان و ئەیانوت: خوای گەورە فەزڵی ئێمەی داوە بەسەر ئێوەدا ئەوەتا ئێمە ماڵ و منداڵمان لە ئێوە زیاترە لە دونیا، ئەگەر لە ڕۆژی قیامەتیش زیندووو بوونەوە هەبێ ئەوا ئێمە سزا نادرێین﴿٣٥﴾ ئەی محمدصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێیان بڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم ڕزقی خۆی فراوان ئەکات بە فەزڵی خۆی بۆ هەر کەسێك کە ویستی لێ بێ، کەم و تەسکی ئەکاتەوە بۆ هەر کەسێك کە ویستی لێ بێت بە گوێرەی حیکمەتی خۆی، زۆری ڕزق و ڕۆزی و ماڵ و منداڵ بەڵگە نییە لەسەر خۆشویستنی خوای گەورە بۆ ئەو کەسە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم شتە نازانن﴿٣٦﴾ ماڵ و منداڵتان ئەو شتە نییە کە لە ئێمەتان نزیك بکاتەوە، واتە: وا نییە کە کەسێك ماڵ و منداڵی زۆر بێ لە ئێمە نزیك بێت و ئەوەی نەیبێت یان کەمی هەبێت لە ئێمە دوور بێت نەخێر وانیەو ئەم پێوەرە هەڵەیە، خوای گەورە تەماشای ماڵ و منداڵ و لاشەتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵ و کردەوەتان دەکات. مەگەر کەسێك ئیماندار بێت و کردەوەی چاك بکات و منداڵەکانی جوان پەروەردە بکات لەسەر خواپەرستی، ماڵی لە ڕێی خوای گەورە سەرف بکات ئەو کاتە لە ئێمەی نزیك ئەکاتەوە ئا ئەمانە پاداشتی چەند قاتێکیان بۆ هەیە یەك بە دە تا یەك بە حەوت سەد تا زیاتر، لەناو ژوورەکانی بەهەشتدا ئەمین و پارێزراون لە سزا﴿٣٧﴾ ئەو کەسانەی کە هەوڵ دەدەن و کۆشش دەکەن بۆ ئەوەی ئایەتەکانی ئێمە ڕەت بکەنەوەو تانەو تەشەری لێ بدەن و ڕێگری لە دین بکەن ئەوانە لە ژێر دەسەڵاتی ئێمە ڕزگاریان نابێت، ئەمانە لەناو سزای ئاگری دۆزەخدا ئامادەن و سزایان دەدەین﴿٣٨﴾ ئەی محمدصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بڵێ: بە دڵنیایی پەروەردگارم بە فەزڵی خۆی ڕزق و ڕۆزی خۆی فراوان ئەکات بۆ هەر کەسێك کە ویستی لێ بێت لە بەندەکانی، بۆ هەر کەسێکیش کە ویستی لێ بێت کەمی ئەکات بە گوێرەی حیکمەتی خۆی، هەر شتێك کە ئێوە لە پێناو خوای گەورەدا ببەخشن ئەوا خوای گەورە لە دونیا جێگەتان بۆ پڕ ئەکاتەوە، و لە قیامەتیش پاداشتان ئەداتەوە، خوای گەورە باشترین ڕۆزیدەرە﴿٣٩﴾

حەزرەتی (یونس عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) بەجێهێشتن و کەوتە ڕێ بۆ سەر کەنارەکانی دەریای سور هەندێک لە مێژوو نووسان دەڵێن ئەنتالیا بووە.

خەڵکی ناوچەی نەینەوا کە زانییان (یونس عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) جێیهێشتوون و ئەوانیش نیازی تەوبە کەوتە دڵیان، هەروەها باس لەوەکراوە کە هەورێکی ڕەش ئەو ناوچەی داپۆشیوە و خەڵکەکە هەموو زانیویانە کە پەیمانی (یونس) ڕاست بووە لە گەڵیاندا، بۆیە هەموو بە گشتی تەوبەیان کرد، گەڕانەوە بۆلای خوای پەروەردگاریان خوای گەورە لێیان خۆش بوو و سزای نەدان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَـٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَـٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴿٩٨﴾﴾ یونس

واتە: خەڵکی هیچ دێیەك ئیمان سوودی پێ نەگەیاندن تەنها قەومی (یونس عَلَیهِالسَّلَامُ) نەبێت کە لە نەینەوا بوون، کاتێك کە ئیمانیان هێنا پێش ئەوەی سزای خوای گەورە بێت و نیشانەکانیان بینی، تەوبەیان کرد و خوای گەورە ڕاستگۆیی ئەوانی زانی لە تەوبەکردندا، خوای گەورە لە ژیانی دونیادا سزای سەرشۆڕی و ڕیسوایی لەسەر لابردن، وتراوە سزای قیامەتیشیان لەسەر لاچوو چونکە باوەڕیان هێنا. تا ماوەیەکی دیاریکراوی تر لەسەر ڕووی زەوی ژیاندیانم﴿٩٨﴾

خەڵکی ئەو ناوچەیە بە گشتی هەموو خواناس و ئیمانداربوون موسوڵمان بوون بە دینی خوای موتەعال، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَـٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُواْ فَمَتَّعْنَـٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴿١٤٨﴾﴾ الصافات

واتە: پاشان ناردمان بۆ لای خەڵکی (نەینەوا) کە سەد هەزار کەس یاخود زیاتر بوون﴿١٤٧﴾ دوای ئەوەی کە نیشانەی پێغەمبەرایەتیان بینی، یاخود هەندێك لە نیشانەکانی سزای خوای گەورەیان بینی، هەموویان ئیمانیان هێناو خوای گەورە سزای نەدان، ژیاماندن تا کۆتایی ئەجەل و کاتی دیاریکراوی خۆیان﴿١٤٨﴾

(یونس) ئاگای لەم ڕووداوە نییە و هەواڵی ئیمانداربوونی ئەوان نازانێت، بۆیە کە چووە سەر ڕۆخی کەنار دەریا لەوکاتەدا کەشتییەک، ئامادە بوو بۆ دەرچوون، ئایا ئەم کەشتییە بەرەو دوورگەکانی ئەوروپا، یان بەرەو ناوچەکانی فەڵەستین لە سەر کەناری دەریای ناوەڕاست، هیچ زانیاریەکی دڵنیاکەرەوە لەو بوارەوە نییە.

حەزرەتی (یونس عَلَیهِالسَّلَامُ) چووە ناو کەشتییەکە و لە کاتی ڕاکردنیدا بە دەریادا، شەپۆل و باو طوفان هەڵیکرد، خەڵکی ناو کەشتییەکە بیرو باوەڕیان وابوو کە هۆکاری ئەو شەپۆلە بەهێزو باوربوانە دەگێڕنەوە بۆ کەسێک لەناو کەشتییەکەدا کە تاوانبارە، هەر کەسە باسی خۆی کرد لە ناویاندا کەسێکی وانەبوو کە تاوانبار بێت. ئەگەرچی حەزرەتی (یونس عَلَیهِالسَّلَامُ) فەرمووی کە پێغەمبەرەو بۆ خەڵکی نێردراوە، گوایە لە مێژووەکاندا هاتووە ( ڕاکێشانی ناویان) کرد کە کێ دەرچوو ئەوە تاوانبارە، جاری یەکەم (یونس) دەرچوو، خەڵکەکە هەموو ڕازی نەبوو، جاری دووەمیش دووبارە(یونس) دەرچوو، لەناوەکاندا، پەشیمان بوونەوە گوتیان ئەوە تەنها ڕاکێشانی ناوێکە، بۆ جاری سێیەم هەر حەزرەتی (یونس) دەرچوو پاشان خۆی بڕیاریدا کە بڕواتە ناو دەریاکە و ئەوان جێ بهێڵێت.

هەڵبەت گێڕانەوەی تر زۆرە لەم بارەیەوە، بەڵام نووسەر ئەم گێڕانەوەی بێ ڕاستر بوو هەروەها ئەقڵانی تر بوو لە گێڕانەوە مێژووییەکانی دیکە، بە هۆکاری ئەوەی کە گوایە کەشتییەکە قورس بووە، خەریک بووە نغرۆ ببێت، ئەوە ناچێتە بواری ڕاستی چونکە کەشتی بە

کەسانێک و گۆڕانکاری کێشی بەسەردا نایەت، بۆیە هاوشێوەی کەشتی (نوح) باسکراوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ۝ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ۝ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ۝﴾ الصافات

واتە: (یونس)-یش (عَلَيْهِ السَّلَامُ) کە (ذا النون)ی پێ وتراوە بە دڵنیایی یەکێك بووە لە پێغەمبەرانی خوای گەورە۝ کاتێك کە وایزانی خوای گەورە سزای قەومەکەی ئەدات، کە سزاکە دواکەوت ئەم قەومەکەی خۆی بەجێ هێشت و چووە ناو کەشتیەکەوە کە کەشتیەکە پڕ بوو لە شتومەك۝ نزیك بووە کەشتییەکە نوقم بێت، تیرو پشکیان کرد بۆ ئەوەی هەموویان نقوم نەبن کەسێك فڕێ بدەنە ناو ئاوەکە بۆ ئەوەی کەشتییەکە ڕزگاری بێت، کاتێك کە تیروپشك کرا سێ جار (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەرچوو و فڕێیان دایە ناو دەریاکەوە۝

پاشان کەشتییەکە جێ دەهێڵێت، دیارە لە تاریکی شەودایە لەناو دەریایەکی ترسناک لە پڕ حوتێک دەم دەکاتەوە بۆ قوت دان دەچێنە ناو دەمی حوتەکە یان سکی حوتەکە، ئەوە دوو ڕای لەسەرە، ڕای یەکەم ئەوەیە کە زۆرینەوەی ڕاڤەکاران بەم شێوەیە تەفسیریان کردووە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ۝﴾ الصافات

واتە: خوای گەورە نەهەنگێکی ناردو قوتی دا، چونکە (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) قەومەکەی بەجێهێشت و لۆمە کرا۝

کە چۆتە ناو سکی حوتەکە خوای گەورە وەستێنەری هەموو یاسا گەردوونیەکانە لە ناو سکی ئەم حوتە، یاخود نەهەنگەکە ماوەتەوە، لە زیکر و فیکری خوای پەروەدگار بووە، زۆر پەشیمان بووە لەوەی کە بێ پرسی خوای پەروەردگار نەینەوای جێ هێشتووە، (ئەمە ڕای زۆرینەیە).

نووسەر- لەگەڵ ڕای زۆرینە نییە و پێی وایە کە ئەو نەهەنگە قوتی نەداوە، بەڵکو لەناو دەمی نەهەنگەکەدا ماوەتەوە، بۆ ماوەی ڕۆژێک یان چەند ڕۆژێک، ئەگەر قوتی بدایە لەناو گەرمای سکی ئەو نەهەنگەدا دەتوایەوە، لێرەدا مەبەست ئەوە نییە کە خوای گەورە ناتوانێت موعجیزە بۆ (یونس) فەراهەم بهێنێت، بەڵکو لە ڕووی تەفسیرەوە ڕاسترە وا بڵێین کە نەهەنگ ناتوانێت ئەوەی خواردوویەتی لە دەمەوە بهێنێتە دەرەوە، بەڵکو هاتنە دەرەوەی (یونس) لە دەمی نەهەنگەکەوە بووە، خوای گەورە بە موعجیزە پاراستوویەتی، تاکو گەیاندوویەتی کەناری وشکانی، یاخود جۆرێک لە دۆلفینەکان لە دوای ماندووبوونی مانەوەی لە دەریادا لە ڕێگای دەمیانەوە (یونس)-یان گەیاندۆتە وشکانی، لاشەی لاواز بووە خوای گەورە فەرمانی کردووە بەو

حوتە، یاخود نەهەنگە یان دۆلفینەکان کە بیگەیەننە کەنارەکانی وڵاتی یۆنان، کە ئەو دەمە پێی وتراوە (گریک)

تا ڕادەیەک دڵنیام کە لەو ناوچەدا بووە، بۆ هاوکاری ئەوەی لە کەناری دەریاکانی وڵاتی یۆنان دا زۆرێک لە باخ و باخاتی، ئەو جۆرە دارەیە کە مێش و مەگەز ناچێت بەلایدا، ئەوانەش گوایە دەڵێن: داری کولەکەیە! لە ڕاستیدا کولەکە دار نییە، بەڵکو گیایە، بە هەردوو جۆرەکەی ئەو کولەکەیەی کە زەردە و گەورە دەبێت و هاوشێوەی شوتی و کاڵەکە، یاخود جۆرەکانی تر کولەکە کە لە وڵاتی خۆمان دەکرێت بە شلەو بە برنجەوە دەخورێت، ڕزگاربوونی بە هۆکاری یادی خوای پەروەردگار بوو، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴿١٤٤﴾ * فَنَبَذْنَـٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ﴿١٤٦﴾﴾ الصافات

واتە: خوای گەورە نەهەنگێکی ناردو قوتی دا، چونکە (یونس عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) قەومەکەی بەجێهێشت و لۆمە کرا﴿١٤٢﴾ ئەگەر (یونس) لەناو سکی نەهەنگەکە تەسبیحاتی خوای گەورەی نەکردایە، یان نوێژی نەکردایە، ئەووترێ: پێشترو لەناو سکی نەهەنگەکەیش نوێژو زیکری خوای گەورەی کردووە﴿١٤٣﴾ ئەوە لەناو سکی ئەو نەهەنگەدا ئەمایەوە تا ڕۆژی زیندووو بوونەوە، واتە: ناو سکی نەهەنگەکە ئەبووە گۆڕی﴿١٤٤﴾ خوای گەورە فەرمانی کرد بە نەهەنگەکە لە دەمییەوە فڕێی دایە دەشت و شوێنێکی چۆڵەوە، کە هیچ ڕووەکی لێنەبوو، لاوازو نەخۆش بوو، جلوبەرگی لەبەردا نەمابوو﴿١٤٥﴾ دارێکمان بۆی ڕوواند کە سێبەری بۆ بکات کە ئەووترێ: کولەکە بووە﴿١٤٦﴾

ئەوە ئەو ڕووداوە بوو بە گشتی بەسەر حەزرەتی (یونس) دا هات، هەموو باسەکە لە قورئان دا لە دەوری خاڵێکی گەوهەری دەسوڕێتەوە، ئەویش، ئارامگرتنە لە بانگەوازدا.

## کۆی گشتی باس

کۆی ئەم باسە لە قورئانی پیرۆزدا، خوای پەروەردگار لە بنەڕەتی ئارامگرتن باسی کردووە لە ژیانی ئەم پێغەمبەرە عەزیزەدا کە بانگەواز ئارامگرتنی دەوێت، بەڵام کۆچی ژیانی بۆ ئێمە باس نەکراوە لە قورئاندا ئەو ڕەهەندەی باس کراوە کە پەیوەستە بە بانگەوازەوە.

سەردەمی حەزرەتی (یونس عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) سەردەمی دروستبوونی ژیان بوو لە وڵاتی یۆنان-ی ئەمڕۆدا، جا حەزرەتی (یونس) چووەتە ئەو وڵاتەو بانگەوازی تێدا کردووە، ئەگەرچی بەردەوام بت پەرست بوون لەو خاکەدا، بەڵام پیاوچاکان و تەنانەت فەیلوسوفەکانیش زۆربەیان یەکتا پەرست بوون دژی فرە خوایی بوون، سوقرات لەوانەبوو کە خوای بە تاک و تەنها ناسیوە.

هەروەها ئەفلاطون، ئەرستۆتالیس و هەموو ئەوانە لە مێژوو و فەلسەفەکاندا باس کراوە، هەندێکیان لە پێناوی یەکتاپەرستی لە سێدارە دراون.

چی وای لە من کرد کە سەرەنجم ڕابکێشرێت بۆ (یونس) کە بانگەوازی گەیشتۆتە وڵاتی گریک، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مێژوونووسی کۆنی یۆنانی ( هێردۆدۆت) کە باسی گەشتی پیاوێکی پیرۆز دەکات لە شارەکانی ئەوکاتەی یۆنان کە بە ( سنتا یوناس) ناوبراوە یان (یوناسن)، دروست بوونی شارستانیەت لەو وڵاتەدا سەرەتا لە ڕێگای شارەوە بووە، کە هاوشێوەی یانە و نادییەکانی کە خەڵکی دەبنە ئەندام تێیدا، هاوشێوەی بوون بە ئەندام لە شارەکاندا، دەبوو بە ناوێک خۆت تۆمار بکەیت، جا لەهەر چین و توێژێکدا بویتایە لە بازرگان و بەندەو کۆیلە، خانەدانی ناوچەکە، فەیلەسوف و حەکیم و سەرباز... هتد.

شارەکان لە وڵاتی گریک دا هەریەکە خاوەنی حوکمی سەربەخۆبوون، بە واتای ئەوەی شارەکان وڵات بوون سنووریان جیا بوو، ئاڵاو ڕەمزو سەربازو ئابووری سەربەخۆیان هەبوو.

حەزرەتی (یونس) نەیتوانیوە وەکو ئەندام لەو ناوچانەدا بمێنێتەوە، بەڵکو گەڕاوەتەوە بۆ ناوچەی نەینەوا و بەو پەڕی پێشوازی گەرمەوە پێشوازی لێ کراوە، حەزرەتی (یونس عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ) لە ئەوروپادا زۆر خۆشەویستە و ڕێزی لێگیراوە زۆرێک لە منداڵەکانیان بە ناوی ئەو پێغەمبەرەوە ناوناوە تا ئەم ساتە وەختەش ناوەکەی بڵاوە لەناویاندا.

جۆری ئەو دوعایەی کە جەنابیان کردوویانە خوای گەورەش ڕزگاری کردووە، خوای موتەعال لە قورئاندا بۆی گێراوینەتەوە دەفەرموێت: ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ۝٨٧ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ۝٨٨﴾ الأنبياء

واتە: خوای گەورە (یونس) پێغەمبەر (عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ)-ی بۆ لای خەڵکی نەینەوا نارد لە زەوی موسڵ، ئەمیش بانگەوازی کردن بەڵام وەڵامیان نەدایەوە کاتێك کە لە قەومەکەی تووڕەبوو بەجێی هێشتن، هەڕەشەی لێ کردن پاش سێ ڕۆژی تر خوای گەورە سزاتان دەدات، ئەوانیش دواتر دڵنیا بوون ڕاست دەکات دەرچوون بۆ بیابان و ئیمانیان هێناو لە خوا پاڕانەوە خوایش سزای نەدان، (یونس عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ) گومانی وابوو کە سزای نادەین، یان لە ناو سکی نەهەنگەکە جێگای تەسك ناکەین دوای ئەوەی کە سواری کەشتییەك بوو، ترسان لەوەی نقوم بێت، سێ جار تیرو پشکیان کرد یەکێکیان زیاد بوو فڕێی بدەنە ناو دەریاوە هەر سێ جارەکە (یونس عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ) دەرچوو، بۆیە خۆی هەڵدایە ناو دەریاکەوەو نەهەنگێك قوتی دا ئەمیش لەناو تاریکی دەریاو تاریکی شەو و تاریکی سکی نەهەنگەکەدا لە خوای گەورە پاڕایەوە ئەی پەروەردگار هیچ پەرستراوێك بەحەق نییە شایەنی پەرستن بێ جگە لە زاتی پیرۆزی تۆ، تاك و تەنهاو بێ شەریکی

پاك و مونەززەهی بۆ تۆ بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم و ستەمم کرد کاتێك کە قەومەکەی خۆمم بەجێ هێشت لێم خۆشبە﴿٨٧﴾ ئێمەش وەڵاممان دایەوەو لێی خۆشبووین، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هیچ موسڵمانێك نییە ئەم دوعایە بکات بۆ هەر شتێك ئیلا خوای گەورە دوعاکەی قەبوڵ دەکات و وەڵامی دەداتەوە: (أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ) لەو تەنگی و غەم و خەفەتە ڕزگارمان کرد لە ناو سکی نەهەنگەکە بەم شێوازەش باوەڕداران ڕزگار ئەکەین ئەگەر بۆ لای ئێمە بگەڕێنەوەو ڕوو لە ئێمە بکەن﴿٨٨﴾

هەروەها پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد ئەم دوعایە تەنها بۆ (یونس)-ە، پێغەمبەر فەرمووی بۆ (یونس)- تایبەت بووەو هەموو ئیماندارێکیش دەتوانن بیڵێنەوە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتەکە دەخوێنێتەوە دەفەرموێت هەموو ئیماندارانیش (وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلْمُؤْمِنِينَ ) (یونس) خوای گەورە کار ئاسانی بۆ دەکات پێ دەبەخشێت.

وەفاتی ئەم پێغەمبەرە دیارو ئاشکرا نییە و  پاشان جێگاش باس نەکراوە لە مێژووەکاندا، بێجگە ئەوەی لە شاری موصل لەوێ گۆڕێک هەبوو بەناوی نەبی (یونس)، ئەویش لەم ساڵانەی دوایدا بە دەستی ڕێکخراوی( داعش) تەقێنرایەوە.

دوای سەردەمی (یونس) بە گشتی دەوڵەتی پارسیا ( ئێران) توانی دەسەڵاتی تەواوی هەبێت بەسەر ناوچەکاندا، لە هیندستانەوە تاکو وڵاتی خۆی بووە لەو سەردەمەدا بابل سەر بە دەوڵەتی پارسیا بووە،  پادشاکەی ناوی (سەنحاریب) بووە پادشای ئیسرائیل ناوی (حزقیا) یان (صدقیا) بووە، جا ئەم پادشایە لە چاو ئیمپراتۆریەتی پارسیا زۆر لاواز بوون، فەرمانی ڕاستەوخۆیان لە پادشای ئێران دەردەکرد بە ناوی ( کیخوسرو) یان ( کەی خوسرەو)، سەنحاریب کە پادشای بابلە بە فەرمانی کەیخوسرەو دەتوانێت دەوڵەتی ئاشور تێک بکێشێنێت و پایتەختی ئاشور کە نەینەوا بوو خستیە ژێر ڕکێفی و داوای کرد کە بەرەو وڵاتی فەڵەستین بڕوات واتا بەرەو شاری ئورشەلیم کە پادشا ( حزقیا)ی لێبوو ئەوکات زۆر نەخۆش بوو قاچی تووشی نەخۆشی گەری و گولی بوو بوو!

## ڕووداوی ژیانی حەزرەتی ئەشعیا (عَلَيْهِ السَّلَامُ)

لە دوای کوڕانی (سولەیمان) چەندین ساڵ لە گەلی ئیسرائیل پەرتەوازە بوون، تا چەند پادشایەک سەرکردایەتی دەکردن و لەگەڵ پادشاکاندا خوای گەورە پێغەمبەری بۆ دەناردن بۆ ڕێنمایی کردنیان لەو پادشایانە بەناوی (حزقیا) لە شاری ئورشەلیم دادەنیشت واتا ( بیت المقدس).[1]

هەروەها خوای پەروەردگار پێغەمبەرێکی نارد بۆ ئەو گەلە بە ناوی ( ئەشعیا کوڕی ئەمصیا)، پادشای گەلی ئیسرائیل زۆر گوێڕایەڵی ئەم پێغەمبەرە بەرێزە بوو، ماوەیەکی زۆر هەردوولایان بە یەکەوە لە بانگەوازی گەلی ئیسرائیل دا بوون بە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، خەڵکی زۆرێک گوێڕایەڵیان بوو، بەڵام زیاتر پەیوەست بوو بە ناوچەی قودس و ناوچەکانی تری، بە داخەوە پارچەکانی تری پادشای خۆی هەبوو، زۆرێکیان هەر خوایان نە دەپەرست، بەڵکو بتپەرست بوون، لە ماوەیەدا پادشای بابل سەرکەوتنی زۆری بەدەست هێنابوو سوپایەکی زۆری لە بەردەستدا بوو، داوای کرد لە ئیمپرا توریەتی فارسیا کە ئەو،دەمە ئایینی (ماجوس) کە ئاینێکی دەستکردی جادووبازەکان بوو، ئەوە لایان پیرۆز بوو خاک و ئاو و هەوا و ئاگر بوو بە شێوەیەکی

گشتی دیاردە سروشتییەکاندا پیرۆز بوو، بە هۆکاری سیحربازی و جادوویی زۆر ئەو ئایینە بڵاوەی کردبوو لە ئێران و هیندستان بە گشتی ئاسیا کە لەمدوایانەدا بە ئایینی ( میترا) ناسرا.

پادشای ئێران مرد بە ناوی کەیخوسرەو برازایەکی هاتە سەر حوکم بە ناوی ( لوهراسب-ی کوڕی کەیخوسرەو کوڕی کەیکاوس) لە تا وڵاتی میسر بخنە ژێر ڕکێفی خۆی بیکەنە موڵکی وڵاتی پارسیا.

کاتێک هەواڵ گەیشتە پادشای گەلی ئیسرائیل زۆر ترسا، چونکە لە کۆتایی تەمەنیدا بوو هەر دوو قاچی تووشی گولی و نەخۆشی پێست بوبوو، حزقیا پێغەمبەر ئەشعیای بانگ بزانێت لە لایەن خوای پەروەردگار هیچ وەحی بۆ هاتووە، حەزرەتی ئەشعیا فەرمووی هیچم بۆ نەهاتووە، سوپای سەنحاریب کەوتە ڕێ بەرەو شاری قودس، بە (٦٠٠) هەزار ئاڵاوە یان ( ٦٠٠) هەزار سەرباز، زۆربەی ناوچەکانی تا وەکو دیمەشق-یشی خستە ژێر ڕکێفی.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[1]- بۆ زۆرێک لەم ڕووداوانە پشتم بە بەڵگە مێژوویەکانی ئیبین کەثیر بەستووە، ئەوەش لە مێژووی ( ابن عساکر) وەرگرتووە، کە ناسراوە بە ( أخبار في تأريخ دمشق) هەروەها پشتم بە سەرچاوەی مەلیک و پادشاکانی فارس بەستووە لە ڕێگا مێژووی ( ئیبن الأثیر) ( الکامل في التأریخ).

خوای گەورە وەحی نارد بۆ حەزرەتی ئەشعیا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) کە پادشا حزقیا وادەی ژیانی کۆتایی هاتووە کەسێک بکاتە جێگانشینی خۆی.

کاتێک ئاگاداری کردەوە حزقیا زۆر ناڕەحەت بوو، لە مزگەوتی قودس دەستی کرد بە گریان و نوێژکردن، نەک لەوەی بترسێت بمرێت، دەیزانی کەس توانای ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ( سەنحاریب)ی نییە، داوای هێزو تەوەکول توانای لە خوای پەروەردگار کرد بە گریان و دڵی پڕ ئیخلاس کە خوای گەورە سەریان بخات، دوعایەکی کرد خوای گەورە بە هۆکاری دوعاکەی پانزە ساڵ حوکمی پادشایەتی بۆ درێژکردەوە و مژدەی سەرخستنی دا بەسەر سەنحاریب دا.[2]

لە دوای ئەو دوعایە هیچ ئازار و نەخۆشی نەماو چاک بوویەوە.

سوپای کۆکردەوە بۆ جەنگ لەگەڵ سەنحاریب و توانی بە سوپای کەمەوە سەنحاریب تێک و پێک بشکێنێت و حەوت کەسیان لێکرایە دیل لە سەرکردەکانی بە خودی سەنحاریب-یشەوە کە یەکێک لەوانە ناوی ( بەنو ختنەصر) بوو، کە (٧٠) ڕۆژ بە ناو هەموو ژێر دەسەڵاتیدا گەڕاندی و توانی سەرکەوێت بە سەریاندا، بۆ هەر حەوت کەسەکەی کە بە دیل گیران وەحی هات بۆ ئەشعیا کە دەبێت ئەو حەوت کەسە ئازاد بکرێن و بڕۆنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، تا هەواڵی سەرکەوتنەکەی گەلی ئیسرائیل بگەیەنن.

لە دوای حەوت ساڵ سەنحاریب مرد، پاشان بەنوختنەصر هاتە جێگای.

پادشای ئیسرائیل وەفاتی کرد (حزقیا) دوای پانزە ساڵ لە ماوەی خوای پەروەردگار پێ بەخشیبوو، لە دوای ئەو خەڵکی زۆر خراپەکار بوون، حەزرەتی ئەشعیا هەر پادشایەکی بۆ دەست نیشان دەکردن نەیان دەویست، پاشان خەریکی خراپەکاری سەرەڕۆیی و تاوان و بەدڕەوشتی بوون، تا کار گەیشتە ئەوەی هەرچی بانگەوازی دەکردن حەزرەتی ئەشعیا هیچ وەڵامیان نەداوە، بەڵکو جنێوو قسەی ناشرینیان بە حەزرەتی ئەشعیا دەوت، تا لە کۆتاییدا شەهیدیان کرد و بە دارێکەوە بەستیانەوە لەگەڵ دارەکەدا بە مشار بڕیانەوە، خوای پەروەردگار بە شەهیدکردنی ئەو پێغەمبەر لە گەلی ئیسرائیل توڕەبوو، ئەوەش ڕەفتاری گەلی ئیسرائیل بوو دەرحەقی بە پێغەمبەرەکەیان ( فإنا لله وإنا إليه راجعون)

---

[2]- دوعاکەی بریتی بوو لە:( اللهم رب الأرباب و أله الألهة يا رحمن يا رحيم، يا من لا تأخذه سنة ولانوم اذكرني بعملي و فعلي وحسن قضائي على بنى ئسرائيل و ذلك كله، كان منك فأنت به من نفسي، سري و إعلاني لك)، (ابن كثير، قصص الأنبياء، قدم له ونظر في أحاديثه، عبدالقادر الأرناوؤط).

## ڕووداوی ژیانی پێغەمبەر ئەرمیای کوڕی حەلقیا (عَلَيْهِ السَّلَامُ)

ئەم پێغەمبەرە لە دوای حەزرەتی ئەشعیا خوای پەروەردگار ناردی ئاگاداری کردەوە، ئەگەر ئەم گەل و هۆزەی ئیسرائیل، تەوبە نەکەن و نەگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار، ئەوا ئەوانەیان بە سەردا زاڵدەکات کە ئاگر دەپەرستن، هیچ ترسی خوایان لە دڵدا نییە، ڕەحم بە منداڵ و ژن و هەژار و لێ قەوماوان ناکەن، گفتوگۆیەکی زۆر درێژی هێناوە ( ئیبن کەثیر) لە ( ئیبن عساکر)ەوە کە نێوانی خوای پەروەردگار و حەزرەتی ئەرمیایە، هەندێکی وەکو مێژو دەگێڕینەوە لێرەدا، بەڵام هیچ سەرچاوەیەکی ڕاست و دروست لەبەر دەستدا نییە تا پشتی پێ ببەستین، بەڵام زانایان باسی کات و ڕووداونی ئەو سەردەمەیان لە قورئاندا لە سەرەتای سورەتی الإسراءدا جیاکردۆتەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ۝ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ۝ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ۝ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ۝ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ۝ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ۝ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ۚ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا ۘ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ۝﴾ الإسراء

واتە: ئێمە تەوراتمان بە (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بەخشیوە کە لە کاتی خۆی هیدایەت بووە بۆ بەنی ئیسرائیل ئەوانەی کە بەڕاستی شوێنی بکەوتنایە، جگە لە من پشت بە کەسی تر مەبەستن و کارەکانتان بە کەسی تر مەسپێرن۝ ئەی نەوەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ (نوح عَلَيْهِ السَّلَامُ) - دا لە کەشتیەکەدا هەڵمان گرتن و ڕزگارمان کردن ئێوەیش وەکو (نوح عَلَيْهِ السَّلَامُ) بن کە عەبدێك بووە و شوکرانەبژێری خوای گەورەی کردووە، وەسفی (نوح عَلَيْهِ السَّلَامُ) -یش ئەکات بە عبودیەت و بەندایەتی کردنی بۆ خوای گەورە و زۆر سوپاسگوزاری خوای گەورە بووە، چونکە لە پاش خواردن و خواردنەوەو پۆشاك لەبەرکردن و هەموو حاڵەتێکیدا حەمدو سوپاسی خوای گەورەی کردووە۝ لەو کتێبەدا کە تەورات-ە هەواڵمان بە بەنی ئیسرائیل داوەو پێمان ڕاگەیاندوون و بڕیارمان داوە کە ئێوە لەسەر زەویدا مەبەست پێی (بيت المقدس)ە لەو شوێنەدا دوو جار خراپە ئەکەن و ئاشووب ئەگێڕن بەسەر خەڵکدا زاڵ ئەبن بە زوڵم و ستەم و سنووربەزاندن۝ کاتێك کاتی یەکەم ئاشووب و خراپەکاریتان دێت لەو دووانەی کە باس کرا، بەندەگەلێکی خۆمان ئەنێرینە سەرتان کە خاوەن هێزو توانایەکی زۆرن و زاڵ ئەبن بەسەرتاندا، بەسەر وڵاتاندا

ئەگەڕێن و کوشتارتان ئەکەن و دێن و ئەڕۆن و لەکەس ناترسێن، کە وتراوە (جالوت) بووە، یان (سەنحاریب)ی پاشای موصڵ بووە، یان (بوختنەصر)ی پاشای بابل بووە، ئەویش بەڵێنێکەو ڕووئەدات و هیچ گومانێکی تیا نیە۞ دوای ئەوەی کە ئێوە تەوبە ئەکەن و بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕێنەوە زاڵتان دەکەین بەسەریاندا، دوای ئەوەی کە ماڵ و منداڵتان نامێنێ دیسانەوە پشتیوانیتان ئەکەین و ماڵ و منداڵتان پێ ئەبەخشین، ژمارەشتان زیاتر ئەکەین لە دوژمنەکەتان بۆ ئەوەی کە جەنگیان لەگەڵدا بکەن۞ ئەگەر چاکە بکەن ئەوە پاداشتی چاکەکە بۆ خۆتان ئەگەڕێتەوە، ئەگەر خراپەش بکەن ئەوا زەرەرو زیان و تاوانی خراپەکە هەر بۆ خۆتان ئەگەڕێتەوە، کاتێك کە دەست دەکەنەوە بە خراپە بەڵێنی دووەم جار دێت و دیسان دوژمن بەسەرتاندا زاڵ ئەبێتەوە، تا شێوازی تێکشکاندن بە ڕووتانەوە دیار بێت بۆ ئەوەی بێنەوە ناو مزگەوتی قودس و داگیری بکەن هەروەکو جاری یەکەم هاتن و داگیریان کرد، بۆ ئەوەی هەموو شتێك وێران بکەن و تێکی بدەن و زاڵ بن بەسەرتاندا۞ بەدڵنیایی ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورەو تەوبە بکەن ئەوا خوای گەورە ڕەحمتان پێ ئەکات و دوژمنتان لە کۆڵ دەکاتەوە، ئەگەر بۆ جاری سێیەمیش بگەڕێنەوە بۆ خراپەکاری ئەوا ئێمەش سزاتان ئەدەین و دوژمن بەسەرتاندا زاڵ ئەکەین دۆزەخیشمان داناوە بۆ کافران کە لە دۆزەخدا گەمارۆ بدرێن و بەند بکرێن۞

زۆرێک لە مێژوونووسان دەڵێن ئەو سەردەمە زیاد لە شەش پێغەمبەر بە یەکەوە هاتوون بۆ گەلی ئیسرائیل، چوار پێغەمبەریانی شەهید کردووە، دوو پێغەمبەریش زیندانی کراوە لەلایەن گەلی ئیسرائیل-ەوە کە بریتی بوون لە ( ئەرمیا، دانیال، حنانیا، عەزاریا، میشائیل، ئەشعیا)

سورەتی الإسراء سەرەتاکەی کە ئاماژەمان پێداوە کۆتایی دەسەڵاتی یەکەمی گەلی ئیسرائیل بوو لەسەر زەویدا، چونکە بە دوای هاتنی ( بەنوختنەصر) کە جێنشینی (سەنحاریب) بوو خۆی ئامادەکرد بۆ جەنگی گەلی ئیسرائیل، ئەو گەلە لە ناو دەبات (مەبەست لە دەسەڵاتەکەیەتی) چونکە دوای هاتنی بەنوختنەصر زۆرینە گەلی ئیسرائیل بە جیهاندا بڵاو دەبنەوە.

## گەڕانەوە بۆ ناو ڕووداوەکان

ئەرمیا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بەردەوامە لە بانگەواز کردن لەگەڵ پێغەمبەرانی تردا سەلامی خوایان لێ بێت، لە کۆتاییدا ئەرمیا زیندانی دەکەن و ماوەیەکی زۆر نابات بەنوختەنەصر شاری قودس دەگرێت و هەموو جێگا پیرۆز و مزگەوتی قودس دەسوتێنێت و خەڵکێکی زۆری لێ دەکوژێت، زۆرێکیش دەبات بە کۆیلەو کەنیزەک بۆ وڵاتی خۆی (بابل).

خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەفەرموێت: (فجاسوا خلال الديار) ئەمەش بە واتای ئەوەی دەرگای شارەکەی بۆ کراوە، ئەویش حوکمی جاهیلی خۆی کردووە هەموو ئەو شارەی وێران کرد و ژنەکانی لە بازار فرۆشتن و منداڵەکانی برد، پاشان بەنوختنەصر لە زینداندا ئەرمیا (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-ی هێنا دەرەوە و ڕزگاری کرد، یەکێک لە وتەکانی ئەو پادشایە ئەوەیە دەڵێت: گەلێک چۆن سەردەکەوێت کە ئازاری پێغەمبەرەکەی بدات، ئەو گەلە خراپترین گەلە کە سەرپێچی پێغەمبەرەکەی بکات و لە کۆتاییدا ئازادی دەکات، بەڵام دانیال پێغەمبەر لەگەڵ خۆیدا دەبات بەدیلی یان دەڵێن لەبەرئەوەی سەرسام بووە بە دانایی و حیکمەتی، ئەرمیا داوای لێ دەکات ئەوانەی کە گیراون ئازادی بکات و لەم شارە وێرانە بمێنێتەوە؟!

بەنوختنەصریش دەڵێت: من لەم شارەدا نامێنمەوە، چونکە خواکەی غەزەب و تووڕەیی باراندووە بەسەریدا، ئێوەش ئازادن لەمانەوەیان. بەنوختنەصر دەگەڕێتەوە شارە وێرانەکەی ئۆرشەلیم بۆ ئەرمیا (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-ی جێ دەهێڵێت، هەندێکیان بەرەو میسر دەڕۆن و هەندێک بەرەو ناوچەی فەودەک و خەیر بەو شێوەیە بڵاودەبنەوە بە چواردەوری فەڵەستین دا.

هەندێکیش لە چاکە خوازەکان دەمێننەوە لە شاری قودس لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا.

ئەرمیا لە وڵاتی شام دا وەفات دەکات، جێگای دیار نییە ئایا شاری ئۆرشەلیم-ی قودس-ە، یان دیمەشق بە ئەویش کۆتایی بە ژیانی دێت و وەفات دەکات، لە دوای خۆی یەکێک لە شاری قودس جێ دەهێڵێت، کە دەڵێن ئەو کەسە پێغەمبەر نەبووە و دوای دەبێتە پێغەمبەر، یان دەڵێن هەر پێغەمبەرێک بووە و خوای گەورە وەحی بۆ ناردووە بەناوی (عوزێر) کە بەناو شارەکاندا دەگەڕێت بە خۆی گوێدرێژەکەیەوە دەچێتە جێگایەکی وێران و لە شوێنێکی دوور لە شاردا، خوای پەروەردگار سەد ساڵ خەوی لێ دەخات و دوایی دەگەڕێتەوە سەر ڕووداوەکەی.

## ڕووداوی ژیانی پێغەمبەر دانیال (عَلَيْهِ السَّلَامُ)

حەزرەتی دانیال بە دیل گیراوە و بەنوختنەصر لەگەڵ خۆی بەرەو بابل دەیبات، لە ڕێگادا ئەو کۆیلە و کەنیزەک و دیلانەی لەگەڵ پادشادانە هەموو برسیانە، ئەو خەڵکە زۆریشن بەشیان ناکات، چونکە سوپاکەی بەنوختنەصر لە پێشترە تاکو خەڵکە گیراوەکە، بۆیە بە موعجیزەیەک حەزرەتی دانیال هەموو ئەو خەڵکە تێر دەکات، کە هەواڵ ئەدەنە بەنوختنەصر دەترسێت، ئەیبەنە لای دوو شێری برسی کە بۆ جەنگ بەکاری هێناوە، چونکە ناوێرێت خۆی بیکوژێت یان فەرمان بە جەنگاوەرەکانی بکات، لەوە دەترسێت سوپاکەی بشکێت، ماوەیەکی زۆر لە ناو قەفەسی شێرەکاندا دەبێت و شێرەکانیش نزیکی ناکەونەوە دوای ماوەیەک لە ناو قەفەسەکەدا دەردەچێت، بەمەش ناوبانگی حەزرەتی دانیال بەرزتر دەبێتەوە، دەڵێن گوایە ئازادی کرد، لە بابل دا ماوەتەوە خەریکی بانگەواز بووە، یان دەڵێن چۆتە ناوچەکان و گەڕاوە، لە کاتی وەفاتیدا

داوای کردووە کە بە دەستی ئوممەتی محمد ﷺ بنێژرێت، لە کاتی فەتحی (تستر/شوشتر) دا ئەبو (موسا)ی ئەشعەری تابوتی تەرمی دانیال ئەدۆزێتەوە، وەڵام دەنێرێت بۆ عومەر کە چی لێ بکەن، ئیمامی عومەر بە نامەیەک وەڵامی ئەداتەوە.

## موعجیزەی دانیال (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بە دەستی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ

لەم باسەدا ئەوەی لای نووسەر گرنگە ئەوەیە، چەند فەرموودەیەک لەسەر حەزرەتی دانیال هاتووە لە پێغەمبەرەوە کە هاوشێوەی موعجیزەکانی تری پێغەمبەری خوایە ﷺ.

لە باسی ئەحکامی گۆڕدا هاتووە ( أحكام القبور) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دانیال پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دوعای کردووە لە خوای پەروەردگار کە ئوممەتی محمد ﷺ بمشارنەوە واتە بە دەستی ئوممەتی محمد بخرێتە ناو گۆڕ.[3]

ئەبو (موسا)ی ئەشعەری دەفەرموێت: کاتێک فەتحی وڵاتی فارسمان کرد لە ناوچەی ( تستر/شوشتر) تابوتێکمان دۆزییەوە، کەسەکەی ناوی هیچی لێ بەسەر نەهاتبوو، فەرموودەکەی پێغەمبەرم بیرکەوتەوە کە فەرمووی هەرکەس دانیال پێغەمبەری دۆزییەوە مژدەی بەرێ بەهەشتییە.[4]

ئەو کەسەی کە دانیالی دۆزییەوە ناوی (حرقوص) بوو، ئەبوموسای ئەشعەری نامەی نووسی بۆ عومەری کوڕی خەتتاب باسەکەی بۆ گێڕاوە، عومەریش وەڵامی بۆ ناردەوە کە لە جێگایەکدا بنیژێن کەس پێی نەزانێت، مژدەش بدە (حرقوص) کە ئەهلی بەهەشتە، ئەبو (موسا) دەفەرموێت: یانزە گۆڕم هەڵکەند، حەزرەتی دانیال (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-م خستە ناو یەکێک لە گۆڕەکە، بێجگە لە خۆم کەس نەیزانی و کارەکەشم بەشەودا ئەنجامدا، فەرموودەی زۆری لە بارەوە هاتووە بە لاوازی ( مرفوع و مورسەل) بەڵام بە هۆکاری گێڕانەوەکان و ڕوودانی لە کاتی فتوحاتی ئیسلامیدا، لە نامەی عومەردا هاتووە: هەموو ئەمانە فەرموودەکەیان گەیاندووە پلە و ئاستی (حسن)، لە دوای ژیانی حەزرەتی دانیال لە ناوچەکانی ئێران پێغەمبەرێک پەیدا دەبێت بە ناوی زەردەشت، خاوەنی کتێبێکە بە ناوی ( زەند) یاخود ( بازەند) کە بە واتای ڕاڤە کردن دێت، پێش چوونە ناو باسی زەردەشت دەگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی شام و فەڵەستین کە یۆنانییەکان ناسراون بە (ڕۆم سەرەتایی) کە لە ڕاستیدا ڕۆم نین، یۆنانییەکان بەڵکو بە گریک ناسراون، لە ساڵانی داهاتوودا ڕۆم شارستانیەتی ئەوان دەبات بۆ خۆی دەکات و لە جێگا خۆیدا ئاماژەی پێدەدەین.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[3]- قال النبي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إنَّ دانيالَ دعا ربَّه عزَّ وجلَّ أن يَدفِنَه أمَّةُ محمدٍ/أبوبكر بن أبي الدنيا في كتاب أحكامِ القبور

[4]- فلما افتتح أبو موسى الأشعريُّ تُستَرَ وجدَه في تابوتٍ تضرب عروقُه ووريدُه وقد كان رسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال من دلَّ على دانيالِ فبشِّروه بالجنة/هەمان سەرچاوەی پێشووتر.

## پێغەمبەر عوزێر (عَلَيْهِ السَّلَامُ) و ئاوەدانی شاری قودس

لە دوای وێران کردنی شاری ئۆرشەلیم (بیت المقدس) هەواڵەکە بە جیهاندا بڵاو بوویەوە، ئەو دەمەش یۆنانییەکان توانیان زۆربەی کەنارەکانی دەرای ناوەڕاست کۆنترۆڵ بکەن کە ناسراوە بە (میدیتەران).

ئەو دەوڵەتە سەرەتای دەستپێکی بوو لە زانست و بوارەکانی سەربازی و ئەندازیاری و فەلسەفە کە زۆربەی لە وڵاتی هیندەوە، پاشان لە زانایانی گەلی ئیسرائیل وەرگرتبوو، بۆ ئەم مەبەستە دەشێت ئارمیا داوای هاوکاری لە یۆنانەکان کردبێت بۆ ئاوەدانی خاکی قودس، هەرچەندە لە مێژوودا هاتووە کە ئەرمیا خودی پێغەمبەر عوزێرە، بەڵام پێناچێت وابێت، ئەوکاتەی کە ئەو ڕووداوانە ڕوویەدات لە خاکی قودس و فەڵەستین و شام بە گشتی ئەرمیا تەمەنی زۆرە و کەسێکی بە ساڵا چووە، بە هەرحاڵ ووتەی تر هەیە کە گوایە (بشتاسب)یان (لوهراسب) کە کوڕو باوک بوون لە پادشاکانی ئێران قودسیان ئاوەدان کردۆتەوە. ئەمەش ڕێگای تێناچیت، چونکە خۆیان وێرانیان کردووە و تیاشیا نەماونەتەوە، تاکو ئاوەدانی بکەنەوە.

کەواتە ڕاسترە بڵێین خەڵکی ناوچەکە ئەوەی کە مابوونەوە بە هاوکاری دەوڵەتی ئەوکاتەی گریک کە سەرەتای گەورەبوونی بوو، ئەوان ئاوەدانیان کردەوە، هاوکاری خەڵکەکەی بوون کە زۆرینە خەڵکی ناوچەکەی بوون، دوور بوون لە گەلی ئیسرائیل زۆر کەم لە گەلی ئیسرائیل تێدا مابوونەوە، بەڵام بە گشتی ڕێزی پێغەمبەرانی گەلی ئیسرائیلیان دەگرت، دەیانزانی خاکی پێغەمبەرانە شاری قودس و پیرۆزی خۆی هەیە.

لە دوای مردنی ئەرمیا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) خوای گەورە حەزرەتی عوزێری کردە پێغەمبەر کە ناوی یەک جار لە قورئاندا هاتووە و بە یەکێک لە پێغەمبەرانی گەلی ئیسرائیل، ناوی ( عوزێری کوڕی جروق-ی کوڕی سدوق-ی کوڕی عەدیای-ی کوڕی ئەیوب-ی کوڕی درزنا-ی کوڕی عەر-ی کوڕی تەق-ی کوڕی ئەسبوع-ی کوڕی فینحاس-ی کوڕی عازر-ی کوڕی هاروون-ی کوڕی عمران-ە)

گومانی تێدانییە ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەرانی ڕابردووی خۆی بووە، هەڵبەتە پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەر، فەرموودەی لاوازمان لەسەری هەیە کە گوایە هەموو تەوراتی لەبەر بووە، لە سەردەمی بەنو ختنەصردا لەوانە بووە کە حەزرەتی ئەرمیایان ئازاد کردووە، پاشان لە تەمەنی چڵ ساڵیدا بۆتە پێغەمبەر.

ڕۆژێک لە ناو کەلاوەو کاولبووی خاکی قودس دا دەگەڕێت و بە گوێدرێژەکەی کە ترێ و هەنجیری فرۆشتووە، بارەکەی ترێ بووە، لای کۆپانی گوێدرێژەکەی لایەکی تری هەنجیر بووە بە قوڵینە بەسەر کۆپانی گوێدرێژەکەیەوە شۆڕی کرد بوەوە لە یەکێک لە کەلاوەکاندا لە دووری شار ماندوو دەبێت و نانێکی ڕەقی وشکی پێیە، هەندێک لە ئاوی ترێکەی دەکاتە شەربەت تا

نانەکەی تێبگوشێت و بیخوات. ماندووە قاپی دەنێت بە دیوار و سەقفێکی داڕوخاو و دەڵێت: خوای گەورە چۆن ئەم مردووو خۆڵانە زیندووو دەکاتەوە، هەڵبەتە ئەوە باسی مردن و ژیان ناکات، نووسەر وا لێی تێگەیشتووە کە مەبەست ئاوەدانی شارێکی مردووە زیندووو بکرێتەوە و سەر لە نوێ بونیاد بنرێتەوە، چونکە خۆی پێغەمبەرە. ئەگەر هەرداواش بکات داوای چۆنیەتی دەکات، بەڵام لێرەدا ئەو بەلای شار و بە ناو شاردا دەڕوات، لەسەریەتی کە ئەو شارە ئاوەدان بکاتەوە بۆیە بە سەرسوڕمانەوە دەڵێت کێ ئەم شارە مردوووە، زیندووو دەکاتەوە، قورسی کارەکە بۆ خۆیەتی، خوای گەورەش نیشانی ئەدات کە تۆش نەبیت خوای گەورە بە توانا و بەهێزە کە بتوانێت ئاوەدانی بکاتەوە، سەد ساڵ خەوی لێ دەخات و پاشان خەبەری دەکاتەوە، کە بەناو شاردا دەگەڕێت لە وێرانەوە بۆتە ئاوەدانی، گومان لەوەدا نییە کە زانایانی ڕاڤەکاری بەڕێز، هەر لە سەر سیاقی ئایەتەکان فەرموویانە کە مەبەست مردوووەکان بووە چۆن زیندووو دەبێتەوە، ئەگەر ئەم مانایەش بێت، دەشێت و وتەی زانایان سەرسەرمانە، نووسەر وای نابینێت، هەرچەندە بەڵگە لەسەر زیندووو کردنەوەی گوێدرێژەکە قسەو وتەی زانایان بەهێزتر دەکات لەسەر بۆچوونی (نووسەر)، بەڵام وای دەبینم لە زیاتر بونیاد نانە، زیندووو کردنەوەکە مەبەست نییە لە باسەکەدا، بەڵکو ئاوەدانی ناوچەکەو گەڕانەوەی خەڵکی و دروستبوونەوەی بە شار سیاقی باسەکە بەهێزتر دەکات، نەک پێغەمبەرێک یاخود پیاو چاکێک بە هەرحاڵ دێمەوە ناو باسەکەو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ ۖ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾﴾ البقرة

واتە: یاخود ئەو کەسەی کە بەلای دێیەکدا تێپەڕی کە (عوزێر) پێغەمبەر بووە، یەکێ بووە لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل لە لای (بیت المقدس) تێپەڕی، لە دوای ئەوەی کە پاشا (ئەبوخوتنەصر) وێرانی کردبوو سەقفی خانووەکان هەمووی ڕووخا بوو بەسەر دیوارەکانیدا و کەسی تیا نەمابوو، فەرمووی :چۆن ئەمە لە دوای وێران کردن و کاول کردن خوای گەورە زیندوووی ئەکاتەوە، یاخود ئەو کەسانەی کە لەناویدا مردووون چۆن خوای گەورە زیندووویان ئەکاتەوە، خوای گەورە سەد ساڵ لەوێدا مراندی پاشان زیندوووی کردەوە پێی فەرموو: ئایا تۆ چەندێك لێرە مایتەوە چەندێك مردبوویت؟ وتی: ڕۆژێك یان بەشێك لە ڕۆژوو کەمتر لە ڕۆژێك مامەوە، خوای گەورە فەرمووی: بەڵکو تۆ سەد ساڵە لێرە ماویتەوەو مردوووویت تەماشای خواردن و خواردنەوەکەت بکە کە لەگەڵ ئەو ماوە زۆرەدا هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە، بە تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە تەماشای گوێدرێژەکەت بکە چۆن پارچە پارچە بووە و

ئێسکەکانی ڕزیوەو خوای گەورە زیندوووی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی تۆ بکەینە نیشانەیەك بۆ خەڵکی لەسەر زیندووبوونەوە، یان تەماشای ئێسکەکانی بکە چۆن هەندێکی بەرز ئەکەینەوە بۆ سەر هەندێکی پاشان بە گۆشت دای ئەپۆشین کاتێك کە ئەمەی بۆ دەرکەوت و بە چاوی خۆی ئەم شتەی بینی فەرمووی: ئەزانم و بەڕاستی دڵنیام کە خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە﴿٢٥٩﴾

هەر لە ئایەتەکەدا هەست بە سۆزو شعوری کەسەکە دەکەیت کە چۆن تووشی شۆک بووە لەو دارمان و وێرانکاریە.

خوای گەورە کە دەیمرێنێت پاشان پرسیاری لێ دەکات؛ چەندێکە مردوویت؟ چونکە باسەکە باسی مردنە، خەوی لێ نەخستووە بەڵکو مراندوویەتی ئەگەر باسی ( متوافی) بوایە دەمانوت هەردووماناکە هەڵدەگرێت، بەڵام مردووە زیندووو کراوەتەوە، ئەو کاتەکە نازانێت، گرنگی لەوەدایە کە ئیحساسی یان هەست پێکردنی سنووردارە، سەد مردووە زیندووو بۆتەوە دەڵێت ڕۆژێک یان چەند ڕۆژێک ئەوە هەموو درکییەتی، بەڵام سەد ساڵەکە بۆ زەمەن و سەردەمەکەیە، خوای گەورە دەیەوێت ئەوە فێری مرۆڤایەتی بکات کات بوونی نییە لای خوای گەورە، ئەوکاتەی کە ئێستا حسابی بۆ دەکەین، هەر مەخلوقی خوایە. ئەوە کات نییە دەڕوات، بەڵکو ئێمەین دەڕۆین و یەک ئاڕاستەمان هەیە لە لە دایک بوونەوە بۆ ژیان پاشان مردن، گەڕانەوەی تر نییە، بەڵام لێرەدا باسەکە ئاڕاستەیەکی ترە خوای گەورە بە عوزێر لە ڕێگای فریشتەیەکەوە دەفەرموێت: تەماشای خواردنەکەت کە وەکو خۆیەتی لێرەدا خوای گەورە (قابض) کات بۆ خواردنەکە وەکو خۆی ماوە، ئەوە هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە، بەشی دووەم خۆیەتی مردووە، بەڵام لاشەی تێک نەچووە ( باسط)ی لاشەی بووە، قابضی ڕۆحی بووە، کەواتە؛ ئەوا هەردوو سیفاتی خوای موتەعال لەسەر گوێدرێژەکە پەیدا بووە، گیانی زیندووویەتی پێدەبەخشێت و خالق، بارئ و فاطرە لە دروستکردنەوەی لاشەی گوێدرێژەکە نیشانی عوزێر ئەدات.

لێرەدا ئەگەر عوزێر کاری ئاوەدانی پێ ناکرێت، ئەوا خوای پەروەردگار هەڵیگرتووە بۆ کارێکی تر، کەواتە لێرەدا تەنها باسەکە لە کارەساتەکەیە نەک زیندووکردنەوەی مردووان!

عوزێر لە دوای سەد ساڵ چووە ماڵەکەی خۆی، گۆڕانکاری تەواو بەسەر شارو کۆڵان و گەڕەکەکەدا هاتبوو لە دەرگای ماڵەکەی خۆیدا، ئافرەتێکی پیری زۆر بە ساڵاچوو کە تەمەنی لە سەر و سەد ساڵەوە بوو، عوزێر وتی داپیرە ئەمە ماڵی عوزێرە؟!

داپیرەکەش دەستی کرد بە گریان وتی چەندین ساڵە کەس هەواڵی عوزێری نەپرسیوە ئەو پێغەمبەری خوا بوو، من کچی بچووکی ئەوم!

عوزێریش دەڵێت کچی خۆم من باوکتم، خوای پەروەردگار سەد ساڵ مراندومی زیندووی کردوومەتەوە، کچەی دەڵێت باوکی من دوعای بۆ هەر نەخۆشێک بکردبایە چاک دەبوو، من چاوم کوێرە دوعام بۆ بکە چاوم چاکبێتەوە بزانم تۆ عوزێری؟!

ئەویش کارەکە ئەنجام ئەدات و دوعای بۆ دەکات خوای گەورە چاوی کچەکەی چاک دەکاتەوە، ئیتر دەیناسێتەوە کە باوکیتی شاهیدی ئەوەم کە تۆ عوزێری.

ئنجا لە دوای چاک بوونەوەی چاوی کچەکەی و گەڕانەوەی وزەو ژیان بۆ گیانی کچەکە چووە ناو خەڵک و گەلی ئیسرائیل بە یەکێک لە کوڕەکانی زۆر پیربوو لە شێخە گەورەکانی ئەو هۆزە بوو، کچەکەی باسەکە دەگێڕێتەوە چاوی و وزەو چالاکی خۆی وەک موعجیزە نیشانیان ئەدات و خەڵکی دەوری عوزێری تەمەن چڵ ساڵ کە پێشتر سەد ساڵ بووە مردووە وا زیندووو بۆتەوە کۆبوونەوە.

کوڕەکەی کە تەمەنی زۆر بە ساڵادا چووە وتی باوکم لە ناو شانیدا نیشانەیەکی ڕەشی پێوەیە، بزانن وایە، هەموو نیشانەکانیان ڕاست دەرچوو لەگەڵیداو داوایان لێ کرد کە تەورات لە ناو چووە بەڵکو بۆیان بنووسێتەوە، بەنوختنەصر هەمووی لەناو بردووە.

ئیبن عەباس دەفەرموێت: موعجیزەکەی لەوەدا بوو کە دوای نووسینەوەی تەورات بووە موعجیزە!! ئینجا فەرمووی: ﴿ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ ﴾

ئەویش لەلایەن باوکی پێغەمبەرانی ڕابردووەوە تەوراتیان لە جێگایەکدا شاردبووەوە چوو دەریهێناو سەر لەنوێ منداڵ و پیرو جوانی گەلی ئیسرائیل خەریکی نووسینەوەی بوون، خوای گەورە لە ئاسمانەوە نووری دابەزاند سەرلەنوێ کردنەوەی تەوراتەکە یان، جا لە دوای مردنی عوزێر بەم هۆکارە گەلی ئیسرائیل وتیان (عوزێر کوڕی خوایە) پەنا بە خوا لەو درۆ گەورەو کوفرە چییە.

پاشان عوزێر ماوەیەکی کەم ژیاو لە ناوچەیەک وەفاتی کرد بە ناوی ( سایراباذ)، لە دوای عوزێر ماوەیەکی زۆر پێغەمبەر لە گەلی ئیسرائیل دابڕاو پیاوانی ئایینی بە ئارەزووی خۆیان دەستکاری ئەحکام و وشەکانی تەوراتیان دەکرد، خوای پەروەردگار ماوەیەکی زۆر بێ پێغەمبەر هێشتنیەوە.

## ڕووداوی پێغەمبەر زەردەشت

لە زۆرێک لە مێژووەکاندا هاتووە کە پێغەمبەر نەبووە، بەڵکو کەسێکی حەکیم و فەیلەسوفێکی ناوچەی دەوڵەتی پارسیا بووە، لە ئازەربایجان لە شاری (بەڵخ) لە دایک بووە.

مێژووی تریش وەک ئیبن کەثیر و ئیبن ئەثیر بە کەسێکی قوتابی پێغەمبەر ئەرمیا باسیان کردووە! پاشان چۆتە ناوچەکانی تورک و چین بانگەوازی پێغەمبەرایەتی کردووە، کتێبەکەی باسی هەواڵی ڕابردووی تێدا بووە لە باسی ژیانی پێغەمبەران.

لێرەدا باسی دەکەین وەکو ئەوەی کە پێغەمبەرێک بووە بۆ گەلی (ئاری) چۆن گەلی ئیسرائیل خاوەنی پێغەمبەرانی تایبەت بە خۆیان و جیهان بوون هەروەها گەلانی ئاری هاوشێوەی گەلانی ئیسرائیل پێغەمبەریان بۆ هاتووە، هەروەها پەرتوکی ئاسمانیش زۆرە کە لە مێژووەکاندا ناویان هاتووە، قورئانیش ئاماژەی پێ کردووە (زبور الأولین)، ﴿وَإِنَّهُۥ لَفِي زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ۝١٩٦﴾ الشعراء

واتە: ئەم قورئانە لە کتێبەکانی سەرەتایشەوە وەکو تەورات و ئینجیل باسکراوەو موژدەی پێدراوە، یاخود لە زەبووری (داوود) پێغەمبەرعَلَيْهِ السَّلَامُ باسکراوە۝١٩٦

لەو ناوانەی کە زۆر ناسراون لە ئاسیادا بریتیە لە (ئاڤێستا) بەواتای بێخ و بنەڕەت دێت، کە لە زمانی عەرەبی واتا شەریعەت، هەروەها کتێبی ( ساما نفیداء) کە کتێبێکی ئاسمانیە و هەروەها ( براهیما) و زۆری تر لەو ناوانە، لە بنەڕەتی ئەم پێغەمبەرانەی گەلی ئاری پێغەمبەرانی گەلانی تریش هاتوون وەکو ( کۆنفوشیوس، بودا و لاوتیستۆ، ئەگەر لێکۆڵینەوەی ورد لە بارەیانەوە بکەین هەمووی ئایینی یەکتاپەرستی بوون، بەڵام بە دڵنیاوە شێوێنراون هەورەها بەشێکی زۆریش لە ئایینەکانی هیندستانن، هەر سەرچاوەیەکی ئایینی پاکی خوای بووە و دەستکاری کراوە.

## زەردەشت کێیە و ئایینەکەی چییە؟

## هاتنی زەردەشت، زەردەشت کێیە؟

زەردەشت لە ڕاستیدا بە چەند ناوێك لێکدراوەتەوە بە وشتری زەرد یان ئەستێرەی زێڕین یان پیر وەیان دەسەڵاتی زێڕین، خاوەنی وشتر یاخود گەشاوە باسیان لێوە کردووە.

مێژوونووسان وا دەگێڕنەوە کە زەردەشت کوڕی پیاوێکی جوتیار بووە لە ڕەگەز و ڕەچەڵکدا ئاری بووە، ناوی لە بنەڕەتدا (زرواستر)ە یان (زراتشتر)ە، واتا خاوەنی ووشتری زەرد یان ووشتری کۆن یاخود پیر دێت.

لە ڕاستیدا مێژووی لە دایك بوونی زەردەشت زۆر ڕوون نییە، بەڵام مێژوونووسان دەیگەڕێننەوە بۆ (٦٦٠)پ.ز لە ئازربایجان لە دایك بووە بنەماڵەکەی (ئەسپیاما)یە کە لە ڕەچەڵەکدا هەموو ئارین، باوکی زەردەشت ناوی (پورشاسپا)ی ئازەربایجانییە، دایکی زەردەشت ناوی (دغدو یان دگدو) بووە خەڵکی (ڕەمی) ئازەربایجانە، خێزانی سێیەمی زەردەشت ناوی (هۆیوی ) بووە کە کچی پاشایی ناوداری فارسەکان (فریشا ئوشتر)ی برای (جاماسب) بووە.

زەردەشت لە تەمەنی پازدەساڵی دا دەستی بە خوێندن کردووە لای مامۆستایەك کە ناوی (کوشتی )بووە، سەیر لەوەدایە کە ئەم ناوە بە کارهاتووە بۆ مەراسیمی پشتوێن بەستن لە ئایینی زەردەشتی دا، تا تەمەنی بیست ساڵی بەردەوام بووە لە خوێندن، لە دواییدا زەردەشت دایك و باوك و خێزانەکەی بە جێ هێشتوە و گەڕاوە بە جیهاندا یان دەڵێن کەسێکی گۆشە گیر بووە لە چیاکان و ئەشکەوتەکاندا ژیانی بردۆتە سەر.

لە تەمەنی سی ساڵیدا بە پەیامبەر خۆی ناساندوە بانگهێشتی بۆ پەیامبەرێتی و ئایینە کەی کردووە.

مێژوونووسان دەڵێن: لە کەناری دەریای (دیتا) لە نزیك نیشتیمانەکەی خۆی لە ئازربایجان لەلایەن فریشتە یەکەوە کراوە بە پەیامبەر و ئەو فریشتە ناوی (هومنە یان بەهمەن)ە واتا لە زمانی پارسی کۆندا بە مانای بیری چاکە هاتووە.

لەدوای هەشت ساڵ پەیامبەرایەتی لەگەڵ شەش فریشتە ناسراوەکەی (ئەمشاسپندان) وتوێژی کردووە.

لە دوای ١٠ساڵی تری پەیامبەرایەتی مێژوونووسان دەڵێن: خەڵکی زۆر ئازاریان داوە تەنها یەك کەس باوەڕی پێ دێنێت ئەویش نزیکی خۆی بووە یان دەڵێن ئامۆزای خۆی بووە کە ناوی (مینیدی نیمون ها) بووە.

دواتر سەری خۆی هەڵدەگرێ و ڕوودەکاتە ئەوروپای ئێستا، لە ناو یۆنان و ڕۆمەکان دا دەست بە بڵاو کردنەوەی ئایینەکەی خۆی دەکات.

زەردەشت لە ناو یۆنانیەکاندا بە (زۆرۆئاسترس) ناسراوە، لە ناو ڕۆمەکانیشدا بە هەمان شێوە پێیان وتوە (زۆرۆ ئاستر).

کارناسی فەڕەنسی ئاوێستای (جێمس دار مێستەر) دەڵێت: لە دوای بەجێ هێشتنی زەردەشت لە ناوچەکەدا، توانی ڕۆمەکان و یۆنانییەکان ڕێکبخات و کۆکیان بکات لە سەر خوایەك کە لە زەردەشت دایان تاشی ناویان نا (هوم) کە لە شێوەی مرۆڤ دا بوو.

(کرن) مێژوونووسی فرەنسی دەڵێت: زەردەشت پەیامبەر نەبوو بەڵکو ڕۆشنبیرێکی ڕووناک پەرست بوو؛ لە گەڕانەوەیدا بۆ خۆرهەڵات ناونرا بە خوای خۆر.

ئەفلاتون لە ٤٢٩- ٣٤٧ی پ.ز بە ڕاشکاوانە باسی زەردەشتی کردووە ئەو بە فەیلەسوفێکی پارس و هیندەکانی دەزانێت و بە دامەزرێنەری ئایینی (مەزد یەسنا)ی زانیوە کە تا ئێستاش لە هندستان و ئێراندا ئەو ئایینە ماوە.

مێژوونووسی سەدەی سێیەمی زایین (برۆسوس) زەردەشت بە پاشایەکی خوازراوی پارس و ماددەکان دەزانێت.

مێژوونووسە بەناوبانگەکانی جیهان هەموو لە سەر ئەوە کۆکن کە زەردەشت خەڵکی ئازەربایجانە و مێژوونووسەکانیش بریتین لە(براتلمە، مولون، سیستان، گلدزهیر، جاکسون و پیریتیا)، بەڵام ڕایەکی کە هەیە کە دەڵێن زەردەشت خەڵکی شاری (ڕەی) واتا تارانی ئێستا بە زمانی ئاوێستایی باسی کردووە بە شاری تارانیان وتوە (وغ) و بە زمانی پەهلەوی پێی دەڵێن (ڕکا) کە گوایە زەردەشت لەوێ لە دایك بووە.

ئەو مێژوونووسانەش بریتین لە ( ئەفلاتون، دیۆجین لەگەڵ هرموودرس) کە قوتابی ئەفلاتون بووە، هەر ئەوانیش وشەی زەردەشتیان لێك داوەتەوە بە مانای ئەستێرەی زێڕین یان نیاز پاك یان بە زەوی کێڵەرێکی باش لێکیان داوەتەوە .

لە ناو مێژوونووساندا تەنها مێژوونووسی ئەڵمانی کە ناوی (دۆمارێنی)یە دەڵێت زەردەشت خەڵکی (بەڵخ)ی ڕۆژهەڵاتی ئێرانە یان (ئورومیە) و زەردەشتیشی بە مانای سوتان و گەشاوە ناوزەند کردووە.

بە هەر جۆریك بێت دەگەڕێینەوە سەر باسەکە، تەنها ویستم سەرنجی خوێنەر ڕابکێشم بۆ باس کردنی جێگە و ڕێگای زەردەشت.

بەمیش دەرکەوت کە زەردەشت کورد نییە، بەڵکو زۆرێك پێیان وایە کە ڕەگەزی زەردەشت ئاری یە و لە بێخدا ئازەریە!

لە پاش گەڕانەوەی بۆ ناو مەڵبەند و زێدی باو و باپیرانی وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کردبوو لە هەرێمی خۆرهەڵاتی ئێران گەیشتە بارەگای پاشای ئەو هەرێمە کە پاشای پارسەکان بوو ناوی ( ویشتاسب) بوو.

زەردەشت بەهۆی زیرەکی و لێوەشاوەی خۆی توانی لە دەسەڵاتی ئەو پاشایەدا جێگای خۆی بکاتەوە تا دوو ساڵ بە نهێنی کاری کرد، تا ئەو پاشایە بهێنێتە سەر بیروبۆچون و ئایینەکەی

خۆی، بەڵام دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایان و پیاوانی ئایینی ئەو دەڤەرە زۆر دژایەتی زەردەشتیان دەكرد.

لە دوای ئەوەی كە زەردەشت كچەكەی خۆی دا بە ( ویشتاسب)، كە بە تەمەن ٤٨ساڵ لە كچەكەی زەردەشت گەورەتر بوو، كچەكەی ناوی ( یوروچیست) بوو.

لە پاشاندا تەواوی هێزو دەسەڵاتی خۆی خستە ژێر دەستی زەردەشتەوە تا ئایینەكەی بڵاو بكاتەوەو خۆشی بڕوای پێ هێناو ئایینی زەردەشتی بووە ئایینی فەڕمی ئێران و بۆ بڵاو كردنەوەی ئەم ئایینە كەوتنە جەنگ و كۆشش كردن لە ماوەی ٢٠ ساڵدا خەریكی بانگەواز و داگیر كردنی وڵاتانی چواردەوریان بوون، كە زەردەشت تەمەنی گەیشتە ٧٧ ساڵ لە جەنگێكدا بەرانبەر بە تورانییەكان و ماددەكان كە لە ڕاستیدا سەركەوتن بەسەریاندا پارسەكان توانیان ماددەكان و تورانییەكان تێك و پێك بشكێنن و زەردەشتیش لە تەمەنی ٧٧ساڵیدا كە یەكێك بوو لە سەركردەی ئەو لەشكرانە بە دەستی تورانیەكان كوژرا.



## کتێبی ئاوێستا

وشەی ئاوێستا لە بنەڕەتدا واتاکەی بە بێخ دێت یان ئەسڵ وە یان پەنا یاخود دۆستایەتی هاتووە.

کتێبی ئاوێستا پەرتوکی ئایینی زەردەشتە کە هیچ گومانێکی تێدا نییە کە ئەم پەرتوکە هیچ سەرچاوەیەکی نەماوە، بەڵگەشمان بۆ ئەمە مێژوونووسان دەڵێن: لە سەردەمی خۆیدا لە تەختی جەمشید دا لەو ئاتەشگایە هەڵگیراوە لە سەر پێستی گیانلەبەران نووسرا بووەوە کە کاتێک ئەسکەندەر لە ۳۳۱ی پ.ز دا کە هەخامەنشینەکان، بابلیەکان و پارسیەکانی گرت ئەو ئاتەشگایەی سووتاند و ئاوێستاکەی لە ناو برد.

ئەو ئاوێستایانەی تریش کە لە ئاتەشگاکانی تردا مابوونەوە وەك ئاتەشگاکانی هندستان، ئازەربایجان، یۆنانیەکان بۆ خۆیان دزییان، مێژوونووسەکان دەڵێن: زۆربەی زۆری فەلەك ناسەکانی یۆنانی لە کتێبی ئاوێستاوە فێری فەلەك ناسی بوون.

### دەڵێن ئاوێستا سەرچاوەیەکی باش بووە بۆ گەردووناسی

لە سەردەمی (ئەردەشیر) پاشای ئەشکانیەکان کە لە دوای نەمانی دەسەڵاتی ئەسکەندەرەوە ویستی سەر لە نوێ ئاوێستا کۆ بکاتەوە، فەرمانی دا بە ڕۆحانی و موغەکان کە دەست بکەن بە کۆکردنەوەی ئاوێستا، ئەمەش موغەکان و ڕۆحانییەکانی هاندا کە خۆیان بکەن بە زەردەشت و ئەوان سەر لە نوێ دارِشتنەوەی ئاوێستا بکەنەوە!

مێژوونووسی کورد مەردۆخی دەڵێت: ئەوەش بوە هۆی ئەوەی کە چەند زەردەشتێك دروست ببێت تا بە ئارەزووی خۆیان چەند ئاوێستایەك بنووسنەوە!

لە دەوڵەتی ساسانییەکاندا زۆر برەویان دا بە ئایینی زەردەشتیەت، کەسێکی ڕۆشنبیر کە بە ڕەچەڵەك کورد بوو بۆ وەرگرتنی دەسەڵات لە ساسانیەکان و دەسەڵاتی کوردی بێنێتەوە کایە وتی من زەردەشتم؛ ئاوێستایەکی نووسراوەی جوانی بەدەستی خۆی خستە بەردەست ساسانیەکان، خۆشی کردە گەورەی موغەکان و ڕۆحانییەکان، زەردەشتیەتی کردە یاسا و ئایینی کیشوەری ساسانی.

ئەمە سەری نەگرت پاشان لە سەردەمی (شاپور)دا گەڕانێکی زۆریان کرد لە یۆنان و هیندستان و ئاتەشگاکانی تری زەردەشتی دا تا بەم شێوەیە کۆیان کردەوە کە لە ڕاستیدا ئاوێستا نەبوو، بەڵکو تەنها قسەو باس بوو لە سەر زەردەشت هەر قسەیەکی گێڕاوە بوو هیچی تر.

ئاوێستایان دروست کرد لە ۳۱ (نسك) یان بەش تا سەردەمی ئایینی ئیسلام.

کە ئایینی ئیسلام هات ئاوێستا کاریگەری ئیسلامی لە سەر بوو، یان یاسایی (فیودەت) بەکار دەهێنرا کە کوڕ دەیتوانی دایك و باوك کچی خۆی مارە بکات و خۆشك و برا لەیەك مارە بکرێن لە سەر ئەو بنەمایەی کە ڕەچەڵەك ون نەبێت، لەم سەردەمەدا ئەم کارە باو بوو، بۆ نمونە مێژوونووسان دەڵێن: هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ ناوچەکە ئەو چاکەیەی لەگەڵ میللەتی کورددا کرد کە مەحرەمی دروست کرد لە ناوچەکەدا، لە یاسای شەریعەتی زەردەشتیدا بە ناوی یاسای (فیودەت) کە دایك لە کوڕی خۆی مارە دەکرا و کچ لە باوك و خوشك لە برا (کامبوزیا) کە کەسایەتییەکی ئایینی بوو خوشکەکەی خۆی هێنا و پاشان کوشتی (هێرۆدۆت) لە ٤٨٤ -٤٨٩ ی پ.ز باسی کردووە، (ئەردەشیری دووەم) کچەکەی خۆی مارە کرد کە مێژوونووسی یۆنانی (کتیزیاس) پێنج ساڵ پێش زایین ژیاوە و ئەم مێژووەی نوسیوەتەوە پاشان ( قوباد) کچەکەی خۆی مارە کرد، مێژوونووس (ئاگاتیاس) باسی لێوە کردووە ( ئەنەوشیرەوان) ئەویش کچەکەی خۆی مارە کردووە پرۆفیسۆر (ڕالینوم) باسی کردووە کە وەرگێری مێژووی (هێرۆدۆت)ە بۆ زمانی ئینگلیزی، زۆری تریش هەن کە کەسایەتی ئایینی بوون و ئەو یاسایەیان بەکار هێناوە کە گوایە ئێستا زەردەشتیەکان دەڵێن ئەمە لە ناو ئایینی زەردەشتیدا باو نەبووە بەڵکو لە ناو ئاریەکاندا باو بووە خۆ ئەگەر واش بێت زەردەشت پەیامبەری ئارییەکانیش بووە!

ئایینی ئیسلام ئەو چاکەیەی هەبووە بۆ گەلی کورد کە ئەو یاسایەی نەهێشت.

ئەو چوار بەشەی ئاوێستا کە هیچ شەرع و یاسایەکی تێدا نەماوە، بەڵکو تەنها چیرۆکی بەر ئاگردانن بریتین لە مانەی خوارەوە:

١ -دینکرد

٢ -نەتەر

٣ -ویستاگ

٤ -یەزدەك

هەروەها لە ناو ئەو چواربەشەی ئاوێستادا پێنج بنەمای سەرەکی هەیە بۆ بەندایەتی:

١ -یەسنا: واتا نزا و پاڕانەوە کە لە بەرانبەر ئاگردا دەخوێنرێت.

٢ -ویس پزد: واتا بەندایەتی بۆ ئاهورامەزدا ئەمە تەواوکەری یەسنایە.

٣ -وەندیدان: ئەمەیان دەستووری ئیش وکار و سەرکەوتنە بەسەر دێوو درنجەکاندا.

٤ -پشت یان سروود یان گاتە: ئەمە بۆ ئەو شەش فریشتەیە دەخوێنرێت کە زەردەشت گفتوگۆی لەگەڵ کردون.

٥ -خوردە ئاوێستا: واتا ئەو نوێژانەی لە بۆنە و جەژنەکاندا دەخوێنرێت.

بە کورتی ئەمە باسێکی ئاوێستا بوو.

## باوەڕی زەردەشتی

لە ئایینی زەردەشتیدا ئاهورامەزدا بە خوای چاکە ناوزەد کراوە، ئەهریمەن بە خوای خراپە دانراوە.

هەمیشە ئەم دوو دەسەڵاتە کە لە ناو زەردەشتییەتدا بە خوا ناسراون لە کێشمە و وەرگرتنی دەسەڵاتدان بۆ وەرگرتنی دەسەڵات لە دەست یەکتری.

ئەوەی کە جێگای سەرنجە ئەم دوو خوایە لە خوایەکی کەوە سەرچاوەیان گرتووە کە ناوی (زەروان) کە گوایە زەروان لەمەولاوە دەسەڵاتی خۆی بەخشیوەتە دەست ئاهورامەزدا بۆ چاکە، بەڵام ئەهریمەن ئەمەی پێ ڕەوا نییە، بۆیە کەوتۆتە گیانی شوێن کەوتووانی ئاهورامەزدا.

ئەگەر باوەڕێك لە سەر ئەم شێوەیە دابمەزرێت خواکان لە دەسەڵات لە یەکتری سەندنەوەدا بن ئەو کات ژیان بەرەو لە ناو چوون و مرۆڤەکانیش بەرەو فەتارەت دەچن، کەواتە ئەم ئایینەی کە ئێستا بانگەوازی بۆ دەکەن هەڵخڵەتاندنی گەلی کوردی موسڵمانە و بیرێکی پوکاوەی سەردەمی ساسانیەکانە کە ئێستا ئەیانەوێت بە ناوی هێنانەوە کایەی دەوڵەتی کوردی کە گوایە وەك زەردەشت بانگەوازی بۆ دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی کردبێت وا ئێستا دەیانەوێت بە بیری زەردەشتی دەوڵەتی کوردی دابمەزرێنن کە تەنانەت بنەمایەکی یاسایی لە ناو ئەو ئایینەدا نەماوە یان بە سرودی ئەی ڕەقیب کە شانازی بە کەیخوسرەوە دەکەن، خۆیان بە نەوەی ئەو دەزانن لە کاتێکدا دەوڵەتی ماد بەدەستی ئەو لە ناو چووە.

کەئیسلام هات کۆتایی هێنا بە پیرۆزترین شتی زەردەشتی کە بریتی بوو لە میزی گا، ئایینی پیرۆزی ئیسلام چاکەیەکی تری خستە سەرشانی کورد یاسایەکی تری ئاوێستایی و زەردەشتی تریشی نەهێشت کە بریتی بوو لە ( ڕەدوو) یان (هەڵگرتن) کە لە ناو کۆمەڵگای کوردەواریدا وای لێهاتبوو کچەکان و ژنەکان لە ماڵەکاندا زیندانی دەکران، نەکو پیاوێک ئایینی زەردەشتی یان موغێك یان ئەتروبانێك یاخود ڕۆحانییەك ڕەدوی کات و ئیتر کە دووری خستەوە لە جێگای خۆی ئەوکات ئەو دەبێتە خاوەنی ئەو ئافرەتە، هەرچەندە بە داخەوە ئێستاش لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا ئەو مەراسیمە ماوە، بەڵام گۆڕانکارییەکی تەواوی بەسەردا هاتووە گوایە ئێستا ئەگەر دوو کەس یەکتریان بە دڵ بێت هەڵی دەگرێت و دەیبات، بەڵام بۆ دەیبات بۆ لە خۆی مارە ناکات خێرا.

پاشان بە نەمانی ئەم ئایینە و مەرسیمەکانی کورد ڕزگار بوو بەتایبەت لاوانی کورد بە کچان و کوڕانی لە دەست بە قوربانی کردن، چونکە ئەگەر ئاتەشگەیەکی تازەی زەردەشتی بکرایەتەوە دەبوو کچێك بکرایەتە قوربانی و پێشکەشی ئاتەشگەکە بکرایە، خۆ ئەگەر کچێك دەست نەکەوتایە ئەوا کوڕێکی نابالغیان دەکردە قوربانی کە (ئولاڤ ئوشیم) لە کتێبی مێژووی گەیشتن بە دەسەڵاتی خۆیدا باسی کردووە.

گەلی کوردی موسڵمان هەمیشە شانازی کردووە بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە لە بەر ئەوەی ئەوەندەی ئێمە سوودمان لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بینیوە ئەوەندە سوودمان لە هیچ بیرو باوەڕێکی کە نەدیوە بە تایبەت نازانین ئێستای بیری زەردەشتی و لە پێشینەشدا چ خزمەتێکی بە میللەتەکەی من کردووە تا ئەو بیر و باوەڕە جێگەی سەرنجی من بێت.

(مەودودی ) دەڵێت؛ ئێمە ناتوانین هیچ شتێك بە زەردەشت بڵێین وەك موسڵمان لەبەر ئەوەی ئەگەر پەیامبەر بووبێت ئەوە پەیامی پەیامبەرێتی تەواو بووە کۆتایی پێ هاتووە، خۆ ئەگەر فەیلەسوفێکیش بووبێت وەك زۆربەی فەیلەسوفەکانی تر ئێمە سوودی لێوەردەگرین.

# مەملەکەتی شازدەیەم
## ڕووداوی هاوەڵانی ئەشکەوت و ذولقەرنین و یەئجوج و مەئجوج

### هاوەڵانی ئەشکەوت کێن؟

ئەم باسە ڕاستە هیچ پەیوەندی نییە، بە پێغەمبەرانەوە، بەڵام پەیوەندی زۆری هەیە بە کات و سەردەمی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت.

لە هەرەمی سەرچاوەی مێژووی ئیسلامدا، ئەم باسەم بینیوە کە دوایی ژیانی حەزرەتی (عیسا) نووسرا وە، گوایە ئەوکات ڕوویداوە لە دوای گەڕانەوەی (عیسا) کوڕی مەریم بۆ لای پەروەردگاری، بەڵام بە چەند بەڵگەیەک دەیسەلمێنێت کە وانییە.

بەڵگەی یەکەم: گوایە لەسەردەمی پادشایەکدا بە ناوی (دەقیانوس) کە لە ڕاستی دا هیچ سەرچاوەیەک نییە ئەو ناوە پشت ڕاست بکاتەوە لە سەردەمی (عیسا) کوڕی مەریەمدا، بە هەموو پێوەرێک هەڵەیە ئەگەر لە ساڵی یەکی میلادی دەست پێبکەین کە خودی حەزرەتی (عیسا) سی و سێ ساڵ یان سی و پێنج ساڵ لە سەر زەویدا ژیاوە، ئەمانیش (٣٠٩) ساڵ خەوتوون یاخود ( ٣٠٠) ساڵ واتا جیاوازی ڕۆژمێری هیجری و شەمسی

لانی کەم لە دوای گەڕانەوەی (عیسا) (٢٠٠) ساڵی نەخایاند هەموو ڕۆمی شەرقی و غەربی لە کۆمەڵەی نیقییەوە ئایینی مەسیحیان وەرگرت ماوەیەکی کەم نەبێت، بە هۆکاری جوولەکە لە ناو قودس و دەوروبەریدا، دەنا لە ڕێگای پۆلسەوە هەرزوو دینەکە شێوێنراوە لە لایەن وڵاتانەوە تەبەنی کرا.

کەواتە بەڵگەی یەکەم ناگونجێت، لە نێوان پێغەمبەر عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) و پێغەمبەر محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( ٥٦٠) ساڵ نێوانیانە. بە گوێرەی ڕۆژمێری ( گریگۆری)، بۆ زانیاری خوێنەر سەرەتا ئەم ڕۆژمێرە میلادییە یان وەکو کورد دەڵێت زایینی لە ماوەی هەشت مانگدا ساڵ دروست بووە، تا گریگۆری ناوی چوار پادشای ئەوروپای خستە سەر بەناوی ( ئۆگەستین، یەنایەر، مارشاڵ و فێبرایر)

بۆ زانیاری گۆڕانکاری لە ساڵی زاینی نزیکەی ساڵی (٥٠٠) کۆچی ئەنجامدرا لە لایەن گریگۆری ( پاڤایی یاخود پاپای) ڕۆم.

کەواتە بە هەموو پێوەرێک ناگونجێت دوای (عیسا)ی کوڕی مەریەم بێت، خوای گەورەش لە هەموو زاناترە (والله أعلم).

بەڵگەی دووەم: بۆ ئەم باسە ئەوەیە هیچ پەیوەندی بە نساراوە نییە، لە کتێبەکاندا هاتووە لە مێژوویاندا، ڕووداوێکی وا گەورە لە ساڵانی زاینیدا زوو هەستی پێ دەکرا و پاداشت دەکرا لە مێژوودا، کەواتە بە هیچ شێوەیەک لە دوور و نزیک جێگای گرنگیدانی نەسارا نەبووە بە هەموو مەزهەبەکان لە هەموو سەردەم و کاتێکدا، هیچ سەرچاوەیەک دوور و نزیک باسی نەکردووە و بایەخی پێ نەدراوە.

بەڵگەی سێیەم: یەهود خاوەنی پرسیارەکەیە کە قورەیش چووە لایان بۆ پرسیاری پێغەمبەر، گوایە محمد ﷺ ڕاستە پێغەمبەرە؟!

یەهود سێ پرسیاری دانێ وتی ئەگەر محمد ﷺ وەڵامی دایەوە ئەوا پێغەمبەرە!

پرسیاری یەکەم: بریتی بوو لەوەی ڕۆح چییە؟

پرسیاری دووەم: ئەو کۆمەڵە کەسە کە هەڵهاتن، یاخود ڕۆژانێک بوون دیار نەمان کێ بوون؟

پرسیاری سێیەم: ئەو کەسە کێیە کە چواردەوری دنیا گەڕاوە؟

ئەم سێ پرسیارە خودی یەهودیش بە دوای وەڵامەکەیدا گەڕاوە، خۆشیان وەڵامی ئەم سێ پرسیارەیان لا نەبووە، خۆشە ئەگەر لایان بوایە بە نەضری کوڕی حارث سەرانی تری قورەشیان دەوت، یەهودیش بە دوایدا دەگەڕێت ئەگەر پێغەمبەر بێت ئەوا دەیزانێت و خوای گەورەش بە وەحی ئاگاداری دەکاتەوە، یەهود و عەرەبی موشریک پرسیارەکە دەکەن، بەڵام وەڵام نازانن، وتیان بە بەڵگەی ئەوەی هیچ وەڵامیان نەدایە قورەیش سەرانی قورەیش تەنها بە پرسیار دەهاتنەوە وەکو قوتابی لەبەردەم پێغەمبەردا دەستیان هەڵبڕی و چاوەڕوانی وەڵام بوون.

بەڵگەی چوارەم: هیچ کات یەهود پرسیاری نەکردووە لە ئایینی مەسیحی چونکە بڕوای پێی نییە و بەدوایدا ناڕوات، ئەمەش لای نووسەر بەهێزترین بەڵگەیە، لە کاتێکدا ( ئیبن قوتەیبە) لە کتێبی (المعارف)دا هەمان ڕاوبۆچوونی هەیە.

## چوونە ناو باس

قورەیش بۆ ئەوەی بزانێت محمد ﷺ پێغەمبەرە و لە ئاسمانەوە وەحی بۆ دێت، شاندێکی پێکهێنا بە سەرۆکایەتی (نەضری کوڕی حارث) ئاماژەمان پێداوە لە بەشەکانی دیکەدا.

ئەم سێ ڕووداوە بە هەمان شێوەی نادیار دەمێنێتەوە و کاتی دیار نییە ئەو کەسانەش دیار نین، بە واتای ئەوەی یەهود توانای مێژوویی خۆی نییە و لە بیری کردووە، هەموو گەلان مێژوویان لەسەر دار و بەرد دەنووسنەوە بەڵام یەهود تەوراتی لە دەستدا، بوونی لە دەست دا، خاک و پادشای لەدەست داو باکیشی نەبووە.

نووسەرەکانی هاوەڵانی ئەشکەوت لە نێوان پێغەمبەر عوزێر پاشان حەزرەتی زەکەریایە کە نزیکە (٥٠٠ بۆ ٦٠٠) ساڵ نێوانیانە، ئەوەندەی بۆمان دەرکەوتووە لە خاکی شام دا ڕوویداوە لەوکاتەی کە پادشاکانی ئێران ئایینی زەردەشت، دەستکاری کراوی مەجوس بەسەر هەموو ناوچەکاندا بڵاو کردەوە، هەرکەس لە بت پەرستی فارس و بابل لای بدایە ئەوا تووشی ئازار و ئەشکەنجە و لەسێدارەدان دەبووەوە، یۆنانییەکانیش هاتبوونە ناوچەکە و بنەماڵەی (ئەخمینیەکانی) ئێران زۆر بە دەسەڵات بوون سنووری دەوڵەکەیان تا تورکیا، میسر، چین و یەمەن ڕۆیشتبوو، یۆنانەکایش خەریکی ئەوەبوون کە ژیان و شارستانیەت پاشان قەڵەمڕەوی خۆیان فراوان بکەن، ئەم چەند کەسەی کەبە هاوەڵای ئەشکەوت ناسراون لە هاتنیاندا بۆ ناوچەکە بوونەتە یەکتاپەرست و شوێن ئایینی  یەکتاپەرستی کەوتوون لە ڕێگای بانگەوازی گەلی ئیسرائیل لە ناوچەکەدا ماونەتەوە، ئەو سەرچاوانەی کە دەڵێن ئەو کەسانە (جنراڵی) سەربازی ڕۆم بوون، لە ڕاستیدا ڕۆم نییە بەڵکو ( ئیغریقی)ە، چونکە ڕۆم دروست نەبووە، بەڵکو ( ئیغریق) بوونی هەیە و خاوەنی دەوڵەت و ژیار و سەرباز و هێزی تایبەتی خۆیەتی.

لە دوو حاڵەت بە دەر نییە، حاڵەتی یەکەم بریتیە لەوەی وازیان لە بت پەرستی (زیۆس) هێناوە لە ئیغریق دا، گومانی تێدانییە کە سزاکەی ڕاستەوخۆ کوشتن بووە و نەزانیش بە دینەکەیان و بیرو باوەڕیان هەڵهاتوون بۆ ناو ئەشکەوت.

حاڵەتی دووەم: هەر خەڵکی ناوچەکەن سەر بە دەوڵەتی فارس کە بت پەرستن، هەموو سەرباز و پلەداری دەوڵەتی پارسیا بوون، کە پێیان زانراوە هەڵهاتوون بۆ ئەشکەوت.


یارانی کەهف
ئەفسوس: باکووری خۆرئاوای
طەرسوس
بە ڕیوایەتێکی تر نزیک بەتراء لە ئوردون
عمورية
بحيرة
الملح
هضبة
الأناضول
قونية
طوروس
سيحان
جيحان
قيصرية
ملطية
مرعش
أضنة
طرسوس
مرسين
انطاليا
انطاكية
حلب
اللاذقية
حماة
قبرص
حمص
طرابلس
بعلبك
بيروت
دمشق
البحر المتوسط
بلاد الشام
حيفا
الأردن
عمان
القدس
البحر الميت
الكرك
غزة
الدلتا
الإسكندرية
تانيس
الفرما
العريش
النقب
الرقيم
البتراء
معان
بابليون
القلزم
أيلة
الفيوم
مصر
سيناء

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَمۡ حَسِبۡتَ أَنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡكَهۡفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُواْ مِنۡ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا (٩)
إِذۡ أَوَى ٱلۡفِتۡيَةُ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةً وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدًا (١٠) فَضَرَبۡنَا عَلَىٰٓ
ءَاذَانِهِمۡ فِي ٱلۡكَهۡفِ سِنِينَ عَدَدًا (١١) ثُمَّ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِنَعۡلَمَ أَيُّ ٱلۡحِزۡبَيۡنِ أَحۡصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓاْ أَمَدًا (١٢) نَّحۡنُ نَقُصُّ
عَلَيۡكَ نَبَأَهُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّهُمۡ فِتۡيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمۡ وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدًى (١٣) وَرَبَطۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا
رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا (١٤) هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ
ءَالِهَةًۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا (١٥) وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا
يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا (١٦)
* وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي
فَجۡوَةٖ مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا (١٧)
وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ
ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا (١٨) وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ قَالَ قَآئِلٞ
مِّنۡهُمۡ كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ
هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ بِكُمۡ أَحَدًا (١٩)
إِنَّهُمۡ إِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ يَرۡجُمُوكُمۡ أَوۡ يُعِيدُوكُمۡ فِي مِلَّتِهِمۡ وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا (٢٠) وَكَذَٰلِكَ أَعۡثَرۡنَا
عَلَيۡهِمۡ لِيَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيۡبَ فِيهَآ إِذۡ يَتَنَٰزَعُونَ بَيۡنَهُمۡ أَمۡرَهُمۡۖ فَقَالُواْ ٱبۡنُواْ
عَلَيۡهِم بُنۡيَٰنٗاۖ رَّبُّهُمۡ أَعۡلَمُ بِهِمۡۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا (٢١) سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ
رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ وَيَقُولُونَ خَمۡسَةٞ سَادِسُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِۖ وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ كَلۡبُهُمۡۚ قُل رَّبِّيٓ
أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ إِلَّا مِرَآءٗ ظَٰهِرٗا وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا (٢٢) وَلَا
تَقُولَنَّ لِشَاْيۡءٍ إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا (٢٣) إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَهۡدِيَنِ
رَبِّي لِأَقۡرَبَ مِنۡ هَٰذَا رَشَدٗا (٢٤) وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا (٢٥) قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا
لَبِثُواْۖ لَهُۥ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَبۡصِرۡ بِهِۦ وَأَسۡمِعۡۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ
أَحَدٗا (٢٦) وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا (٢٧)﴾
الكهف

واتە: ئەی محمد ﷺ تۆ وا گومانت بردو واتزانی کە هاوەڵانی ئەشکەوتەکە و (ڕەقیم) شتێکی سەیرو سەرسوڕهێنەرن، نەخێر هەر ئەمانە نییە بەڵکو ئیشی خوای گەورە زۆر لەمە سەیرو سەرسوڕهێنەرترە، ئەو بەڵگەو موعجیزانەی کە ئاشکرام کردووە بۆ بەندەکانم زۆر لەمە گەورەترو سەرسوڕهێنەرترە، (ڕەقیم) ناوی ئەشکەوتەکە بووە یان ناوی دۆڵەکە بووە یان ناوی دێیەکە بووە، یاخود ناوی ئەو شاخە بووە کە ئەشکەوتەکەی تێدا بووە، یان ئەو لەوحە بووە کە ناویانی لێ نووسراوەو لە دەرگای ئەشکەوتەکەیان داوە﴿٩﴾ کاتێك ئەو کۆمەڵە گەنجە باوەڕدارە بۆ پاراستنی دینەکەیان لەدەستی قەومەکەیان ڕایانکرد و چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە و وتیان: ئەی پەروەردگارمان لەلایەن خۆتەوە ڕەحممان پێ بکە و بمانپارێزە لە دوژمن و سەرەنجاممان باش بکە، کارەکەشمان چاك بکە کە ڕائەکەین لەدەست کافران و لێیان دوور ئەکەوینەوە﴿١٠﴾ ئێمەش دامان بە گوێیاندا بۆ ئەوەی هیچ نەبیستن و چەندساڵێکی زۆر خەواندمانن لەناو ئەشکەوتەکەدا﴿١١﴾ پاشان بەخەبەرمان هێنان لەو خەوە، تا بزانین کام لەم دوو حیزب و کۆمەڵە لە باوەڕداران و کافران کە جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە دەزانن چەندێك لەناو ئەشکەوتەکەدا بە خەوتوویی ماونەتەوە؟﴿١٢﴾ ئەی محمد ﷺ ئێمە هەواڵی ئەوانت بە حەق بۆ باس ئەکەین و بۆت ئەگێڕینەوە نەك وەك ئەو هەواڵانەی لەلای ئەهلی کتاب هەیە کە ڕاست نییە، بەدڵنیایی ئەمانە کۆمەڵێك گەنج بوون ئیمانیان بە خوای خۆیان هێنا، ئێمەش زیاتر هیدایەتمان دان و دامەزراومان کردن﴿١٣﴾[5]

دڵیامان جێگیر و بەهێز کرد و ئارامگرمان کردن بەوەی کە لە کافران دووركەونەوە، کاتێك کە هەستان و کۆبوونەوە لە پشت شارەوە و بڕیاریان دا کە بڕۆن و وتیان: پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە، جگە لە خوای گەورە عیبادەت بۆ هیچ خوایەکی تر ناکەین، کە ئەوان خوایان هەبووە و پەرستوویانن ئەگەر ئێمە عیبادەت بۆ جگە لە خوای گەورە بکەین ئەوە بەدڵنیایی زیادڕەویمان کردووە و سنوورمان بەزاندووە و لە حەق دووركەوتووینەتەوە و قسەیەکی پوچەڵ و بەتاڵمان کردووە﴿١٤﴾[6]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[5]- هەمیشە گەنجان زیاتر ڕوو لە حەق دەکەن، ئەوانەیشی باوەڕیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا زۆربەیان گەنج بوون و کەمێك لە پیرەکان موسڵمانبوون و زۆربەیان لەسەر شەریك دانان بۆ خوا مردن، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمان زیاد و کەم دەکات، بە گوێڕایەڵی و کردەوەی چاك زیاد دەکات و بە تاوان و سەرپێچی کەم دەکات.

[6]- هەرچەندە زۆر خۆشگوزەران بوون و لە نەوە و خزمە نزیکەکانی پاشای ڕۆم بوون، تەواوتر ئەوەیە ئەم بەسەرهاتە پێش هاتنی عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ بووە، چونکە زاناکانی جوولەکە بایەخیان داوە بە پاراستنی بەسەرهاتەکەیان و لە کتابی ئەواندا باسکراوە و ئەوانیش پێش عیسا بوونە

ئەم قەومەی ئێمە جگە لە خوای گەورە خوای تریان بۆ خۆیان بڕیار داوە، ئەی بۆ بەڵگەیەکی ئاشکرا ناهێنن لەسەر خوایەتی خواکانیان کێ ستەمکارترە؟ واتە: هیچ کەسێك زاڵمتر نیە لەو کەسەی کە درۆ بۆ خوای گەورە هەڵئەبەستێ و شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار ئەدات﴿١٥﴾ کاتێك کە ئێوە لە بت پەرستان و خواکانیشیان دوورکەوتنەوە و جیابوونەوە و ڕۆیشتن و پەناتان برد بۆ ناو ئەشکەوتەکە پەروەردگار ڕەحمەتی خۆیتان بۆ بڵاو ئەکاتەوە و بەفراوانی ئەیڕێژێ بەسەرتاندا، کاریشتان ئاسان ئەکات﴿١٦﴾[7] کاتێك کە خۆر هەڵدێت لەسەر ئەشکەوتەکەیان لائەدا و لار ئەبێتەوە بەلای ڕاستدا کاتێك کە خۆر ئاوا ئەبێ بەهەمان شێوە لائەدات و لێیان دوورئەکەوێتەوە بەلای چەپدا، ئەوانیش لە شوێنێکدا بوونە لەناو ئەشکەوتەکە کە کونی هەبووە و کراوە و فراوان بووە، [8]پاراستنی لاشەی ئەوان یەکێکە لە نیشانەکانی گەورەیی خوای گەورە هەر کەسێك خوای گەورە هیدایەتی بدات ئەوە هیدایەتدراوە، هەر کەسێکیش کە خوای گەورە گومڕای بکات نابینی دۆستی هەبێت و ڕێنمایی بکات بۆ ڕێگای ڕاست﴿١٧﴾ تۆ وا هەست ئەکەی کە ئەوان بەخەبەرن لە کاتێکدا ئەوان خەوتوون لەبەر ئەوەی چاویان کراوەتەوە، لە کاتی خەوتندا ئەمدیو و ئەودیویان پێ ئەکەین بۆ ئەوەی زەوی لاشەیان نەخوات، سەگەکەیشیان کە لەگەڵیاندا بوو هەردوو دەستی شۆڕ کردۆتەوە لە بەردەم دەرگاکەدا، ئەگەر تۆ بیانبینی ئەوە لێیان ڕائەکەی، لێیان ئەترسیت و ترس پڕ دڵت ئەبێ بەهۆی ئەو شێوازەی کە ئەوانی تیادان و خوای گەورە وای کردبوو هەرکەس بیانبینێت لێیان ڕابکات تا کاتی دیاریکراو، یاخود وتراوە لەبەر درێژی نینۆك و قژو ڕیشیان﴿١٨﴾[9] بەم شێوازە بەخەبەرمان هێنان کە لەشساغ و تەندروست بوون تا لەناو خۆیاندا پرسیار بکەن چەندێك ماوینەتەوە؟ یەکێك لەوان وتی: چەندێك لێرە ماونەتەوە و خەوتوونە؟ وتیان: ڕۆژێك یان هەندێك لە ڕۆژێك ماوینەتەوە لەبەر ئەوەی بە بەیانی هاتوونە و خوای گەورە بۆ ئێوارە بە خەبەری هێنان بۆیە وتوویانە: ڕۆژێك هەندێکی تریان وتیان: خوای گەورە خۆی ئەزانێ ئێوە چەندێك ماونەتەوە، یەکێکتان بەم پارەیەی کە پێتانە کە پارەی زیو بووە بینێرن بۆ شارەکە با بزانێ کام خواردنە لە هەمووی پاکتر و حەڵاڵترە بۆمان بێنێت با بە نهێنی بڕوات تا کەس نەیناسێتەوە و کەس هەستی پێ نەکات و شوێنەکەمان نەزانێت﴿١٩﴾ چونکە ئەگەر ئاشکرا بین و ئەوان ئاگایان لێمان بێت و شوێنمان بزانن بە دڵنیایی ڕەجم و بەرد بارانمان ئەکەن، یان ئەمانگەڕێننەوە سەر دینەکەی خۆیان، هەر کەسێکیش بگەڕێتەوە بۆ دینی ئەوان

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[7] -پاشا زۆر بەدوایاندا گەڕاوە نەیدۆزینەوە و خوای گەورە وێڵی کردن، هەروەکو چۆن کافرانی وێڵ کرد لە دۆزینەوەی پێغەمبەری خوا و صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەبو بەکر لەناو ئەشکەوتەکە، هەرچەندە چوونە سەر ئەشکەوتەکەیش.

[8] - واتە: لە کاتی خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوونیشدا خۆر لێی نەداون و لە سێبەردا بوونە و خوای گەورە پاراستنی لەوە.

[9] - نەچۆتە ژوورەوە بۆ پاسەوانی کردنیان، لەبەر ئەوەی مەلائیکەتی ڕەحمەت ناچێتە ماڵێکەوە کە سەگ و وێنەی تێدا بێت، ئەمیش وەکو ئەوانی بەسەر هات، لە قورئانی پیرۆز لەگەڵیاندا باسکراوە کە ئەمە سوودی هاوەڵایەتی کردنی پیاوچاکانە.

ئەوە هەرگیز نە لە دونیا و نە لە قیامەت سەرفرازو ڕزگاری نابێت﴿﴾ بەم شێوازە شوێنەکەیانمان ئاشکرا کرد و خەڵك دۆزیانیەوە تا خەڵکی بزانن بەڵێنی خوای گەورە بە زیندووو بوونەوە حەقە لەبەر ئەوەی لەو سەردەمە خەڵکی باوەڕیان بە زیندووو بوونەوە لاواز ببوو، بە دڵنیایی قیامەتیش دێت و هیچ گومانێکی تیانیە، دوای ئەوەی کەسێکیان چوو لە بازاڕ خواردن بکڕێت خەڵکی پارەکەیان بینی وایانزانی ئەمە کەنزێکە و دۆزیوێتیەوە، بردیان بۆ لای پادشا دواتر شوێنەکەیان ئاشکرابوو زانیان ئەمانە خوای گەورە وەکو موعجیزە خەواندوونی و لەوێدا خوای گەورە مراندنی، خەڵکەکە کێشە کەوتە نێوانیانەوە وتیان: شوێنێکیان لەسەر دروست بکەن خوای گەورە خۆی زاناترە بەمان، ئەوانەی کە زاڵ بوون بەسەر کارەکەدا و قسە ڕۆیشتوو و دەسەڵاتدار بوون وتیان: مزگەوتێکیان لەسەر دروست دەکەین﴿﴾[10] هەندێك لە خەڵکی ئەڵێن: ئەمانە سێ کەس بوونە و چوارەمیان سەگەکەیان بووە، هەندێکی تریان ئەڵێن: پێنج بوونە و شەشەمیان سەگەکەیان بووە لە خۆیانەوە بە گومان و بێ زانیاری قسە ئەکەن، هەندێکی تریان ئەڵێن: حەوت بوونە و هەشتەمیان سەگەکە بووە. ئەی محمد ﷺ بڵێ: پەروەردگارم خۆی زاناترە بە ژمارەیان چەند کەس بووە، کەس ژمارەیان نازانێ تەنها کەمێك نەبێت، تۆ تیایدا ڕۆمەچۆ مشتومڕو دەمەقاڵێی تیا مەکە، تەنها باس کردنێکی ئاشکراو سووك نەبێت بەوەی کە زۆر ڕۆنەچن تیایدا تەنها بیگێڕنەوە، تۆ داوای فەتوا لە هیچ کەسێك لەوان مەکە لە جوولەکان چونکە زانیارییان نییە و لە خۆیانەوە قسە دەکەن، خوای گەورە خۆی بۆی باس کردیت لە قورئانی پیرۆزدا کە حەقە و هیچ گومانێکی تیا نییە﴿﴾[11] جوولەکە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد سەبارەت بە هاوەڵانی ئەشکەوت، فەرمووی: بەیانی هەواڵتان پێ ئەدەم نەیفەرموو: (إن شاء الله)، خوای گەورە پانزە ڕۆژ وەحی لە پێغەمبەری خوا ﷺ گرتەوە، پاشان ئەم ئایەتەی دابەزاند: بۆ هیچ شتێك مەڵێن بەیانی ئەو شتە ئەکەم﴿﴾ ئیلا بڵێن ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بێت، ئەگەر لە بیرت چوو بڵێی :(إن شاء الله) ئەوا زیکری خوای گەورە بکە چونکە شەیتان لە بیری بردوویتەوە و بە زیکری خوای گەورە شەیتان نامێنێت و دوور دەکەوێتەوە ئەگەر پرسیاری شتێکت لێکراو نەتزانی ئەوا داوا لە خوای گەورە بکە و بڵێ: بەڵکو خوای گەورە ئەوەندە بەڵگەم پێ بدات تا لە ڕاستێتی ئەم هەواڵە نزیك ببمەوە و بیزانم﴿﴾ لە ناو ئەشکەوتەکەیاندا سێ سەد ساڵی هەتاوی مانەوە نۆ ساڵیش زیاتر، واتە: سێ سەدو نۆ ساڵ،

---

[10] - کەواتە مزگەوت دروست کردن لەسەر گۆڕ لە دینەکانی ترەوە هاتۆتەوە ناو موسڵمانانەوە و خەڵکی ئەو بڕیارەیان داوە و لە ئیسلامدا حەرامە و خوای گەورە نەفرەتی کردووە لە جولەکە و گاور چونکە گۆڕی پێغەمبەرانیان کردووە بە مزگەوت.

[11] -(ابن عباس) دەفەرمووێ: من لەو کەمانەم کە خوای گەورە جیای کردوومەتەوە و ژمارەیان ئەزانم حەوت کەس بوونە بە سەگەکەوە هەشت بوون، سەبارەت بە ناوی خۆیان و سەگەکەیان و شوێنەکەیان گرنگ نییە ئەگەر گرنگ بوایە خوای گەورە باسی دەکرد، ئەوەی کە هاتووە ئیسرائیلیاتەو صەحیح نییە، گرنگ پەندو ئامۆژگاری وەرگرتنە لە بەسەرهاتەکەو دەرخستنی تواناو دەسەڵاتی خوای گەورەیەو پشتیوانی کردنێتی لە موسڵمانان.

سێ سەد ساڵی خۆری سێ سەدو نۆ ساڵی مانگی دەکات﴿ ﴾ ئەی محمد ﷺ ئەگەر زانیاریت نەبوو بڵێ: خوای گەورە خۆی باشتر ئەزانێ کە چەندێك مانەوە، یاخود لە دوای ئەوەی کە خەڵکی دۆزیانیەوە تا کاتی پێغەمبەری خوا ﷺ چەندێك بووە تەنها خوا خۆی دەزانێت نهێنی ئاسمانەکان و زەوی تەنها لای خوای گەورەیە و کەسی تر نایزانێت، سەرسامم بەوەی کە خوای گەورە هەموو شتێك ئەبینێت و ئەبیستێت و هیچ شتێکی لێ ناشاردرێتەوەو کەس وەکو خوا نابینێت و نابیستێت ئەوان جگە لە خوای گەورە هیچ دۆست و سەرخەرێکیان نیە، هیچ کەسێکیش شەریکی خوای گەورە نییە لە حوکمی خوای گەورە بڕیار بدات، یان خوای گەورە ڕاوێژی پێ بکات﴿ ﴾ ئەی محمد ﷺ بۆیان بخوێنەوە لەو قورئانە پیرۆزەی کە خوای گەورە بە وەحی بۆی ناردوویت، هیچ گۆڕانێك بەسەر وشەکانی خوای گەورەدا نایەت کە قورئانی پیرۆزە، ئەگەر قورئانی پیرۆز نەخوێنیت و شوێنی نەکەویت و کار بە ئەحکامەکانی نەکەی ئەوا جگە لە خوای گەورە هیچ پشتیوان و پەنایەك نییە کە پەنای بۆ بەری﴿ ﴾[12]

کۆتای ئەم باسە بەوە دەهێنین، خوای پەروەردگار یەهودی هێشتەوە و وەڵامی کات و جێگا و ئاوی پێنەدان، بۆ ئەوەی کۆتا وەڵام لای قورئان و ئەهلی ئیسلام بێت، ئەوان چاوەڕوان بن تا ئەهلی ئیسلام ڕاستیەکانیان بۆ بخاتە ڕوو.

ئەمەش مانای وانییە کە نەگەڕێت بە دوایدا، بەڵکو گەڕان بە دوایدا کارێکی باش و پیرۆزە و زۆر زانیاری مێژووی ئارکۆلۆژیامان پێ دەناسێنێت، گوێش لەوانە ناگرین کە دەڵێن پێویستمان نییە بزانین کێن و لە کوێ بوون.

خۆ ئەگەر زانایان ئەم وتەیان نەوتایە لەوانەبوو موسڵمانان زووتر لێکۆڵینەوەیان بکردایە و سەردەم و کاتە نادیارەکانمان بۆ ئاشکرا دەبوو، هەرگیز گوێ بۆ ئەو زانایانە مەگرن کە دەڵێن لێکۆڵینەوە مەکەن لە سەردەم و کات و ناوی کەسایەتییەکان، ڕاستە پێویست نییە بزانرێت سەگەکەی هاوەڵانی ئەشکەوت ناوی چی بوو، یان نێر بوو یاخود مێ، جۆری جلەکانیان چی بوو؟ ئەم باسانەی کە سوودی نییە، بەڵام سوودی زۆر زۆرە لە ڕووی زانستی مێژووییەوە ناوی جێگا و تەنانەت ئەشکەوت و کەسایەتییەکانمان بزانیبایە، بەڵام نەک بە خەیاڵ لە فیلم و زنجیرە و درامای میسری و ئێرانی، لەگەڵ ڕێزم بۆ هونەرەکەیان، ئەوە ناوەکانیان هەموو خوازراوە و هیچ پەیوەندی بە ڕاستییەوە نییە، تەنانەت کاتەکەشیان.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[12] -ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز کەلامی خوای گەورەیە و دروستکراو نییە.

ئەوەندەی لای نووسەر بوو پێشکەشمان کرد داوام وایە خوای گەورە لە ڕاستگۆکان هەژمارمان بکات و داواکارم لە تاوانمان خۆش بێت، لە هەڵەکانمان بمانبورێت و خوای گەورەش لە هەموان زاناترە ( والله أعلم).

## ڕووداوی زولقەرنەین

لە قورئاندا لەگەڵ ڕووداوی هاوەڵانی ئەشکەوت لەیەک سورەتدا هاتوون و کە سورەتی (الکهف)ە، یەکێکە لە پرسیاری یەهود بۆ پێغەمبەری خودا، هەرچەندە لێرەدا لە ڕووی مێژووییەوە باسی ڕووداوەکان دەکەین، بەڵام خودی ڕووداوەکانی یارانی ئەشکەوت و زولقەرنین حیکمەت گەلێکی زۆریان لەخۆ گرتووە، ئەگەر بڵێین لەگەڵ ڕووداوی (موسا) و خضر سەلامی خوایان لێ بێت دوو باسی مێژوویین کە هەموو پێکهاتەی ژیانی لەخۆ گرتووە، لە ئیرادە، ڕێکخستن، ئازایەتی، جوامێری، شۆڕش، بیروباوەڕ، یەکتاپەرستی، زانست، کاری کۆمەڵسازی و هەوڵدان بۆ زانست، چۆنیەتی کاری خزمەتگوزاری بۆ حکومەت دەسەڵات، دەرهێنانی کانزا و زۆر پەند و ئامۆژگاری تر لە خۆ دەگرێت.

بێ گومان ڕووداوی زولقەرنین کات و شوێن و ناوی کەسایەتی وەکو بەرەباب ناسراو نییە، زانایانی تەفسیر و مێژوو ڕای زۆر جیاوازیان هەیە لە بارەی ئەم کەسایەتەی ناو قورئان و هەریەکە بەلای گۆشەنیگایەکی جیهاندا تەفسیری کردووە، هەندێکیشیان هیچ گرنگیان نەداوە بە کەسایەتییەکە و جێگا و سەردەمی، تەنها و تەنها حیکمەت و ئەحکامیان لێ دەرهێناوە.

هەروەها لە کتێبی پیرۆزی نەسارا و یەهود دا لە سفری دانیال دا هاتووە زۆر بە ناڕوونی کە کەسایەتی و شوێن و جێگا و دیاری نەکراوە، تەنها هاوشێوەی قورئان، ئاماژە بە جۆری کوالیتی کاری کەسایەتییەکە کراوە.

لێرەدا بە هەمان شێوە پرسیاری یەهود لە پێغەمبەرﷺ، هەمان دڵنیایمان دەداتەوە کە ئەوانیش ئەو کەسایەتییەیان بۆ دەست نیشان نەکراوە، خوای گەورە بە جێی هێشتووە بۆ گەڕان و لێکۆڵینەوەی مرۆڤەکان و گەڕان و بەدواداچوونیان، لە هەموو مێژووەکاندا ناوی کەسێک هاتووە و ئاماژەیەکی بۆ کراوە کە زولقەرنین بوو، ئەویش (ئەسکەندەری مەقدۆنی) بووە ئەم کەسایەتییە ناوی زۆر هێنراوە لەوانە ( ئەلیکساندەری گەورە، یان ئەسکەندەری یۆنانی، یاخود ئیغریقی...هتد) کە هەموو ئاماژە بۆ ئەو کەسایەتییە موسوڵمانانە ئەو کەسایەتییە واتا ( ئەسکەندەر) ڕەت دەکەنەوە کە گوایە موشریک بووە و هەروەها هاوڕەگەزباز بووە، بە تایبەت لەم ساڵانەی دواییدا کە هالیود فیلمی لەسەر دروستکرد، گوایە کەسێک بووە حەزی لە پیاو کردووە و ئارەزووی ئەوەی بوو لەگەڵ پیاودا بخەوێت، بە تایبەت لەگەڵ سەرباز و جەنەڕاڵە سەربازەکانیدا.

هەندێکی تر لە زانایان دەڵێن یەکێکە لە پادشاکانی یەمەن و هەرخۆی ناوی زولقەرنەینە، چونکە لەو ناوچەیە لەو جۆرە تاوانە زۆرە وەکو ( ذی نواس، ذی یزن، ذی مەتان) ئەمەش زانا ئیسلامییە عەرەبەکان ناوی دەبن، جۆرێک لە نەتەوەگەرایی پێوە دیارە، هەرچەندە بوونی ذی نواس و ذی یزن بوونی هەیە، بەڵام لەو ناوچەیەدا مێژوویان تا ڕادەیەک دیارە و مێژووی ذولقەرنەین نادیار و ئاشکرا نییە، پاشان هەموو ئەو کەسایەتیانە سەر بە دەوڵەتی پارسیا بوون، هیچیان سەربەخۆ نەبوون. ئەمەش لەگەڵ کەسایەتی زولقەرنەینی ناو سورەتی (الکهف) ناگونجێت، بێجگە ذی یزن، چۆتە وڵاتی ئێران لەسەردەمی کیسراکاندا، بەڵام ئەوانی تر لە یەمەن دوور نەکەوتوونەتەوە.

خودی ذی یزن کە چووەتە ئێران بۆ داوای هاوکاری سوپا چووە دژی حەبەشە و ئیمپراتۆری ئەفەریقا.

ڕایەکی تر هەیە گوایە کوروشی گەورە خاوەنی دەسەڵاتی گەورەی پارسیایە، ئەو پادشایەکی دادپەروەر بووە.

لە ڕاستیدا کوروش کەسێکی ئازا و دادپەروەر بووە، بەڵام بێجگە کۆتا جەنگی لەگەڵ ئیغریق دا نەگەڕاوە بە دنیادا و سەرکەتووش نەبووە لەگەڵ ئیغریق دا، تەنانەت مێژووی ئێرانی کۆن یاخود دێرین ناتوانرێت کات و سەردەمی کوروشی گەورە دەست نیشان بکات بە تەواوەتی.

ڕای کۆتایی ئەوەیە کە ذولقەرنەین بە نادیاری بهێڵیتەوە کات و شوێنی دیاری نەکەین، ئەمەش ڕای هەندێک لە ڕاڤەکەرانی قورئان وەکو سەید قوطب و هەندێکی ترە لە سەلەفی مەشرەبەکان کە سوودی نییە و کات بە فیڕۆدانە.

نووسەر: ڕای یەکەم هەڵدەبژێرێت و شیکاری و گومانەکان شیتەڵ دەکات و لە ڕووی سەرچاوە بە درۆ دەخرێتەوە، ئەسکەندەری مەقەدۆنی شیاوترین کەسە کە ژیانی ( زولقەرنەین) بێت ڕەحمەتی خوای لێبێت.

خوێنەر دەبێت سەرەتا ئەوە بزانێت کە زولقەرنەین پێغەمبەر نەبووە، بەڵکو کەسێکی خوا ناس و یەکتاپەرست بووە و دادپەروەر بووە خاوەنی توانا و هێز و پێشکەوتن بووە.

## ناساندنی ئەسکەندەری زولقەرنەین

بۆیە ناوی ئەسکەندەری زولقەرنەینمان هەڵبژارد، زانایانی مێژوونووسی ئەم ئیسلامە بەو ناوە باسیان کردووە لەوانە (ئیبن جەریری طەبەری، ئیبن ئەثیری جەزیری، ئیبن عەساکر و ئیبن جەوزی)

ئەم پیاوە یاخود کوڕە گەنجە کە هەموو دنیای خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆی، چەندین ئیمپراتۆری لەناو بردووە هەموو ژیانی پێکهاتووە لە (٣٢) ساڵ واتا لە ساڵی (٣٥٦) پ.ز لە دایک بووە لە ساڵی (٣٢٣) پ.ز وەفاتی کردووە، ماوەی حوکمرانی لە ساڵی ( ٣٣٦-٣٢٣) بووە کیشوەری ئاسیا و ئەفریقیا و ئەوروپای خستۆتە ژێر دەسەڵاتی، ئەمەش هەموو جیهانی ئەو سەردەمە بووە. پێش ئەوەی زیاتر قوڵ ببینەوە لە باسی ژیانی، گومانی ئەوە کە لەسەریەتی باسی بکەین و بیرەوێنینەوە بە پشتوانی خوای پەروەردگار.

### گومان و وتەکانی لەسەری دەوترێت:

گوایە لەگەڵ دایکی خۆی خەوتووە:

دایکی ناوی ( ئۆلیمپیاس) بووە! ئەم وتەیە زۆر بەر پەرچ دەدرێتەوە، لە تەمەنی ( ١٣) ساڵی دایکی مردوووە و چۆتە لای ئەرستۆی فەیلەسوفی وانەی خوێندووە.

گوایە حەزی لە پیاو کردووە لەگەڵیاندا خەوتووە:

ئەمەش هیچ سەرچاوەیەکی ڕاست و دروست لەبەر دەست نییە، بێجگە فیلمی هۆلیۆدی ئەمەریکی و هەندێک کەسی نوێ بۆ ئەوەی ناوی ناشرین بکەن، یاخود لە ئێستادا لە ئەوروپادا ئەو کارە ڕەواجی پێدەدرێت، دەیانەوێت بنەڕەتی بۆ دروست بکەن.

ئەسکەندەر خاوەنی سێ ژن بووە هەروەها خاوەنی سێ کوڕ بووە، هەرسێ ژنەکەی ئاسیایی بوون دووانیان فارس بوۆە ئەویتریان باختەری، ناوەکانایان (ڕوخسانەی بەختەری) تورک بووە، (ستاتیدا و پروشات) هەر دووکیان فارس بوون، سێ کوڕەکەی بە ناوی (ئەسکەندەری چوارەم، هەرقل و فلیپی سێیەم)

لەکاتی گرتنی دەوڵەتی ئێرانی پارسیا، دژەکانی هیچ لە بارەیەوە کە هاوڕەگەز بووە نەنووسراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە باسی دادپەروەری و شکۆی کراوە، ئەگەرچی پادشای ئێرانی بە دەستی خۆی کوشتوە کە ناوی (دارا) بووە هیچکام لە مێژوونووسانی کۆنی یەهود و موسڵمان و ئەوروپی هیچیان لەسەر نەنووسیوە لەو بارەیەوە، هەندێک مێژوونووس وتویانە موشریک بووە و بتپەرست بووە.

ژیانی بە تەواوی لە لایەن مێژوونووسی بەناوبانگی ئیغریقی دوای هێرۆدۆت مێژووی نووسیوەتەوە ناوی (ئەلباتۆس تکتیکلوس) بووە هیچی لەو بارەیەوە باس نەکردووە.

تاکە پیاوێک کە نزیک بووە لە ئەسکەندەر ناوی ( هفستیون) بووە، وەکو برا و کەسوکاری خۆشیویستووە ئەفسەرێکی ئازابووە لە جەنگدا کوژراوە، چوار برای خۆی لەگەڵیدا بوون لە زۆربەی جەنگەکاندا ئەوکات کە لە بابل نیشتەجێ بوو، دوو برای گەڕاندەوە بۆ یۆنان لەوە دەترسان شۆڕش دژیان دروستبێت، براکانی بە ناوی (ئەوروپا، فلیپوس، کارانوس، سالۆنیل) دوو خوشکی هەبووە بەناوی ( کلیۆپاترا و سینان).

هەروەها (پێتەرگرین) لە دیکۆمێنتە کۆنەکاندا ئاماژەی پێ کردووە کە ئەسکەندەر هەموو حەز و ئارەزووی بۆ ئافرەت بووە.

هەروەها ئاماژە بەوە کراوە لەو تەمەنە کەمەیدا سێ ژنی هێناوە، ئەوەش هەموو گومانەکان بەرپەرچ ئەداتەوە.

هیچ سەرچاوەیەکی بابلی کۆن ئاشور و کلدانی هیچ شتێک لە بارەیەوە نەوتراوە نەبیستراوە.

لە سالآنی (١٩٦٠) فیلمێکی ئەمەریکی لەسەر دروستکرا ئاماژەیەکی پێدرابوو لە کاتی قسەکردندا، بەڵام دوای درامایەکی تری لەسەر دروستکرا نیشاندرا کە ئەو کارەی ئەنجام داوە، ئەمەش بووە هۆکار بۆ توڕەبوونی خەڵکی یۆنان و خۆپیشاندان دژی باڵۆیزخانەی ئەو وڵاتە واتا ئەمەریکا بەرد باران کرا.

ئەلبانی نەژادەکان زۆر خۆشحاڵ بوون ئەگەرچی موسوڵمانانیشن، بەڵام بە گشتی دژی یۆنانن.

ئەو گومانانەش بە تەواوەتی ڕەویەوە.

بت پەرست و هاوبەش دانەر بووە بۆ خوای پەروەردگار!

ئەم وتەیە ڕاستە لە سەرەتای ژیانی تا ئەوکاتەی دەچێتە ناو قودس لەوێ سفری دانیال-ی نیشان ئەدەن کە ئەو پێغەمبەرە ئاماژەی بۆ ژیانی ئەسکەندەر کردووە، ئەویش هەر لەوێ یەکتاپەرست دەبێت، چونکە پێشتر بە ناوی ( زیۆس) کە خواکەیان بوو بانگیان دەکرد، بەڵام ڕاستەوخۆ دەڵێت کافرە ئەو کەسەی وایپێدەڵێت.

هۆکاری گەیشتنی دە وەسیەتەکەی خوای پەروەردگار کە ناسراوە بە (الوصايا العشر) لە سفری خروج لە تەورات دا، ئەو یەکەم کەسە کە دەیکاتە یاسای ڕەوشتی لە ئەوروپا.

هۆکاری مردنەکەی دەرمانخوارد کراوە بەهۆکاری خواناسی و دینداریيەکەی، نەیانویست بێجگە ئایینی یۆنان و ئیغریق ئایینی تر بڕواتە ئەو وڵاتە، تەنانەت کە ئیمپراتۆریەتی ڕۆم دامەزرا ئەسکەندەریان کردە ڕەمزی خۆیان، لە هیچ سەرچاوەکاندا نەهاتووە کە ئەسکەندەر زوڵمی کرد بێت.

## ڕووداوەکانی ئەسکەندەری زولقەرنەین و ڕووداوەکانی ژیانی

ڕووداوی ژیانی ئەسکەندەر لە منداڵییەوە خەریکی خوێندن بوو گرنگی زۆری داوە بە زانست لە بواری بیرکاری و ئەندازیاری و فەلسەفە و پزیشکی و...هتد.

هەروەها سوارچاکی ( ئۆلۆمپیات) بووە چەندین جار لە بواری ئەسپ سواریدا یەکەمی هێناوە، زۆر ئەسپی خۆشویستووە، هەروەها تا لە وڵاتی یۆنان بووە زۆر گرنگی داوە بە هونەری پەیکەرسازی و وێنە، بەڵام لەکاتی هاتنی بۆ قودس وازی لەو بوارە هێناوە تا ئەو کاتەی مردووە لە بابل، هەموو خاکی فارسی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆی، هەروەها خاکی هیند و چین-ی گرتووە تا مۆریتانیا چووە هەموو ناوچەکانی باکووری ئەفەریقا لەبن دەستیدا بووە، جوولەکە پێشوازییەکی زۆری لێ کرد، هەموو ناوچەکانی شام و میسر بێ جەنگ چوونەتە ژێر ڕکێفی و قەڵەمڕەوی، هەرچەندە لەم کتێبەدا، لەوە زیاتر مێژووی ژیانی درێژ ناکەینەوە، چونکە بواری ئەوەمان نییە لەم کتێبەدا لەبەر ئەوەی تایبەتە بە ژیانی پێغەمبەران و تا ڕادەیەک ڕووداوە مێژووییەکانی ناو قورئان.

ئەوەی گرنگە باسی بکەین لە دوای ئەوەی کە ئەسکەندەر بە وتەکانی دانیال سەرسام دەبێت و گۆڕانکاری تەواو لە ژیانیدا ڕوونەدات و کەسێکی خواپەرست و یەکتاپەرست بووە، ئەو باسەی کە باسکراوە لە کتێبی پیرۆز ( لە هەشت سفری دانیال) ( لاپەرە ٦٤٠، چاپی میسر) بە ناونیشانی ( رؤيا دانيال للكبش والتيس)

هەرچەندە تەماشای سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان بکەین جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان دەقەکاندا، بەڵام لە کۆتاییدا هەموو هەر هەمان واتای یەکتری ئەدەن بەدەستەوە، لە ژیانیدا کەسێکی دادپەروەر و ئازا بووە، لە جەنگدا چاو نەترس بووە و لە مەرگ نەترساوە، خزمەتی زۆری بە هەموو گەلان کردووە زوڵمی نەکردووە، هەمیشە حەزی بە ئاوەدان کردنەوە بووە چەندین شاری نوێی دروست کرد، واتا فەرمانی دروست کردنی داوە، زیاد لە (٦٥٠) شار و جێگا لە جیهاندا بە ناوی ئەسکەندەریە لە میسر، سوریا، مەغریب، عێراق، هندستان و چین...هتد.

تەنانەت خەڵکی فارس ئەوەندەیان خۆش ویستووە بە پادشای خۆیان هەژماریان کردووە بە داگیرکەر ناونەبراوە، لەکاتی چوونە ناو شاری ( پرسپۆلیس) ئەوەی تێدا ڕووخا و سووتا ئەسکەندەر دروستی کردەوە، جا بەم هۆکارانە دەڵێین زولقەرنەینی ناو قورئان کە خوای گەورە

بۆی باس کردوین زۆر نزیکە لە سیفاتی ئەسکەندەر، خوای گەورەش لە هەموان زاناترە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُواْ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسْطَٰعُوٓاْ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾ قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴿٩٨﴾﴾ الكهف

واتە: تا گەیشتە نێوان دوو بەنداو (سەدە) کە دوو شاخ بوو کەلێنێك لە نێوانیاندا بووە (یەئجوج و مەئجوج) لەوێوە دەرچوون بۆ وڵاتی تورك و ئاشوبیان ناوەتەوە، ئەوتریّ: لە لای (ئەرمینیا و ئازربەیجان) بووە لای ئەو دوو سەددە قەومێکی بینی لە قسەی غەیری خۆیان تێ نەئەگەیەشتن زمانێکی تایبەتیان هەبووە﴿٩٣﴾ وتیان: ئەی (ذو القرنین) کە ئەم زمانی ئەوانی زانیوە (یەئجوج و مەئجوج) ئاشووبگێرن لەسەر زەویدا و ئاشووب ئەنێنەوە و زوڵم و ستەم ئەکەن و لێمان ئەکوژن کە زانیان توانا و دەسەڵاتی هەیەو بەهێزە وتیان: ئایا ئێمە کرێیەکت بۆ دابنێین بۆ ئەوەی سەد و بەنداوێك دروست بکەی لە نێوان ئێمە و ئەواندا تا ببێتە ڕێگر بۆ ئەوەی ئیتر پێمان نەگەن﴿٩٤﴾ فەرمووی: ئەوەی خوای گەورە پێی بەخشیوم لە توانا و موڵك ئەوە باشترە لە پاداشت و کرێیەك کە بەڵام ئێوە دەدەن بە ئامێرەکانتانەوە بە هێزەوە یارمەتیم بدەن ئەوە لە نێوان ئێوە و ئەواندا بەنداو و سەددێك دروست ئەکەم﴿٩٥﴾ خشتی ئاسنم بۆ بێنن، تا ئەیهێنن و بەرزی ئەکەنەوە لای هەردوو شاخەوە، ئەو کاتە فووی پیا بکەن وەکو کوورە تا ئەبێتە ئاگرو گڕ ئەگرێ، فەرمووی: ئێستا مسی تواوەم بۆ بێنن ئەیکەینە سەریدا، ئەو کاتە زۆر بەهێز ئەبێت، سەددو بەنداو و بەربەستێکی بۆ دروست کردن کە ئیتر نەیانتوانی سەرکەون بەسەریدا ئەوەندە بەرزو لووس بوو﴿٩٦﴾ نەیشیان ئەتوانی لە ژێرەوە کونی بکەن لەبەر بەهێزی و ڕەقی﴿٩٧﴾ (ذو القرنین) فەرمووی: ئەمە ڕەحمەتی خوای گەورەیە، ڕەحمی بە خەڵکی کرد کە چیتر ناتوانن زیانیان پێ بگەیەنن تا کاتێك وەعد و کاتی دیاریکراوی پەروەردگارم دێت، پێش ڕۆژی قیامەت کە (یەئجوج و مەئجوج) دەرچن ئەو کاتە خوای گەورە ئەو سەددە ڕێك ئەکات بەسەر زەوی و ئەیڕوخێنێ، بەڵێنی خوای گەورەش حەقە کە لە پێش قیامەتدا یەئجوج و مەئجوج دەرئەچن﴿٩٨﴾

لە ناو باسی ڕووداوەکانی زولقەرنین باسی گەلێک هاتووە بە ناوی (یأجوج و مأجوج) ئەم گەلەش لە مێژوو تا ئەم ساتە وەختەش، زانایان کۆک نین لەسەری کوێن و چین و چۆنن.

## یەئجوج و مەئجوج

ناوی گەل و هۆزە یان جێگا و شوێنیان یاخود وڵات، هەموو نادیارە.

مرۆڤن؟! هەموو زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە مرۆڤن گوتراوە لە نەوەی ئادەم-ن بە واتا ( بەنی ئادەم) بوون یاخود مرۆڤ بوون.

مادام مرۆڤن کۆمەڵن، کە کۆمەڵیش بن واتا لە جێگایەکدان کە لە جێگایەکیشدا بوون، بە دوای بەرژەوەندی خۆیانەوەن، زۆر زۆریشین واتا هۆزێکی دیاریکراوی چەند ملیۆنی نین، بەڵکو زۆرن لە کۆتایی زەمان یاخود نیشانەی ڕۆژی قیامەتن.

بەڵام لەسەردەمی زولقەرنەینەوە دەرچوون، ئایا هاتنی نیشانەی قیامەت لەسەردەمی پێغەمبەرانی ترەوە دەستی پێکردووە یان ئەم نیشانەیە تەنها لەسەردەمی زولقەرنەیەنەوە دەستی پێکردووە، یاخود دوای ئەوەی سەد و بەربەستی بۆ دروست کردوون زولقەرنەین، لە دوای ئەوەی ئەگەر هاتن ئیتر نیشانەی قیامەتە، هەمووی ئەوەی وتمان دەشێت ڕاست بێت و بە دڵنیاییەوە پێچەوانەکەی دەگونجێت هەمووی هەڵە بێت.

بۆ دۆزینەوەی هەر زانست و مەعریفە و تیۆرێک جا لە هەر بوارێکیدا بێت، پێویستمان بە گریمانە تا بە ئەنجامێک دەگەین.

یەئجوج و مەئجوج لە نیشانەی قیامەتن، گومانی تێدا نییە بە دەقی قورئان و فەرموودەش.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ٩٦﴾الأنبياء

واتە: تا کاتێك کە سەدد و بەنداو و بەربەستەکەی (یەئجوج و مەئجوج) ئەکرێتەوە و ئەیشکێنن، ئەوکاتە ئەوان لە هەموو شوێنە بەرزەکانەوە دەرئەچن بەخێرایی بۆ ئاشوب نانەوە لە زەویدا، کە ئەمە یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی ڕۆژی قیامەت ٩٦[13]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[13] -(لە نەوەی ئادەمن، ژمارەیان یەکجار زۆرە، بە ڕاددەیەك کە بەسەر دەریاچەی (تەبەریە) تێپەڕ دەبن سەرەتاکەیان ئاوی لێدەخوات بۆ کۆتاییەکەیان نامێنێت و وشکی دەکەن، موسڵمانان توانای کوشتاری ئەمانیان نییە و خۆیان لە قەڵاو شوراکاندا قایم دەکەن، ئەمانیش دەڵێن خەڵکی سەر زەویمان کوشت با کوشتاری خەڵکی ئاسمان بکەین تیرەکانیان دەهاوێژن بۆ ئاسمان بە خوێنەوە بۆیان دەگەڕێتەوە، دەڵێن خەڵکی ئاسمانیشمان کوشت، خوای گەورە کرمێکیان بۆ دەنێرێت و بەو کرمە دەیانکوژێت و سەر زەوی بۆگەن دەبێت، پاشان خوای گەورە باڵندە دەنێرێت فڕێیان دەدەنە ناو دەریاوە، پاشان خوای گەورە باران دەبارێنێت و سەر زەوییان لێ پاك دەکاتەوە)/ تەفسیری ڕێبەر، م. صلاح الدين عبدالكريم.

ئەگەر تەماشای ئەو باسەی یەئجوج و مەئجوج بکەین، لە قورئاندا، لە دوو جێگایادا باسکراوە، بە دوایدا باسی قیامەت و وێران بوونی ئەم گەردوون و زەوی، گەڕانەوە و بۆ لای پەروەردگارە.

دووەم جێگا کە خوای گەورە باسی دەکات سورەتی (الكهف)ە لەگەڵ زولقەرنەین دا، خۆ ئەم خەڵکە پێش زولقەرنەین-یش هەر هەبوو، چونکە نە جێگادا دیارە نە کات و نە سەردەم، ئیتر پێوەر ناکرێت بە هۆز و میللەت و عەشیرەتێک. لەوانەیە کەسێک پرسیاری ئەوە بە مێشکیدا بێت بڵێت ئەوە نییە نووسەر ئاماژەی کردووە بە نیشانەی قیامەت کەواتە کاتەکەی دیارە.

لە ڕاستییدا نیشانەی قیامەت کاتی دیاری نییە، ئەو کاتەش کە ئێمە ئێستا بەکاری دەهێنین پێوەر نییە بۆ هەڵسانی قیامەت لای خوای پەروەردگار، خوای موتەعال بە ڕۆژمێری ئێمە کار ناکات، بەڵکو زاتی بەرزی خاوەنی ڕۆژمێری تایبەت بە خۆیەتی پێشتر ئاماژەمان پێداوە.

بۆ نموونە: یەکێک لە نیشانە گەورەکانی قیامەت، هاتنی خودی پێغەمبەری خوایە ﷺ، نیشانەی گەورە زۆرن زۆربەشیان ڕوویان داوە.

لەوانەیە خوێنەر پرسیاری ئەوە بکات، بڵێت ئەی نیشانەی گەورەکەی قیامەت، هەر ئەوانە گەورە نین مەگەر؟!

لە وەڵامدا دەڵێین نەخێر، ئەوانە دە کۆتا نیشانە گەورەکەن کە وەکو پەتی پچڕاوی تەزبیح و ملوانەکە بە دوای یەکدا دێن و کات لە نێوانیاندا زۆر کەمە، ئەو دە نیشانە بەشێکە لە نیشانە گەورەکان.

هەرچەندە نیشانەی گەورە و بچووک پێوەری ئێمەیە، نازانین گەورە و بچووک چییە؟!

کەواتە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ کە جەنابیان نیشانەی قیامەت بن، هەر بە دەمی موبارەکی خۆشی باسی شکاندنی بەربەستی یەئجوج و مەئجوج دەکات، دەفەرموێت: ئەمڕۆ بەربەست و سەددی یەئجوج و مەئجوج شکاو ڕووخا، ئەی خاک بەسەر عەرەب لێرەدا مەبەست لە عەرەب لە گشتی خەڵکییە.[14]

بە دەقی فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەر ﷺ بەربەستەکە شکاوە، کەواتە ئەوانیش هاتوون. پرسیار ئەوەیە ئەی کێن؟!

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

14- عن أم حبيبة بن أبي سفيان عن زينب بنت جحش، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم: دخل عليها يوما فزعا يقول: لا إله إلا الله، ويل للعرب من شر قد اقترب: فتح اليوم من ردم يأجوج ومأجوج مثل هذا؛ وحلق بين إصبعيه، وحلق بأصبعيه الإبهام والتي تليها، فقلت: يا رسول الله، أنهلك وفينا الصالحون؟ قال: نعم، إذا كثر الخبث/البخاري و مسلم

زانایان زۆربەیان لەو بیروباوەڕەدان کە ( تەتار و مەغۆل) بووبێتن و کۆتاییان پێهاتبێت، چونکە بۆ ماوەی پەنجا ساڵ گەورەترین فیتنە بوون، زیاد لە سێ ملیۆن موسڵمانیان کوشت لە منداڵ، ژن، پیر و لاو.

کۆمەڵێک لە زانایانی تر دەڵێن: وشەی (یأجوج و مأجوج) دوو لێکدراوی عەجەمین، واتا عەرەبی نییە! پاشان کە کراوە بە عەرەبی بە واتای خۆشکەری ئاگر و بڵێسەکەی، یاخود بە واتای خستنە ناو ئاگر و بەگوڕوتین کردنی ئاگر، زۆر مانای تری لێکدراوەی بۆ کراوە.

کەواتە هەر گەلێک خوانەناس بوو ئامانجی نەبوو بۆ بیر و باوەڕێک تەنها بۆ خۆراک و بەرژەوەندی و خۆشی خەڵکی کوشت، ئەوە یەئجوج و مەئجوج لە دنیای سەرمایەداری ئەمڕۆدا، بەردەوام یەئجوج و مەئجوج خەریکی فەساد و بەرژەوەندی خۆیانن بێ بیروباوەڕن، تەنها بۆ تێرکردنی حەزەکانیانن، چونکە زانایان دەڵێن هەر کەس گەندەڵ و فاسد بوو ئەوە لەو میللەتەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾﴾الكهف

واتە: تا گەیشتە نێوان دوو سەدد و بەنداو کە دوو شاخ بوو کەلێنێك لە نێوانیاندا بووە (یەئجوج و مەئجوج) لەوێوە دەرچوون بۆ وڵاتی تورك و ئاشوبیان ناوەتەوە، ئەوتری: لە لای (ئەرمینیاو ئازربایجان) بووە لای ئەو دوو سەددە قەومێکی بینی لە قسەی غەیری خۆیان تێ نەئەگەیەشتن، زمانێکی تایبەتیان هەبووە﴿٩٣﴾

سەدد و بەربەست زۆر دروست کراوە لە ژیان، دیواری چین، یاخود دیواری تیبت، هەموو بەربەست و سەدە دژی خراپەکاران دروستیان کردووە، هەر بەربەستێک کە دژیان بکرێت لە هەموو گەندەڵ و خراپەکارەکانیدا، ئەو بەربەستە ئەوەیە کە چیتر نەتوانێت زیاتر بۆ خراپەکاری هەنگاو هەڵبنێتەوە.

سەید قوطب لە تەفسیری سەددی زولقەرنین دەڵێت: کەسێک بە ناوی ( کلافیجو) مێژوونووسێکی ئیسپانییە، چووە وڵاتی سەمەرقەند لە هندستان، واتا سەر بەو وڵاتە لە ساڵی (١٤٠٣) سەدێکیان دۆزیوەتەوە کە لە ئاسن دروست کراوە دەڵێت: دەشێت ئەو سەدە بێت دژی گەندەڵکاران سەنگەریان لەسەر لێدابێت تا دوژمن نەتوانێت تێپەڕێت، یاخود دەڵێت لە سەددەی پازدەی زاینی زانای ئەڵمانی (سیلد برجی) لە شاری ( ترمز) سەددێکیان دۆزیوەتەوە دەرگاکەی هەموو ئاسن بووە، کەواتە زۆری وەکو زولقەرنین سەدیان دروست کردووە دژی فاسدەکان کە ناسراون بە یەئجوج و مەئجوج.

پوختەی وتەم:

نووسەر- پێی وایە کە یەئجوج و مەئجوج گەلێکی دیاری کراو لە جێگایەکی دیاری کراودا بێت، بەڵکو لە جێگایەکدا هەر کەس و هەر گەلێک خراپە و فەساد بکات ئەوە دەچێتە خانەی یەئجوج و مەئجوج.

دەشێت بە شێوەیەکی تریش نیشانەی بکەین، ئەوەی کە خراپەکاری دەکات لە ڕۆژئاوا ناسراوە بە ڕۆم لە کۆن و ئەمڕۆی ڕۆژئاوا، بەڵام ڕۆژهەڵاتیش کە چین و ژاپۆن و تایلەند و وڵاتانی تری خوا نەناسن، کە دەشێت چۆن ڕۆم بۆ ڕۆژئاوا بەکارهاتووە، یەئجوج و مەئجوج-یش بۆ چین و مەنگۆلیا و ژاپۆن...هتد، بەکار بهێنین کە بە ڕاستی خراپەکارو فاسد و بەدڕەوشتن لە هەموو ڕووەکانەوە، بە تایبەت بوزی و ناوچەی بۆرما و دەلایلامەکان...هتد.

لە کۆتاییدا ئەمانەی کە باسمان کرد هەموو گریمانی ئەقڵانی بوو لەسەر بنەمای دەقەکان، دەشێت ڕاست بێت و بە پێچەوانەشەوە هەڵەش بێت، خوای گەورە لێمان خۆش بێت لە هەموو هەڵە و تاوانێک ( والله أعلم).



## گەڕانەوە بۆ ناو ڕووداوەکانی مێژوو

لە دوای مردنی ئەسکەندەر لە هەموو جێگاکاندا شۆڕش و پادشای تایفی هەریەکە بەشێکی بۆخۆی دەبرد، جا لە ئێران لە وڵاتی پارسیا چەندین خانەوادە دەستیان گرت بەسەر ئەو خاکەدا لە ( ئەخمینەکان و کیانیەکان، ئەشکانیەکان تا دەگاتە ساسانیەکان).

لە وڵاتی میسر بە هەمان شێوە قۆناغی کۆتای فیرعەونی دەستی پێکردووە، لە یەمەن و ناوچەی نیوە دوورگەی عەرەبی بە هەمان شێوە هۆزی توبەع لە وێوە سەرچاوەی گرتووە، قۆناغی دوای خوا ناسیانە لەگەڵ بانگەوازی گەلی ئیسرائیل دا نەمان خۆیان سەربەخۆ بوون و زۆر بە دەسەڵات بوون، پێیان دەوترا پادشاکانی حومەیری (الحميرية) پایتەختیان مەئرەب بوو دەوڵەتی سەبەئی کۆن، بەڵام گۆڕا بۆ ناوی پادشاکانی حومەیری بوو دوایی گۆڕا بۆ ( توببەع) چونکە خەڵکێکی زۆر شوێنیان کەوت، ڕێزیان زۆر لا بوو ئەوان یەکەم کەس بوون کە کەعبەیان بە پەردە داپۆشی، واتا پێشتر هەر بەرد بوو هەڵچنرا بوو، یەکەم پادشایان بە ناوی ( حەسانی کوڕی ئەسعەدی کوڕی ئەبی کەڕەب، کە دەڵێن لە سەردەمی سەدەی ( ١٠)ی پێش میلاد ژیاوە، دەسەڵاتی لە یەمەنەوە بۆ شام بووە، لە شامەوە تا سەمەرقەندی لەبەر دەستدابووە.

خوای گەورە لە قورئاندا دوو جار باسی ئەم گەلەی کردووە و دەفەرموێت: ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ وَقَوۡمُ تُبَّعٖۚ كُلّٞ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ١٤﴾ ق

واتە: هاوەڵانی دارەکە قەومی (توببەع)یش کە لە یەمەن بوونە، هەر هەموو ئەمانە پێغەمبەرانی خۆیان بەدرۆ زانیوە، بۆیە هەڕەشە و سزای خوای گەورە جێبەجێ بوو بەسەریاندا، بۆیە با کافرانی قوڕەیشیش ئاگادار بن ئەگەر ئیمان نەهێنن خوای گەورە توانای هەیە ئەمانیش وەکو ئەو نەتەوانەی تر لەناو بدات ١٤[15]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[15] -هاوەڵانی دارەکە کە لە کەناری دەریا بوون تا (مەدیەن)، کە خوای گەورە شوعەیب پێغەمبەری (عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ) بۆ ناردن ئەوانیش شوعەیبیان بەدرۆ زانی، (توببەع) کێ بووە؟ قەومی (توببەع)یش کە لە یەمەن بوونە، بە پاشای یەمەن دەوترا : (توببەع)، هەروەکو بە پاشای فارس وتراوە: (کیسرا)، بە پاشای ڕۆم وتراوە: (قەیصەر)، بە پاشای کافری میصر وتراوە: (فیرعەون)، بە پاشای حەبەشە وتراوە: (نەجاشی)، (توببەع) ناوی (اسعد بن أبو كريب) بووە، پاشایەکی یەمەن بووە و سێ سەد و بیست و شەش ساڵ پاشایان بووە، لەناویاندا کەس لەم تەمەنی گەورەتر نەبووە، سەرباز و سوپای یەکجار زۆری هەبووە، دەسەڵاتی گەیشتۆتە (سەمەرقەند و حیرە و دیمەشق)، هاتۆتە مەدینە ویستویەتی کوشتاری خەڵکەکەی بکات دوو زانای جولەکە وتویانە ئەمە شاری کۆچکردنی کۆتا پێغەمبەرە، پاشان موسڵمان بووە و چۆتە سەر دینی موسا (عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ) ڕۆیشتووە بۆ مەککە و لەگەڵ خۆی بردوونی، ویستۆتی کەعبە بڕوخێنێت، دوو زاناکە نەیانهێشتوە و وتویانە ئیبراهیم پێغەمبەرعَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ دروستی کردووە و لەسەر دەستی کۆتا پێغەمبەر پلەوپایەی بەرزی دەبێت، ئەویش بەگەورەی زانیوە و تەواف بەدەوردا کردووە و
<===

زۆرێک لە ڕاڤەکاران دەڵێن خاوەنی پێغەمبەر بوون، یان دەڵێن شوێن کەوتوی پێغەمبەران بوون.

## دروست بوونی شارستانیی ڕۆم

ڕۆم میراتگری ئیغریقە لە دوای ژیار و شارستانیەتی ئیغریق کە لە دوای ئەسکەندەرەوە بوو پادشای تایفەگەران، ڕۆم توانی ئەو شارستانیەتە لە یۆنانەوە بگوازێتەوە بۆ ئیتاڵیای ئەمڕۆ، ڕۆم زۆر سوودی بینی لە ئایینی یەهودی بەتایبەت دە وەسیەتەکەی (موسا) کە ناسراوە بە ( الوصایا العشرة).

هەر چۆن یاسا و ڕێسای ڕەوشتیان لە یەهود وەرگرت، پاشان زۆر بە زوویی توانیان زانستەکانی یۆنان.بۆ خۆیان بەرن و گرنگی زیاتر پێبدەن و پەرەی پێبدەن تا توانیان بە هێزی جێرمەن کە هێزێکی دڕەندەی زۆر شەڕەنگیز بوون، واتا ژیاری ڕۆم لە سێ کوچکەی زانستی یۆنان و هێزی سەربازی جێرمەن و ئایینی جوولەکە ئەو شارستانییەتە پێک بهێنن.

توانی زۆرێک لە ناوچەکانی ئاسیای بچووک، شام، فەڵەستین و زۆرێک لە وڵاتانی ئەفەریقی وەکو میسر و تونس...هتد، بخاتە ژێر ڕکێفی هێزیکی نوێ، لە ڕووی سەربازییەوە زۆر بەهێزە لە ڕووی زانستەوە ئەو سەردەمە نموونە بووە، لە ڕووی ئیدارە و دەوڵەت و هێزی سەربازیش نمونە بووە، ماوەی (١٠٠٠) ساڵ حوکمڕانی کردووە، بەڵام بوون بە دوو ئیمپراتۆر کە ناسراون ( بەڕۆمی شەرقی و ڕۆمی غەربی).

ڕۆمەکانی ڕۆژهەڵات پایتەختیان سەرەتا شاری قەیسەر بووە لە تورکیا، شاری قوستەنتەنیە دروست دەکات، ڕۆمەکانی ڕۆژئاوا پایتەختیان ڕۆما بووە، هەرچەندە ماوە ماوەش جەنگیان کردووە، ڕۆمی ڕۆژئاوا ڕۆژهەڵاتی خستۆتە بن ڕکێفی، بەڵام هەرگیز ڕۆمی ڕۆژهەڵات نەیتوانیوە ڕۆمی ڕۆژئاوا بخاتە ژێر قەڵەمڕەوی خۆی، بە هۆکاری ئەم جەنگانەی نێوانی خۆیان و زۆری دوژمنەکانیان ئیمپراتۆریەتی ڕۆم زۆرجار لە جێگاکاندا زۆر توند بووە و دیکتاتۆر بووە خەڵکی زۆر دەچەوساندەوە، بە تایبەت لە ناوچەکانی شام و فەڵەستین. بە هۆکاری ئەوەی گەلی ئیسرائیل داوای فەرمانڕەوای دەکرد، چەند جار شۆڕش ڕوویدا لە نێوانی ئەو گەلەدا لە کۆتاییدا

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

پەردەی لە ئاوریشم بۆ کردووە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ یەمەن و خەڵکی هەموویان موسڵمان بوونە و چوونەتە سەر دینی موسا پێغەمبە عَلَيۡهِٱلسَّلَامُ ، پێش ناردنی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ بە حەوت سەد ساڵ کۆچی دوایی کردووە، بە شیعر وتویەتی: ئەگەر بگەم بە کۆتا پێغەمبەر شوێنی دەکەوم و بەرگری لێدەکەم، پێغەمبەری خواعَلَيۡهِٱلسَّلَامُ دەفەرموێت: (جوێن بە توببەع مەدەن چونکە موسڵمان بووە) بەڵام لە پاش مردنی (توببەع) قەومەکەی گەڕاونەتەوە بۆ سەر بت پەرستی و خوای گەورە لەناوی بردوون، هەر هەموو ئەمانە پێغەمبەرانی خۆیان بەدرۆ زانیوە بۆیە هەڕەشەو سزای خوای گەورە جێبەجێ بوو بەسەریاندا، بۆیە با کافرانی قوڕەیشیش ئاگادار بن ئەگەر ئیمان نەهێنن خوای گەورە توانای هەیە ئەمانیش وەکو ئەو نەتەوانەی تر لەناو بدات./تەفسیری ڕێبەر

هەموو شۆڕشەکانی دامرکاندەوە لەسەر بنەمای ئەوەی کە پادشا لە ڕۆم بێت و حوکم یاسای دەسەڵاتی پیاوانی ئایینی ئازاد بێت، دیارە گەلی جوولەکەش بەمە ڕازیی بوون، هاوشێوەی ( حوکمی زاتی) بوو بە زمانی ئەمڕۆ واتا ( ئۆتۆنۆمی) حوکمێکی نیمچە بەڕێوەبردن، ئەویش تەنها پیاوانی ئایینی یەهود ئەو دەسەڵاتەیان هەبوو، ئەمەش بووە هۆکاری چەوساندنەوەی خەڵکی ناوچەکە، چونکە باج (زەڕیبە) لە نێوانی سێ چین دا دابەش دەکرا، چینی قەیسەرەکان کەپیاو مەعقول و دەسەڵاتدار و سیاسییەکانی ڕۆم بووە، چینی دووەم پیاوانی سەربازی و خودی سەربازەکان بوون، چینی سێیەم پیاوانی یەهودو کڵێسەکانیان، ئەمەش وای کرد خەڵکی زۆر ماندو، و ناڕازی بوون لەو دەسەڵاتە.

پادشاکانی ڕۆم زۆرن، ناوی هەندێکیان یاداشت دەکەین لەوانەی کە زۆر دەسەڵاتدار و خراپەکاربوون:

( ڕێمۆلوس، نومابە ملییۆس، تۆلس هوستیل بیۆس، ئانکوس مارکیوس، لوسیوس، تەرکول بینیوز، برس کوس، سیریوس تۆلبوس، لوسیوس٢، تەرکول بینیوز٢، سوپەر بووز...هتد) پاشان بە هۆکاری خراپی ئەم سێ چینە کە قەیسەر و سەرباز و جوولەکەکان بوو، خوای گەورە پێغەمبەری نارد بۆ ئەو سەردەمە، پێغەمبەرەکانیش بریتیبوون لە زەکەریا، یەحیا و (عیسا) کوڕی مەریەم.

## مەملەکەتی حەڤدەیەم:
## ڕووداوی ژیانی پێغەمبەران زەکەریا، یەحیا و بنەماڵەی عیمران سەلامی خوایان لێ بێت

لە ڕابردوودا ئاماژەمان دا بەوەی خاکی شام بە گشتی و قودس لەلایەن ڕۆمەکانەوە داگیر کرابوو، لەگەڵ ئەو داگیرکارییەدا بەشێکی زۆر لە گروپەکانی یەهود هاوکاری ڕۆمەکان بوون، بەڵام لە ناویاندا وەکو کۆمەڵەی فەرسیونەکان کە دنیدارترین کەسی ناو یەهود بوون نا ڕازی بوون لەوانە ڕەوشە، هەروەها چەند بنەماڵەیەکی خواناس و دیندار بوون لەوانە خانەوادەی (عیمران) پیاوێکی خواناس و خاوەنی نوێژی گەلی جولەکە بوو، خۆشی لە وەچەی پێغەمبەران بوو، بەڵام پێغەمبەر نەبووە لە نەوەی حەزرەتی (سولەیمان) و (داوود) بووە.

واتا نەسەبی (عیمران کوڕی یاشم کوڕی ئامون کوڕی مەنشا کوڕی حزقیا کوڕی ئەزحیق کوڕی یوثم کوڕی عەزاریا کوڕی ئەمصیا کوڕی یاوش کوڕی ئەحزیهو کوڕی یارم کوڕی یەهفاشط کوڕی ئەسابیر کوڕی ئەبیا کوڕی ڕەحبەعم کوڕی (سولەیمان) کوڕی (داوود) کوڕی ئیشا)یە.

عیمران لە ناو گەلی ئیسرائیل دا زۆر ڕێز لێگیراو بووە، لە ناو گەلی ئیسرائیل دا خوای گەورە پێغەمبەرێکی نارد کە پێشتر لە ناو گەلی ئیسرائیل دا بە زانا و کەسێکی خواناس ناسرابوو، زۆرخۆشەویست بوو لە خواناسەکانی ناو هەیکەلی یەهودا، یان پیاوانی یەهوزای ئیسرائیل.

ئەوکەسەش حەزرەتی زەکەریایە (٧) جار ناوی لە قورئاندا هاتووە، ڕاستە گەلی ئیسرائیل لەو سەردەمەدا بتیان نە دەپەرست، بەڵام هەرچی کاری خراپە بوو دەیانکرد، زۆرێک لە زاناکانی گەلی ئیسرائیل دینیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاردەهێنا و گۆڕانکاری تەواویان کردبوو لە ئایینەکەدا هەڵبەت لە ڕووی دەق نا، بەڵکو لە ڕووی جێبەجێکردنەوە. بە ئارەزوی خۆیان حەرامیان حەڵاڵ دەکرد و بە پێچەوانەشەوە حەڵاڵیان حەرام دەکرد.

تەنانەت لە ناو گەلی ئیسرائیلدا زانا خراپەکانیان یەکیان گرتبوو، دژایەتی خەڵکی باش و خواناس و زاناکانیان دەکرد کە فەرمانیان بە چاکە دەکرد و ڕێگریان لە خراپە دەکرد، خوای گەورە لە ناوخۆیاندا حەزرەتی زەکەریای بۆ ناردن کە زۆرباش دەیاناسی و دەیانزانی نەسەب و بنەڕەتی باش شارەزابوون، پێشتر ڕقیان بوو لە حەزرەتی زەکەریا، چونکە لە زانا و خەڵکە باشەکە بوو.

لە دوای پێغەمبەرایەتی و بانگەواز کردن، بەڵام هیچ چارەسەری نەبوو ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو خراپەکاری دەڕۆیشتن، دڵنیابوون لەوەی کە پێغەمبەرە بەڵام گوێیان بۆ نەدەگرت.

نەسەبی حەزرەتی زەکەریا کوڕی بەرقیا کوڕی دان کوڕی موسلم کوڕی صەدوق کوڕی حەشبان کوڕی (داوود) کوڕی (سولەیمان) کوڕی بەرخیا کوڕی بەلعاطە کوڕی ناقور کوڕی شەلوم کوڕی یەصفاشاط کوڕی ئەینام کوڕی ڕەحیمام کوڕی (سولەیمان) کوڕی (داوود).

هەرچی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە بانگەوازی دەکردن بۆ دینی خوا و گەڕانەوەیان، بەڵام چارەی نەبوو زیاتر و زیاتر هاوکاری ڕۆم بوون، بە یاسای طاغوتی ڕۆم ڕازی بوون، پیادەی ئەحکام و یاسا و ڕێساکانی تەورات و پێغەمبەرانی گەلەکەیان نەدەکرد.

عیمران خوشکی ژنەکەی خۆی دایە زەکەریا بە ناوی ( ئەلیصابات) یان ( ئەشیاع) پێشتر لە مەعبەدی جولەکەکاندا خەریکی کۆکردنەوەی وەسێتەکانی خوای پەروەردگار و پاشان پێغەمبەران بوو، لەگەڵ خێزانی عیمران لە کیتابی پیرۆز ناوی (ئەلیصابات)ە ئەم ئافرەتە منداڵی نەدەبوو، واتا ئەلیصابات نەزۆک بوو خێزانی عیمران دوعای کرد کە خوای گەورە منداڵێکی پێببەخشێت بۆ ڕزگارکردنی خاکی قودس، ئەم ئافرەتە بەڕێزە خواناسە کە خوای گەورە هەڵیبژاردوون ناوی ( حنەی کچی فاقوذی قبیل)ە، خوای گەورە بنەماڵەی عیمرانی لە هەڵبژاردووەکان هەژماکردووە لەبەرئەوەی زەکەریا و (عیسا)ی کوڕی مەریەم خودی مەریەمیش لەو خانەوادەیە بوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَ(نوح)ا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ۝٣٣ ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ۝٣٤﴾ آل عمران

واتە: بە دڵنیایی خوای گەورە ئادەم و (نوح) و ئالی ئیبراهیم خۆی و نەوەکانی کە پێغەمبەر بوون و ئالی عیمران کە عیسی لەوان بووە، ئەمانەی هەڵبژاردووە بەسەر هەموو جیهاندا۝٣٣ لە نەسەب و ڕەچەڵەکدا ئەمانە کۆمەڵێکن هەندێکیان لە هەندێکی تریانن تەنانەت لە نیەت و کردەوەو ئیخلاص و تەوحیدیشدا پێغەمبەران هەموویان یەك بوون، خوای گەورە زۆر بیسەرو زانایە۝٣٤

لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئوممەتی پێغەمبەری خوا محمد ﷺ لە قورئاندا سورەتێک بە ناوی ئەم بنەماڵەوە ناونراوە (آل عمران)

زەکەریاش خزمایەتی لەگەڵ ئەم بنەماڵەیەدا بوو کە خۆی پێغەمبەرە و خوای گەورەش لەگەڵ ئالی عیمراندا کردوونیەتە خزم و نەسەب کە عیمران و زەکەریا خاوەنی یەک باپیرن ئەویش (داوود) و (سولەیمان)ە سەلامی خوا لە هەموویان بێت، چالاکی عیمران و حەزرەتی زەکەریا بەشی گەلی ئیسرائیلی نەدەکرد و زۆر ماندوو بوو بوون، کاتێک کە خوای گەورە

منداڵێکی بەخشی بە حنیە کچی فاقوذ، ئەو خاتوونە بەڕێزە (خێزانی عیمران) فەرمووی خوایە ئەوا نەزرم کرد کە بۆ ئازادی گەلی ئیسرائیل لە دایک بێت وشەی ( محررا) ڕێک ئەو واتایە دەگەیەنێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾﴾ آل عمران

واتە: کاتێك کە خێزانەکەی عیمران کە ناوی (حەنە) بووە دایکی مەریەم کە نەنکی عیسی (عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) بوو فەرمووی: ئەی پەروەردگار من ئەو کۆرپەیەی لەناو سکمدایە کە مەریەم بوو نەزرم کردووە بۆ عیبادەتی تۆ و ئازاد بێت بۆ ئەوەی خزمەتی (بیت المقدس) بکات، ئەی پەروەردگار ئەو نەزرەم لێ قبووڵ بکە هەر تۆ بە دڵنیایی زۆر بیسەر و زانای﴿٣٥﴾

خوای گەورە کچێکی بەخشیە حنیەی ژنی عیمران، ئەو چاوەڕێی کوڕ بوو، بۆ ئازادی خاکی قودس لە دایک بێت، دەیویست ببێتە سەرکردە و کەسێکی سوارچاکی گەلی ئیسرائیل، بەڵام وا دەرنەچوو کچ بوو، ئەوەی کە بە کوڕ دەکرێت لە بواری شۆڕش و کاری شمشێربازی و سوارچاکی بە ئافرەت ناکرێت، تەنانەت خودی بانگەوازیش ئافرەت توانای نییە بڕواتە ناو کۆمەڵێک پیاو بانگەواز بکات.

خوای گەوە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ۖ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴿٣٦﴾﴾ آل عمران

واتە: کاتێك کە منداڵەکەی بوو بینی منداڵەکەی کچە وتی: ئەی پەروەردگار ئەمە کچە، خەفەتی لێ خوارد، کە ئەمەیان فەرموودەی خوای گەورەیە کە خوای گەورە، خۆی باشتر ئەزانێ چی بووە واتە: بۆ بەگەورەزانینی مەریەمە کە مەریەم کچێکی یەکجار گەورەیە، دایکی مەریەم وتی: ئەی پەروەردگار کوڕ وەکو کچ نییە، واتە: کچ ناتوانێ خزمەتی مزگەوت بکات، من ناوم ناوە بە مەریەم، من پەنای خۆی و نەوەکانیشی ئەگرم بە تۆ لە شەیتانی نەفرین لێکراو و ڕەجم کراو، خوایە خۆی و نەوەکانی بپارێزە، خوای گەورە دوعاکەی قبووڵ کرد ﴿٣٦﴾

خوای پەروەردگار نەزرەکەی لێوەرگرت و بە باشی، ئەوە پێوانەی ئێمەی مرۆڤە جیاوازی لە نێوان توانای پیاو ئافرەتدا دەکەین، بەڵام خوای گەورە قەدەری وایە ویستی وایە، دەبێت ببێت و لە خەیاڵی مرۆڤدا دروست نابێت، کەواتە ئەوەی خوای گەورە بییەوێت بە ڕەهایی ڕوو ئەدات.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّاۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗاۖ قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾﴾آل عمران

واتە: خوای گەورە نەزرەکەی لێ قبووڵ کرد بەجوانی پەروەردەی کرد، زەکەریاش (عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ) مەریەمی گرتە ئەستۆی خۆی و سەرپەرشتی کرد، هەر کاتێك زەکەریا (عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ) ئەچووە لای میحرابەکە، شوێنی عیبادەتەکەی مەریەم ئەیبینی هەندێ خۆراکی لایە کە لە زستاندا میوەی هاوینی لایە، لە هاویندا خۆراك و میوەی زستانی لایە، زەکەریا (عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ) پێی سەیر بوو فەرمووی: ئەی مەریەم، ئەم میوانەت لە کوێ بوو؟ فەرمووی: ئەمە لەلایەن خوای گەورەیە خوای گەورە، وەکو کەرامەت و ڕێزێك پێی ئەبەخشی، بە دڵنیایی خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی هەر کەسێك ئەدات کە ویستی لێ بێت بەبێ حیساب.

ئەم کچە بەڕێزە کە ناونراوە بە (مریم)، بە زمانەکانی تر (ماریا) بە واتای ئافرەتێکی خواناس دێت واتا (العابدة) وشەی (العابد) بۆ نێرینە بەکاردێت وشەی (العابدة) واتا مەریم بە زمانی عیبرانی، وەک ناوی بەندەی خوایە لە زمانی کوردیدا.

ئەم ئافرەتە کە تەمەنی بەرەو باڵغی ڕۆیشت دەبوو بیکاتە خزمەتکاری هەیکەل، بە گشتی لەناو جوولەکەدا ئافرەت کائینێکی شەڕەنگێزە و پێیان وایە هەموو شەڕێک لە ئافرەتەوە سەرچاوەی گرتووە، هەر بەو هۆکارەش نابێت ئافرەت بڕواتە جێگا پیرۆزەکانیان، کاتێک کەسوکاری بردیان لە ناو هەیکەل خزمەت بکات و بێتە عابیدە و خەریکی خواناسی بێت، جوولەکەکان داوای شتێکیان کرد، کە هەموو زانایانەی خاوەنی قەڵەمی نوسینەوەی تەورات و تیلموتن، ئەوا قەڵەمەکان فڕێ ئەدەنە ناو ئاوەکانیان و نغرۆ بێت لە ئاوەکە ئەوا ئەو کەسەی دەگرێتە ئەستۆی خۆی بۆ ئەوەی یان ئەو زانایە دەیگرێتە ئەستۆی خۆی و چاودێری بکات، ئەمەش لە ڕاستیدا بۆ ئەوە بوو کە کەس نەیگرێتە ئەستۆ و بڵێت توانای وەرگرتنی ئافرەتمان نییە وەکو فێڵێک بوو، بەڵام قەدەری خوای گەورە وابوو قەڵەمەکەی زەکەریا نغرۆ بوو، حاخامەکان بەمەش ڕازی نەبوون، داوایان کرد کە قەڵەمەکان فڕێ بدەنە ناو چەمێک کە خوڕ بێت، تا قەڵەمێک لە قەڵەمەکان بە پێچەوانەی قەڵەمەکانی ترەوە ڕۆیشتن ئەوا ئەو کەسە با کەفالەتی بکات، هەموو ئەم بیانوو هەنجەتانە بۆ قبوڵنەکردنی مەریەم بوو، بەڵام ویستی خوای گەورە وابوو، قەڵەمی زەکەریا بە پێچەوانەی ئەوان دەڕۆیشت، لە کۆتاییدا کەس توانای دەمەدەمێ و گفتوگۆیان نەما ئەمە دیوێکی ڕووداوەکەیە.

دیوێکی تری ڕووداوەکە، گوایە لەبەر ئەوەی کچی عیمران-ە و خاوەنی نوێژی گەلی ئیسرائیلە[16]

لە خۆشەویستی عیمران و پیرۆزی ئەو بنەماڵە هەموو داوایان دەکرد کە مەریەم بگرنە ئەستۆ، زانست و زانیاری ئاینی فێربکەن و تەورات و شەریعەتی گەلی ئیسرائیلی فێر بکەن، قەدەری خوای گەورە ئەوەیە کە زەکەریای پێغەمبەر بیگرێتە ئەستۆی خۆی، دیسان هەر ئەو کەفالەتی هەڵبژێرا.

خوای گەورە ڕووداوەکەمان لە قورئاندا بۆ باس دەکات دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۚ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَـٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ۝٤٤﴾ آل عمران

واتە: ئەمەی کە باسمان کرد ئەی محمد ﷺ هەندێك لە هەواڵەکانی غەیب بوو بە وەحی بۆ تۆمان نارد، تۆ لەلای ئەوان نەبووی کاتێك کە قەڵەمەکانیان هەڵدایە ناو ئاوەوە وەکو تیروپشکێك بۆ ئەوەی کە کامیان مەریەم بگرنە لای خۆیان و سەرپەرشتی بکەن وتیان: ئەگەر هاتوو قەڵەمی هەر کەسێك ڕاوەستا و لەگەڵ ئاوەکەدا نەڕۆی ئەوا سەرپەرشتی مەریەم ئەکات، قەڵەمەکەی زەکەریا عَلَيْهِ السَّلَام ڕاوەستا و تیروپشکەکە بۆ ئەو دەرچوو سەرپەرشتی مەریەمی کرد، کاتێك کە مشتومڕیان بوو لەسەر ئەو شتە تۆ لەلای ئەوان نەبووی خوای گەورەیە کە بۆ تۆی ئەگێڕێتەوە۝٤٤

کەواتە مەریم لەبەردەست پێغەمبەرێکدا پەروەردە بووە کە حەزرەتی زەکەریا فێری زانستی ئاینی دەکرد، هەرکات بڕۆشتایە بۆلای ئەگەر هاوین بوایە میوەی زستانەی لابوو، یان ئەگەر زستان بوایە میوەی هاوینە لا بووە، حەزرەتی زەکەریا کە چەند جار ئەوە دەبینێت، زۆر سەرسام دەبێت وەکو لە ڕابردوودا ئاماژەمان پێدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَـٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَـٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ۝٣٧﴾ آل عمران

واتە: خوای گەورە نەزرەکەی لێ قبوڵ کرد بەجوانی پەروەردەی کرد و زەکەریاش عَلَيْهِ السَّلَام مەریەم-ی گرتە ئەستۆی خۆی و سەرپەرشتی کرد، هەر کاتێك زەکەریا عَلَيْهِ السَّلَام ئەچووە لای میحرابەکە شوێنی عیبادەتەکەی مەریەم-ی، ئەیبینی هەندێ خۆراکی لایە کە لە زستاندا میوەی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[16] نووسەر: هەرچەندە تێنەگەیشتم لەوەی کە دەڵێن خاوەنی نوێژی گەلی ئیسرائیلە، بەڵام لە زۆرێک لە مێژووەکاندا واهاتووە بۆیە ناچار وەکو خۆی باسم کردوە.

هاوینی لایە، لە هاویندا خۆراك و میوەی زستانی لایە، زەکەریاعَلَيْهِ السَّلَامُ - پێی سەیر بوو فەرمووی: ئەی مەریەم ئەم میوانەت لە کوێ بوو؟ فەرمووی: ئەمە لەلایەن خوای گەورەیە، خوای گەورە وەکو کەرامەت و ڕێزێك پێی ئەبەخشی بە دڵنیایی خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی هەر کەسێك ئەدات کە ویستی لێ بێت بەبێ حیساب﴿٣٧﴾

ئەمەش زۆر گرنگ بوو بۆ حەزرەتی زەکەریا چونکە تەمەنی پیربوو، خێزانەکەشی نەزۆک بوو پووری مەریم بوو، گەلی ئیسرائیل پێویستی بە چەندین پێغەمبەر و خواناس هەیە تا بیانخاتە سەر ڕێگای ڕاست، بۆیە ئەو ڕزق وڕۆزیە کە خوای گەورە لە کاتی خۆیدا نییە و بەخشیویەتە خاتوو مەریم، زۆر ئاسانە کە منداڵیش ببەخشیت بە حەزرەتی زەکەریا، بۆیە بە گریان و دڵ کەیلی و بە دەنگێکی زۆر نزم بە گەردەن کەچی داوای لە خوای پەروەردگار کرد، خوای گەورە ڕووداوەکەمان بۆ باس دەکات لە قورئاندا: ﴿ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ۝٢ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيّٗا۝٣ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا ۝٤ وَإِنِّي خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا۝٥ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا۝٦﴾ مریم

واتە: ئەمە باسی ڕەحمەتی پەروەردگارتە بۆ بەندە و پێغەمبەری خۆی زەکەریا عَلَيْهِ السَّلَامُ، کە یەکێك بووە لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل، دارتاش بووە﴿٢﴾ کاتێك پاڕایەوە و بانگی لە پەروەردگاری خۆی کرد بە نهێنی، چونکە لای خوای گەورە دوعای نهێنی خۆشەویسترە﴿٣﴾ فەرمووی: ئەی پەروەردگارم من ئێسکەکانم لاواز بووە، سەرم سپی بووە. ئەی پەروەردگار هەرگیز من لە وەڵامدانەوەی دوعا و پاڕانەوەکانم کە لێت ئەپاڕێمەوە نائومێد نەبوومە و هەمیشە وەڵامی منت داوەتەوە﴿٤﴾ من لە خزم و نەوەکانم ئەترسێم لە پاش خۆم کە بمرم ئەوان پشت لە دین بکەن، خێزانەکەیشم نەزۆکە و منداڵی نابێ و تەمەنی زۆر گەورەیە، ئەی پەروەردگار لەلایەن خۆتەوە منداڵێکم پێ ببەخشە﴿٥﴾ تا ببێ بە میراتگری من و میراتگری ئالی یەعقوب لە میراتی زانست و زانیاری و پێغەمبەرایەتی نەك میراتی ماڵ، لەبەر ئەوەی زەکەریا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) خۆی کەسێکی هەژار بووە و دارتاش بووە، پێغەمبەرانیش لەوە گەورەترن کە داوای منداڵ بکەن بۆ ئەوەی کە ببێ بە میراتگری ماڵ و سەروەت و سامانیان، کەس نابێت بە میراتگری پێغەمبەران و ئەوەی بەجێی دەهێڵن دەبێت بە صەدەقە، ئەی پەروەردگار ئەو منالەی کە پێم ئەبەخشی منداڵێك بێ کە خۆت و بەندەکانیش لێی ڕازی بن لە دین و ڕەوشت و ئەخلاقی﴿٦﴾

خوای گەورە کە ڕووداوەکە بۆ پێغەمبەر ﷺ باس دەکات، ئاماژە بۆ ڕەحمەتی خوای دەکات ڕاستەوخۆ، پاشان زەکەریا دوور لەچاوی خەڵک لە جێگایەکی بێ دەنگ کە کەس گوێی لە زەکەریا نییە، هەرچی خەم و خەفەت و سکاڵایەتی دەیباتە بەردەم پەروەردگار بەوپەری ئیخلاس و دڵسۆزیەوە، بێ نێوەندەگیر و واسطە کردن، تەنانەت وەکو عەرەب دەڵێت (ی) بانکردنیشی بەکار نەهێنا، واتا ( ی نداء)، کەسێ بە دەنگی بەرز یان بۆ ئاگادارکردنەوە لە ناو عەرەبدا دەڵێن ( یا فلان)، بەڵکو بەخشی ڕاستەوخۆی لەگەڵ پەروەردگاردایە تەنها بە وشەی (رب) بانگی دەکات کە هەر زۆر نزیکە لێوەی، هەموو سکاڵای خۆی پێڕاگەیاند کە لە تەفسیرەکەدا ئاماژەی پێ کراوە.

لێرەدا کە داوا دەکات هەست زۆر بە نزیکی خوای پەروەردگار دەکات لە ڕەگی پەناگۆی و ملی نزیکترە لە زەکەریا، بۆیە سکاڵایی پیری دەکات، ماندوو شەکەت بووە، ئێسقانەکانی لاشەی هەڵناگرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نائومێد نییە، هەستێکی هەیە کە چارەسەر هەیە، دەشزانێت و دڵنیایە کە خوای گەورە داوای داواکاران ڕەت ناکاتەوە، جا بەهەر جۆرێکە دەیبەخشێت، بە ڕەحم و حیکمەتی.

کێشەکەی زەکەریا لەوە دابوو هەموو داواکانی لە دەرەوەی سنووری یاسایی گەردووندا بوو، خۆی پیر بوو، ژنەکەی نەزۆکە، داوایەکەش دەکات زۆر ئاستمە لە ڕووی یاسای سروشتییەوە، ئەویش منداڵێکە کە بێتە پێغەمبەر جێگرەوەی پێغەمبەرانی ڕابردوو کە لە یەعقوبەوە سەرچاوەیان گرتووە، واتا پێغەمبەرانی ئەسباطەکان، داواش دەکات کە جێگای ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت.

ئەگەر تەماشا بکەین، هاوشێوەی حەزرەتی (عیسا)ی کوڕی مەریەم-ە، ڕاستە (عیسا) باوکی نییە، بەڵام خوای گەورە یەحیای لە نەزۆکی ئافرەتێک چاک کردووە، پیاوێکی پیر و بەساڵاچووش کە توانای ناردنی (تۆوی) نەماوە بۆ جێگایەکی هەڵگری تۆوەکە ڕەحمی دایکە، لێرەدا ئامادەکاری گەلی ئیسرائیلە بۆ تێگەیشتن لە ڕووداوێکی گەورە کە زۆر نزیکە لە ڕووداوی حەزرەتی زەکەریا و ئەشیاع-ی هاوسەری.

خوای پەروەردگار لە چرکە ساتی دوای دوعاکەیدا فەرمووی: ﴿يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا ۝٧﴾ مريم

واتە: خوای گەورە وەڵامی دایەوە ئەی زەکەریا (عَلَيْهِ السَّلَامُ)ئێمە موژدەت پێ دەدەین بە منداڵێك کە ناوی لێ ئەنێین یەحیا، پێش ئەم هیچ کەسێکی ترمان ناو نەناوە بە یەحیا یان هاوشێوەی نەبووە﴿٧﴾

خوای پەروەردگار بانگی زەکەریای کرد بە ڕێگای وەحی بە ڕێگای فریشتەوە، کە هەموو یاسای گەردوون دەوەستێت و تۆ دەبیتە خاوەنی منداڵ، خوای موتەعال ناوی بۆ هەڵبژارد ناوینا ( یەحیا) بە واتای ( ژیانەوە) پاشان ئەوانەی خاوەنی هۆشیارین، تاکە ناوێک کە لەم بوونەدا وجودی نەبووە، (یەحیا)یە واتا پێش لە دایک بوونی (یەحیا) ئەم ناوە نەبووە، موعجیزەکە لێرەوەیە بەس بۆ خاوەن ئەقڵەکان کە ئەوە ببێتە ڕێگای هیدایەتیان مەبەست لەوانەی کە دوورن لە دین.

کەس ناتوانێت بڵێت پێش ناوی (یەحیا) ئەو ناوە بوونی هەبووە.

لە کاتێکدا زۆر ئاسان بووە عەرەب و عەجەم بە کاری بهێنن، چونکە وتەی ڕۆژانەیان بووە، چەندیان لێمردوووە و چەندە لە دایک بووە، وشەی وەرزیان بووە کە هاوین و بەهار زستان و پاییز ژیانەوە لەناوچوون لەبەرچاویاندا بووە، (یەحیا) بە واتای ناوی کەس ( لأسم علم) دەکرێت، بە زمانەکانی تر لە تەرجومەکراوی وجودی هەبوو بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەش وجودی نەبووە هیچ کەس ناتوانێت ناوی یەحیا بهێنێت بە وەرگێڕاوی لە زمانێکی تردا لەهەر سەردەم و کاتێکدا پێش لە دایک بوونی یەحیا!

لە کۆتاییدا هەموو دەستەوسان دەبن و دەڵێن وجودی نەبووە، بۆچی وجودی نەبووە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا ۝٧﴾

ئەوەش ئەگەر مرۆڤ قووڵ بیربکاتەوە گەورەترین موعجیزەی مێژووییە، یەحیا پێنج جار ناوی لە قورئاندا هاتووە.

لەگەڵ ئەوەی خوای پەروەردگار دوعاکەی زەکەریای گیراکرد منداڵی بەخشی، بەڵام زەکەریا دەزانێت پیرە و خێزانی نەزۆکە و موشتاقە بزانێت چۆن و بەچی و هۆکارەکان چین کە ئەم منداڵەی پێ دەبەخشێت، هەروەها چی بکات بۆ ئەوەی خوای گەورە ڕازی بکات بۆ ئەم فەیض و کەرەمە گەورەیەیی موتەعال لەگەڵیدا کردووە، خوای پەروەردگار خاوەنی توانای (کن فیکون) لە ویست و ئیرادەی زاتی پیرۆزیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِي عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ ٱلْكِبَرِ عِتِيًّا ۝٨ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْـًٔا ۝٩ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ۝١٠﴾ مريم

واتە: زەکەریاش (عَلَيْهِ السَّلَام) سەری سوڕما لە توانا و دەسەڵاتی خوای گەورە و وتی: ئەی پەروەردگار من چۆن منداڵم ئەبێ لەو تەمەنە پیرە، خێزانەکەیشم نەزۆکەو بە گەنجی منداڵی نەبووە چۆن لەم تەمەنە منداڵی دەبێت، گەیشتوومەتە ئەوپەڕی تەمەنی پیرێتی۝٨ فریشتەکە فەرمووی: بەڵێ بەم شێوازەیە پەروەردگارت دەفەرمووێت: ئەم شتە لە لای من زۆر سووك و

ئاسانە کە من پێشتر تۆم دروست کردووە لە نەبوونەوە تۆم هێناوەتە بوون و هیچ شتێك نەبوویت، ئێستا لە دایك و باوکێك منالێك دروست بکەم زۆر ئاسانترە﴿٩﴾ زەکەریا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) فەرمووی: ئەی پەروەردگار نیشانەیەکم پێ بدە لەسەر ئەم موژدەیە کە منداڵمان دەبێ تا زیاتر دڵئارام بم، خوای گەورە فەرمووی: نیشانەی تۆ ئەوە بێ کە سێ شەو و سێ ڕۆژ لەسەر یەك ناتوانیت قسە لەگەڵ کەسدا بکەیت، لە کاتێکدا کە تۆ ساغ و سەلیمی لاڵ نیت﴿١٠﴾

کۆتایی ئەو نیعمەتە گەورەیە، بەوە هات لەماوەی سێ ڕۆژ لە بەندایەتی بێت لەناو میحراب، کە یەهود پێ دەڵێن هەیکەل لەو جێگایەدا بمێنێتەوە بۆ عیبادەت و خواپەرستی، لە دوای هاتنە دەرەوەی باس بکات کە خوای گەورە منداڵی بەخشیوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾﴾ مریم

واتە: لە نوێژگەکەی خۆی (لە شوێنی نوێژەکەی) هاتە دەرەوە بۆ ناو قەومەکەی، ئاماژەی بۆ کردن و قسەی لەگەڵدا نەکردن کە (سبحان الله) بکەن لە بەیانیان و ئێواراندا، یاخود نوێژی بەیانی و نوێژی عەصر ئەنجام بدەن﴿١١﴾

پاشان قورئان باسی منداڵی یەحیا و چۆنیەتی گەورەبوونی ناکات، ڕاستەوخۆ بەرەو گەورەبوونی و لاویەتی دەڕوات کە لە تەمەنێکی لاویدا کەسێکی خاوەن عەزم و گەورە خوای گەورە وەسفی یەحیادا دەفەرموێت: ﴿فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴿٣٩﴾﴾ آل عمران

واتە: مەلائیکەت واتە: جبریل بانگی لە زەکەریا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) کرد کاتێك کە ڕاوەستا بوو بەپێوە لە میحرابەکەیدا نوێژی ئەکرد: ئەی زەکەریا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئەوە خوای گەورە موژدەی پێدایت بە منالێك کە ناویشی یەحیا ئەبێت، ئەم منالەی تۆ باوەڕ بە وشەی خوای گەورە ئەکات، واتە: لە دواترا کە (عیسا) عَلَيْهِ السَّلَامُ دێت باوەڕ بە (عیسا) ئەکات ئەم کوڕەی تۆ یەحیا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئەبێ بە کەسێکی گەورە لەزانست و پەرستن و حیکمەت و تەقوا و ڕێزدا، ئەبێ بە پێغەمبەر خۆی ئەپارێزێ لە چوونە لای ئافرەت یان لە تاوان، ئەبێتە پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرە چاکەکان﴿٣٩﴾

ئەم کوڕ و باوکە پیشەیان دارتاش بووە (کان زكريا نجارا) مسلم.

پاشان ڕاستەوخۆ خوای پەروەردگار باسی هەڵگرتنی ئەمانەتی بانگەواز دەکات بۆ حەزرەتی یەحیا، کە ئەرکی گەیاندنی بانگەواز دەکەوێتە سەر شانی و دەبێت سەر لە نوێ ئەحکام و یاسا

و ڕێساکانی ناو تەورات بە خەڵکی بگەیەنێت ئەوانەی کە بەناو زانای گەلی ئیسرائیلن و ئەحکامەکانیان شاردۆتەوە لە کاریان خستووە. ئەم پێغەمبەرە بەهێز و توانا ڕووبەڕوویان بێتەوە ڕاستی و دروستی ئەم ئایینە بگەیەنێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ﴿١٢﴾ وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةٗۖ وَكَانَ تَقِيّٗا ﴿١٣﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا ﴿١٤﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ وَيَوۡمَ يَمُوتُ وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيّٗا ﴿١٥﴾﴾ مريم

واتە: دوای ئەوەی کە یەحیای پێ بەخشی خوای گەورە فەرمووی: ئەی یەحیا ئەو کتابەی کە بۆت دێت، یاخود تەورات بە جددی و هێز و عەزیمەت و کۆششەوە بە جوانی بیگرە، هەر لە منداڵیەوە حیکمەت و دانایی و تێگەیشتن و زانیاری و کۆشش و ڕووکردنە چاکە، یاخود پێغەمبەرایەتیمان پێ بەخشی﴿١٢﴾ ڕەحم و سۆزو بەزەیی، خۆشەویستی و پاکێتیمان پێی بەخشی لە لایەن خۆمانەوە، کەسێکی لە خواترس و خۆپارێز بوو لە تاوان و گوێڕایەڵی خوای گەورە بوو، چاکەکار بوو لەگەڵ دایك و باوکیدا﴿١٣﴾ کەسێك نەبوو کە خۆ بەگەورەزان و سەرپێچیکاری دایك و باوکی یان پەروەردگاری بێت، بەڵکو گوێڕایەڵیان بوو﴿١٤﴾ سەلامی خوای گەورە لەسەر یەحیا بێت لەو ڕۆژەی کە لە دایك بوو، لەو ڕۆژەش کە ئەمرێ، ئەو ڕۆژەش کە زیندووو ئەبێتەوە، یاخود ئەمینە لە شەیتان کە لەدایك دەبێت، ئەمینە لە خوای گەورە کە دەمرێت و زیندووو دەبێتەوە﴿١٥﴾

خوای گەورە هاوکاری بوو لە منداڵیەوە خاوەن سۆز و میهرەبانی و یاریدەدەری حوکمی خوا و دڵ و دەروونی خۆی بووە.

بانگەوازی کوڕ و باوک بەردەوام بوو یەحیا کوڕێکی جوانخاسی ناو گەلی ئیسرائیل بوو، لە ناو خەڵکیدا خۆشەویست بوو، چەند جار خوشکی پادشای قودس کە یەکێک بوو لە پادشاکانی ڕۆم کە لە لایەن قەیسەری ڕۆمەوە دانرابوو بە ناوی (هێردۆس)، ناوی ئەم پادشایە لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە، بەڵام زانایانی ئیسلام ڕایەکی تریان هەیە کە بە هۆکاری بەرخودان و شۆڕشی زۆری لاوەکانی ئەم پادشایە ئافرەتێکی داوێن پیس بووە، حەزی لە حەزرەتی یەحیا کردووە، حەزرەتی یەحیاش وازی لێهێناوە ئەگەرچی چەند جار ویستویەتی کە بیکاتە هاوسەری خۆی، دەڵێن هۆکاری شەهیدکردنی یەحیا و باوکی بە پلانی ئەو ئافرەتە بووە.

"ڕایەکی تر کە لە هەمووی لای نووسەر بەهێزترە، ئیبن عساکر لە مێژووەکەیدا ئەم باسەی گێڕاوەتەوە بە سەنەدێکی ڕاست کە گوایە پادشای دیمەشق حەزی لە کچی برایەکی خۆیەتی و کچەکەش حەزی لە مامیەتی، حەزرەتی زەکەریا ڕێگری لە زەواجی مەحرەمانە دەکات و بە حەرامی دەزانێت، ئەمەش لەو سەردەمەدا لە ڕێگای ئایینی مەجوسەوە باو بووە کە مەحرەمیان

مارە دەکرد، جا ج خوشک بێت یان دایک لە کوڕ و باوک، واتا کچ لە باوک مارەکراوە لای مەجوس، پاشان برا خوشکی خۆی مارە کردووە...هتد، بۆ زانیاری لەسەر ئەم باسە بگەڕێنەوە بۆ کتێبی ژیانی زەردەشت، نووسینی: عەبدوڵڵای موبەلغی ئابادانی."

کەواتە یەحیا کە پەیڕەوی یاسای تەورات دەکات، حەرامی کرد لەسەر پادشای دیمەشق بە ناوی ( هداد کوڕی هدار) کە برازاکەی خۆی بخوازێ، گوایە کچی براکەی بووە بە ناوی ( ئارێلی کوڕی هدار) یان دەڵێن هەر ژنی کوڕەکەی بووە طەڵاقی داوە مامی هێناویەتی، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە نەگونجاوە حەزرەتی یەحیا بەو هۆکارە شەهیدکراوە، سەری موبارەکی براوە و براوە بۆ بازاڕی دیمەشق گاڵتەی پێکراوە، خوای گەورەش موڵک و سامانی بە ناخی زەویدا بردووە.

گوایە شەهیدکردنی حەزرەتی زەکەریاش دەگەڕێتەوە بۆ پێش شەهیدکردنی یەحیای کوڕی، گوایە تۆمەتیان بۆ دروست کردووە تا شەهیدی بکەن، ڕیوایەتی زۆر لاواز و نا مەعقول لەسەری وتراوە، بەڵام ئەگەری ئەوەش هەیە کە یەحیا و زەکەریا ئەم کوڕو باوکە بەیەکەوە شەهید کرابێتن لە خاکی دیمەشق، چونکە بانگکران لە لایەن پادشای ئەو جێگایەوە، بۆیە ڕای زۆرینە لەسەر ئەوەیە کە دوو پێغەمبەری بەڕێزە لە دیمەشق شەهید کردبێت.

حەزرەتی یەحیا فەرمانی کردووە بە پێنج بنەمای سەرەکی لەناو گەلی ئیسرائیلدا، ئەمەش لە فەرموودەی پێغەمبەرەوە بۆمان باسکراوە کە بریتی بوە لە ( نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، دییەی کوژراو، یادی خوای پەروەردگار).

ژیانی یەحیا، حەزرەتی (عیسا)، زەکەریا و مەریەم سەلامی خوا لە هەموویان بێت، لەبەرئەوەی هەمووی پەیوەستە بەیەکەوە زۆر ئەستەمە مێژوونووسان بتوانن جیاکاری بۆ بکەن لەیەک سەردەمدا ژیاون، حەزرەتی (عیسا) سێ ساڵ لە یەحیا منداڵ تر بووە، یاخود خاتوو مەریەم هاوکات بووە ژیانی لەگەڵ حەزرەتی زەکەریا بۆیە ناچار لێرەدا ژیانی زەکەریا و یەحیا کۆتایی پێ دەهێنین و دەڕۆینە ناو ژیانی خاتوو مەریەم.




زەکەریا علیه السلام
بەیتی مەقدیس لە مەقام
لە جامعی گەورە لە
حەڵەب




یەحیا علیه السلام
ڕووباری ئەردەن
(الشریعة)، دیمەشق

## دایکی حەزرەتی (عیسا) سەلامی خوایان لێ بێت
## مەریەم و (عیسا)ی کوڕی

کاتێک کە دایکی مەریەم (حنەی کچی فاقوذ) نەزرەکەی کرد فەرمووی: خوای پەروەردگار ئەم سکەم دەپارێزم بە ناوی زاتی بەرزت، واتا پەنا دەگرم لەوەی شەیتان بتوانی زەفەریان پێبەرێت بە خۆی و نەوەکانی، ﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ۝﴾ آل عمران

واتە: کاتێك کە منداڵەکەی بوو بینی منداڵەکەی کچە وتی: ئەی پەروەردگار ئەمە کچە، خەفەتی لێ خوارد کە ئەمەیان فەرموودەی خوای گەورەیە، کە خوای گەورە خۆی باشتر ئەزانێ چی بووە واتە: بۆ بەگەورە زانینی مەریەمە، کە مەریەم کچێکی یەکجار گەورەیە، دایکی مەریەم وتی: ئەی پەروەردگار کوڕ وەکو کچ نییە واتە: کچ ناتوانێ خزمەتی مزگەوت بکات، من ناوم ناوە بە مەریەم من پەنای خۆی و نەوەکانیشی ئەگرم بە تۆ لە شەیتانی نەفرین لێکراو و ڕەجم کراو، خوایە خۆی و نەوەکانی بپارێزە، خوای گەورە دوعاکەی قبووڵ کرد ۝

پێش چوونە ناو باسی ژیانی مەریەم خاتوون، پێویستە بیرخستنەوەیەکی تر بدەین لەسەر گەلی ئیسرائیل، وتمان لە بنەڕەتیانەوە گەلێکی ماددە پەرست بوون، حەزیان بەشتی بەرجەستە و هەستەکان بووە، خوای گەورەش هەرچی لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە فێری ئیمان، غەیبییات، قودرەت و دەسەڵاتی خۆی دەکردن، هیچ سوودی نەبوو، بۆیە خوای پەروەردگار وەکو باراندنی ئەو هەموو پیسییە بەسەر فیرعەون و گەلەکەیدا کە غەیب بوو واتا خوێن، بۆق، کوللە، ڕشک و ئەسپی، باوبۆران و باراندنی گەزۆ و شەقبوونی ئاوی دەریای سوور، زۆریتر لە موعجزەی پێغەمبەران، خوای گەورە موعجیزە لە دوای موعجیزە بۆی دەناردن تا ببنە خاوەنی ئیمان.

وا کۆتا موعجیزەی خۆی دەنێرێت و لە دوای ئەم پێغەمبەر بەڕێزە ئیتر کۆتا پێغەمبەرە، هیچ پێغەمبەرێکی تریان بۆ نایەت.

لە ڕابردوودا ئاماژەمان پێدا کە مەریەم نەزر کرابوو بۆ ناو میحراب، یاخود هەیکەل ئەم کچە پاکە عەزرائە پاکیزەیە، لە ڕۆژهەڵاتی هەیکەل دا گۆشەیەکی بۆ خۆی گرتبوو بۆ بەندایەتی، دووربوو لە قەرەباڵغی و کەسی بەسەرەوە نەبوو، هەروەها کاتی ئەوەی بوو کە ئیتر دەبێت شوو بکات و خاوەنی ماڵ و خێزان و منداڵی خۆی بێت، وەکو لای ئەهلی کتاب هاتووە ئەم کچە دەزگیرانی کوڕێکە بە ناوی ( یوسفی نەجار)، ئەم کوڕە یەکێک بوو لە قوتابیەکانی حەزرەتی زەکەریا و لەگەڵ خۆشیدا کاری کردووە.

گومانی تێدا نییە کە باشترین و شای باشترینەکان چوار ئافرەتن ئەوانیش ( مەریەم کچی عیمران، ئاسیا خێزانی فرعون، خەدیجە کچی خوەیلد، فاطمەی کچی محمد رسول الله).

ئەمەش فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەری خوایە کە دەفەرموێت: خيرُ نساءِ العالمينَ أربعٌ : مريمُ بنتُ عمرانَ ، وآسيةُ بنتُ مزاحِمٍ امرأةُ فرعونَ ، وخديجةُ بنتُ خويلدٍ ، وفاطمةُ بنتُ محمدٍ[17]

حاڵەتێکی زۆر سەختە کچی پاکیزە لە ناو کۆمەڵگایەکی دینداریدا خۆشی کار و پیشەی دینداریە، خوای گەورە تووشی سەختترین تاقیکردنەوەی دەکات، ئەویش سکپڕبوونە بە بێ هۆکار، خۆ زۆر ئاسان بوو بڵێت منداڵەکەم یوسفی دارتاش باوکێتی، بەڵام ئەمە فەرمانی خواییە، دەبێت بڵێت کە منداڵەکەم تەنها لە خۆمە.

لە کاتێکدا فریشتەکە پێ دەڵێت خوای پەروەردگار منداڵت پێ دەبەخشێت، هەست بە سۆز و عاطیفە و پاکێتی و پاکیزەی دەکەیت. ڕاستەوخۆ پەنا دەگرێت بە خوای پەردوەردگار چونکە دژی پاکێتی و پاکیزەییە، هەر دەبێت ئەم پاکیزەیە وا بێت لە بنەماڵەی پێغەمبەرانەوە هاتووە دەبێتە دایکی پێغەمبەرێک، مامۆستاکەشی کە زەکەریا هەر پێغەمبەرە.

دوای ئەوەی کە فریشتەکە خۆی ئاشکرا دەکات لەوەی کە نێردراوی خوایە، ئینجا هەستی شەرمنی و ترس و کە هیچ پیاوێک نەیتوانیوە دەستی بگرێت واتا نامەحرەم، وا ئەم کچە شەرمنە هەواڵێکی لە لایەن خواوە بۆ دێت کە منداڵێکی پاک و بەڕێزی پێ دەبەخشێت.

ئەویش لای سەیرە هیچ کردارێک لە هاوسەرگیری ڕووی نەداوە، عیللەتەکە زیاتر ڕۆشن دەکاتەوە هیچ کەسێکیش دەستی بەری نەکەوتووە، ئیتر ئەم منداڵە چۆن دروست دەبێت، نەک بە واتای گومان، بەڵکو هەمان شێوە پرسیاری زەکەریایە کە دەیەوێت هۆکار و چۆنیەتییەکەی ئەوکارە بزانێت، خوای پەروەردگار لە (کن فیکون) دا دەیتوانی منداڵێک بخاتە باوەشی، بە ئامادەکراوی بڵێ ئەوە منداڵەکەتە، بەڵام دەبێت بە هەموو قۆناغەکانی لە دایک بوونی منداڵدا بڕوات، لە سەرەتای سپێرم بۆ ناو ڕەحمی مەریەم، بەڵام لێرەدا ڕەحمی مەریەم ئامادەیە، سپێرم دیار نیە!

خوای گەورە ئەم حاڵەتەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ﴿١٢﴾﴾ التحريم

17 - البخاري، مسلم، الترمذي و احمد.

واتە: نموونەی تر بۆ باوەڕداران (مەریەمی کچی عیمران) ی دایکی (عیسا)عَلَيْهِ السَّلَامُ بوو کە داوێنی خۆی پاراست و کەسێکی داوێن پاك بوو، خوای گەورە ئەمری کرد بە جبریل کە فووی کرد بە ملوانی کراسەکەی بەریدا و بەو فووە حەملی بوو بە (عیسا) و ڕوحمان کردە بەری (رُوحنَا) مەبەست ڕوحی خوای گەورە نییە ئەو ئیزافەیە بۆ ڕێز و بەگەورە زانینە مەریەم باوەڕی بە وشە و قەدەر و شەریعەتی خوای گەورە هەبوو، باوەڕی بە کتێبە ئاسمانییەکان هەبوو کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرانی دابەزاندبوو، یەکێك بووە لەو کەسانەی کە گوێڕایەڵ بوونە بۆ خوای گەورە۝١٢[18]

ئەگەر تەماشای وشەی ( روحنا) بکەین لێرەدا مەبەست حەزرەتی جوبرەئیل کە بە ڕوح ئەمین ناسراوە ( روح الأمين) کە جەنابی جوبرەئیل وەحیەکەی بۆ مەریەم هێناوە، لە سورەتی تەحریم روحنا، هەمان ڕوحی ئادەمە کە خوای گەورە وەکو بەشەر باسی دەکات، باسی زیندوویەتی نییە، بەڵکو باسی ڕۆحی مرۆییە کە خوای گەورە لە ڕێگای هەمان جێگاوە ئەو هێلکە پیتێنراوەی ناردە ژوورەوە، تا لە ڕەحمی خاتوو مەریەم دا گەشە بکات، وەکو منداڵێکی ئاسایی دەربچێت. هەموو ئەم کردار و باسانە بۆ ئەوەیە کە خوای گەورە بەنەسارا بڵێت: (عیسا)ی کوڕی مەریم مرۆڤە، وەکو ئادەمە کە یەکەم مرۆڤە ناسراوە بە ئادەم بۆ پێغەمبەرایەتی، واتا پێش ئادەم مرۆڤ هەبوو، بەڵام کەس ناوی نەزانیون، بەڵکو ئادەم یەکەم پێغەمبەرە بۆ مرۆڤایەتی، (عیسا)-ی کوڕی مەریەمیش وەکو ئادەم مرۆڤە.

کەواتە، ئەم وشەی ڕۆح کە لە قورئاندا بۆ قورئان و جوبرئیل و رۆحی بەشەر باسکراوە، هیچ کەس هیچی لێ نازانێت، قسەکردن لە سەری کات بە فیڕۆدانە و لە هەمانکاتدا خۆ بادانەوەو کەس هیچی لێ نازانێت، کەس نازانێت ماهیەت و چۆنیەتی ڕۆح، خودی پێغەمبەری ئازیزمان کە زاناترین مرۆڤە نەیزانیوە و خوای گەورەش بۆی باس نەکردووە، تەنها بە ڕووداوی خضر و (موسا) وەڵامی جوولەکەی دایەوە، مەرج نییە کە پێغەمبەران هەموو شتێک بزانن.

کەواتە، هەموو پەیوەندی هەیە بە جیهانی پەنهانی، کەواتە خوای موتەعال بە خاتوو مەریەمی فەرموو کە منداڵەکەت موعجیزەیە نەک لە خودی (عیسا)، بەڵکو لە خودی ئەوەی کە بێ باوکە و خوای گەورە هەموو شتێکی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، کەواتە کار کۆتایی هاتووە فەرمانی خوایە تەواو دەبێت سک پڕ بێت و بە پڕۆسەیەکی زۆر ئاساییدا بڕوات و نۆ مانگ تەواو بکات تا منداڵەکە لە دایک دەبێت، چونکە ئەگەر بە پڕۆسەی ئاساییدا نەڕۆشتایە ئەوکات دەوترا ( (عیسا)- خوایە) پەنا بە خوا، چونکە وەکو هەموو منداڵێک پێداویستی مرۆڤی

---

[18]- پێغەمبەری خواصَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرمێت: لە پیاوان زۆر کەس کامڵ و تەواو بوونە، بەڵام لە ئافرەتاندا تەنها ئاسیەی خێزانی فیرعەون و مەریەمی کچی عیمران و خەدیجەی کچی خوەیلد کامڵ و تەواو بوونە، فەزڵ و گەورەیی عائیشە بەسەر ئافرەتاندا وەکو فەزڵی تەشریبی گۆشتە بەسەر سەرجەم خواردنەکاندا، والله أعلم/تەفسیری ڕێبەر

هەبووە بۆ منداڵ و لە منداڵی بۆ لاوی و هەرزەکاری و تا پێگەیشتنی. ئەم پرۆسانە هەموو پرۆسەی مرۆڤی زۆر ئاسایین، ئەگەر یەکێک لەم پرۆسانە نەبێت کەواتە دەڵێن ئەم کەسە نائاساییە، بەڵام هەموو ژیانی وەکو مرۆڤی ئاسایی بووە، برسی بووە تینووی بووە، هیلاک بووە ئازاری پێ گەیشتووە...هتد، خاوەنی هەموو هەست و سۆزێک بووە، ئەمەش لە بوونی خوایەتی نییە، بەڵکو ئەگەر وابێت نوقسانە و خاوەن پێداویستی  تایبەتە کە ئەمە وتەی نەسارایە، حاشا خوای گەورە پاک و بێ گەردە و ناخەوێت و پێویستی بە خواردن و خۆراک نییە و ماندوو نابێت و هەمیشە بە ئاگایە و لە یەک دۆزی خوایەتی خۆیدایەتی کە لە ئەزەلەوە هەر بووە و هەر دەشبێت.

کەواتە زۆر گێلییە (عیسا)ی کوڕی مەریەم بکرێتە خوا، پاشان زیاتر لەسەر باس دەکەین لە ڕووداوی ژیانیدا.

لە دوای فەرمانی خوایی خاتوو مەریەم-ی پاکیزە سکی پڕ بوو بە حەزرەتی (عیسا) (عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞فَحَمَلَتْهُ فَٱنتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا۝٢٢ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ قَالَتْ يَٰلَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ۝٢٣ فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ۝٢٤ وَهُزِّيٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ۝٢٥ فَكُلِي وَٱشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا۝٢٦﴾ مريم

واتە: ئەو کاتە جبریل فووی کردە ناو ملیوانی کراسەکەی یەکسەر بە ئیزنی خوای گەورە حەملی بوو ڕۆیشت و دوورکەوتەوە بۆ شوێنێکی دوور۝٢٢ کە ژانی منداڵبوونی بۆ هات، ژانی منداڵبوونەکە بردی بەرەو ژێر دارخورمایەك، ئەمیش ئاواتی خواست خۆزگە پێش ئەوەی ئەمەم بەسەردا بێت بمردمایە، بۆ ئەوەی خەڵکی گومانی خراپم پێ نەبات، خۆزگە من شتێکی بێ ڕێز بوومایە و هەر باس نەکرامایە، یاخود هەر دروست نەکرامایە، یاخود وەکو پەڕۆی حەیزاوی بوومایە کە فڕێ ئەدرێ و ناوم نەبوایە۝٢٣ لەژێر دارەکەوە جبریل یاخود (عیسا) بانگی لێ کرد خەفەت نەخۆیت، ئەوە پەروەردگارت کانیاو و جۆگەلە ئاوێکی لە ژێرتەوە دەرکردووە و تێ ئەپەڕێ، لەو ئاوە بخۆرەوە۝٢٤ ئەو قەدی دار خورمایە ڕابوەشێنە خورمای تەڕت (ڕوتاب) بۆ دێتە خوارەوە۝٢٥ لە خورما تەڕەکە بخۆ و لە ئاوەکە بخۆرەوە چاوڕۆشنابە پێی و خۆت لە خەفەت دوورخەرەوە، ئەگەر هەر مرۆڤێکت بینی ئەوە بە ئاماژە پێیان بڵێ: من نەزرم کردووە بۆ پەروەردگارم کە خۆم بگرمەوە لە قسە کردن و ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ مرۆڤێکدا ناکەم۝٢٦

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێداوە سکەکەی زۆر ئاسایی بووە بە گوێرەی قۆناغەکانی کۆرپە بووە، دیارە هیچ کەس هەستی پێ نەکردووە، خۆشی لەو ناڕەحەتی و ئازارەدا تەنیا بووە و پێناچێت کەسوکاری زانیبێتیان، چونکە ئەوەندە شەرمن بووە، دایکی و پووری و ماڵی باوانی کەس نەیزانیوە، بە بەڵگەی ئەوە کە حەز بە مەرگی خۆی دەکات، پاشان دوور ڕۆیشتووە تا پێی نەزانرێت، هەر خۆی بووە، خوای گەورە دار خورمایەکی زڕی بۆ خستۆتە بەرهەم و خورمای تازەی بۆ باراندووە و ئاوی بۆ هەڵقڵاندووە. لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا کەسێک بەدی ناکرێت لەگەڵیدا نە دایک، نە پوور...هتد حاڵەتەکە زۆر قورسە، بەڵام چونکە فەرمانی خوایە دەبێت جێبەجێی بکات (عیسا) (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە دایک بوو، لەو حاڵەتە قورسەدا فریشتە مەریەم-یان جێ نەهێشت و لە پەیوەندی دابوون. ڕاستەوخۆ لەگەڵیدا و هەواڵی خوای پەروەردگاریان ئەدا بە مەریم، نەیدەزانی ناوی بنێ چی تا خوای گەورە بە فریشتەیەکدا ناوی بۆ نارد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾﴾ آل عمران

واتە: کاتێك کە مەلائیکەتەکان وتیان: ئەی مەریەم خوای گەورە مژدەت ئەداتێ بە وشەیەك کە وشەکە ئەوەبوو خوای گەورە فەرمووی: (كُنْ) (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) دروستبە، یەکسەر ئەویش دروست بوو کە ئەو وشەیەش کە (عیسا)ی لێ دروست ئەبێ ناوی مەسیحە لەبەر ئەوەی دەستی بەسەر هەر نەخۆێشکدا بهێنایە ئیلا بەئیزنی خوای گەورە چاك ئەبوو بۆیە پێی وتراوە: مەسیح یاخود لەبەر زۆر گەڕان و سەفەر کردنی (عیسا)ی کوڕی مەریەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەبەر ئەوەی بەبێ باوك لە دایك بووە درایە پاڵ دایکی لە دونیاو قیامەتیشدا خاوەن ڕێزو پلە و پایە و ناوبانگە و یەکێکە لەوانەی کە لە خوای گەورە نزیکە﴿٤٥﴾

کەواتە پێشتر لە دایکبوونی (عیسا) خوای گەورە هەموو موعجیزە و کارەکانی بە دایکی فەرموو، کە چی دەکات و موعجیزەش چی دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾﴾ آل عمران

واتە: لەناو بێشکەدا قسە لەگەڵ خەڵکی ئەکات و بانگەوازیان ئەکات بۆ یەکخواپەرستی وەکو موعجیزەیەك، کاتێکیش کە ئەچێتە ناو ساڵەوە و لە بەندە چاکەکانە لە وتە و کردەوەیدا﴿٤٦﴾

بەڵام مەریم جارێ هەر لە ژێر دارەکەدایە، خوای گەورە مەریەم-ی ئاگادار کردەوە کە نەزر بکات لەسەر خۆت کە ئەو ڕۆژە لەگەڵ هیچ مرۆڤێک قسە مەکە، یاخود ڕۆژووی گەلی ئیسرائیل

ئەوکات قسە نەکردن بووە لەگەڵ خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە، واتا خۆی ساغ بکەرەوە ئەو ڕۆژە تەنها بۆ عیبادەت خۆی ئەگەر زۆریان بۆ هێنایت ماژەیەک بکە بۆ منداڵەکەت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ ۖ قَالُوا۟ يَـٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًۭٔا فَرِيًّۭا ﴿٢٧﴾ يَـٰٓأُخْتَ هَـٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍۢ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّۭا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ ۖ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِى ٱلْمَهْدِ صَبِيًّۭا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّى عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِىَ ٱلْكِتَـٰبَ وَجَعَلَنِى نَبِيًّۭا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِى مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَـٰنِى بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّۭا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِى وَلَمْ يَجْعَلْنِى جَبَّارًۭا شَقِيًّۭا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَـٰمُ عَلَىَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّۭا ﴿٣٣﴾﴾ مريم

واتە: دوای ئەوەی کە (عیسا)ی بوو (عیسا) (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-ی هێنایەوە، قەومەکەی سەرزەنشتیان کرد وتیان: ئەی مەریەم بەڕاستی کارێکی زۆر گەورەو خراپت کردووە﴿٢٧﴾ ئەی خوشکی هاروون (واتە: لە عیبادەتدا تۆ خۆت ئەچواند بە هاروون پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ)، یاخود هاروون پیاوچاکێك بووە لە ناویاندا وتوویانە: ئەی وەکو ئەو پیاوچاکە، یاخود وتراوە: پیاو خراپێك بووە وتوویانە: ئەی خوشکی ئەو پیاوخراپە وەکو ئەو خراپەت کردووە، بەڕاستی تۆ باوکت پیاوێکی خراپ نەبووە دایکیشت داوێن پیس نەبووە ئیتر تۆ ئەم منداڵەت لە کوێ هێنا﴿٢٨﴾ مەریەمیش ئاماژەی بۆ (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) کرد کە لە باوەشیدا بوو تازە لە دایك بووە وتیان: چۆن قسە لەگەڵ منداڵێکدا بکەین کە منداڵە و تازە لە دایك بووە و لەناو بێشکەدایە، بە ئیزنی خوای گەورە (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) هاتە قسە و یەکەم قسە کە کردی وتی: من عەبدو بەندەی خوای گەورەم﴿٢٩﴾ لە داهاتوودا خوای گەورە ئینجیل-م پێ ئەبەخشێ دەمکات بە پێغەمبەر﴿٣٠﴾ من کەسێکی موبارەك و پیرۆزو پڕ خێرو مامۆستای چاکە و بەسوود ئەبم بۆ بەندەکان لە هەر شوێنێکدا بم، خوای گەورە فەرمانی پێ کردووم و ئامۆژگاری کردووم بە نوێژ کردن و بە زەکات دان تا لە ژیاندا بم و زیندووو بم﴿٣١﴾ فەرمانم پێ کراوە بە چاکەکردن لەگەڵ دایکمدا، خوای گەورە منی وا لێ نەکردووە کەسێکی لووتبەرزو خۆبەگەورەزان بم و سەرپێچی خوای گەورە یان دایکم بکەم یان ئازاری دایکم بدەم﴿٣٢﴾ سەلامی خوای گەورە لەسەر منە و پارێزراوم لەو ڕۆژەی کە لە دایك بووم و لەو ڕۆژەی کە ئەمرم و لەو ڕۆژەی کە زیندووو ئەبمەوە﴿٣٣﴾[19]

---

[19] ئەمەیش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) نە خوایە نە کوڕی خوایە، بەڵکو بەندە و پێغەمبەری خوایە و لەدایك بووە و دەمرێت و زیندوویش دەبێتەوە وەکو سەرجەم مرۆڤەکانی تر، ئەگەر خوا بوایە یان کوڕی خوا بوایە نەئەبوایە بمردایە، بەڵکو دەبوایە بۆ هەمیشەیی بمایاتەوە و زیندوو بوایە، چۆن دەبێت خوا بمرێت!؟ تەفسیری ڕێبەر

پاشان قورسترین کات و حاڵەتی ژیانی هاتووە مەریەم-ی عەزرائە، دیمەنێکی پڕ ناسۆر و بە ئازار و ناڕەحەتییە، منداڵێک بە باوەش مەریەم-ەوە بە دڵنیاییوە کەسوکاری هەواڵیان پرسیوە، هەمووان لە محرابدا یاخود لە هەیکەل دا کۆبوونەتەوە مەریەم دیار نییە و لە پڕ بە منداڵێکەوە دێتەوە، کۆمەڵگەیەک کە زۆر سامناکە خێرا تاوان ئەدەنە پەنای خەڵکی، ئەم ئافرەتە پاکیزەیە داخۆ باری دەروونی چۆن بێت، وا هەنگاو بە هەنگاو بەرەو ڕوویان دێت کە ئامادە بوو، خۆ مەریەم هیچی نەوتووە، کەسێک نەبوو بڵێت باشە دەشێت ئەم منداڵەی دۆزیبێتەوە، دەی جارێ پەلە مەکەن با خۆی قسە بکات. خێرا کەوتنە شکاندنی بەوەی کە وتیان: تۆ دایکت ئافرەتێکی موحتەرەمە و باوکت پیاوی ناو پیاوانە، بە نازناوی خوشکی هاروون ناویان برد (وتمان (موسا) و هاروون دوو خوشکیان هەبوو بەناوی ( زەینەب و مریم) وەکو لەقەب لە ناو جوولەکەدا بە زەینەب ناو دەبرێت خوشکی (موسا)، بە مەریم دەگوترێت خوشکی هاروون).

لە نێوان چپە چپی نەیار و قسەو باسی ئازیزان بۆ مەریەم ئەویش بە حەیا و شەرمەوە ئاماژەی کرد بۆ لای منداڵەکە کە قسە و گفتوگۆ لەگەڵ ئەو منداڵەدا بکەن!

خەڵکی زۆر تورە بوون وا هەستیان کرد مەریم وەکو گاڵتەپێکردن گاڵتەیان پێ دەکات، وێستگەکەش بۆ ئەوەیە کە خەڵکی کۆبێتەوە و خەڵکێکی زۆر لەوێدا ئامادەیە، چونکە جێگاکەی ناوجەرگەی بازاڕی یەهودە و هەموو خەڵکی کۆ دەبنەوە لە شتێک کە نەزانراو بێت.

لەوەدان کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕووبەڕووکردنەوەی تاوان بەرەو بەڕووی خاتوو مەریم، چونکە کە وەڵامی نەدانەوە واتا تۆمەتەکە دەبێتە تاوان لای ئەوان کە ئەهلی خواناسی نین، بەڵکو ئەهلی دەمە دەمێ و چاو و گوێ و هەستەکانن.

هەموو بەیەک دەنگ ڕووە و یەکتر دەیانوت ئاخر چۆن لەگەڵ منداڵی ساوادا قسە دەکرێت؟!

یار و نەیار لە وێدا جەم و زۆر بوون، وەفدێکی مەجوس کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە ئامادە بوون، بە دوای هەواڵی ئەستێرەی مەسیح دا دەگەڕان لە پڕ دەنگێک هەموویانی بێ دەنگ کرد، دەنگێک چاوی هەموویانی زەق کرد، دەنگێک کە ئەوان لە بیر و هۆشیدا نەبوون وا قسە دەکات، دەنگەکە لە دەمی منداڵەکەی باوەشی مەریم-ەوە دەردەچێت.

دەنگی منداڵەکە دەڵێت: بەندەی خوام، دەمە خاوەن کتێبی ئاسمانی، کەواتە پێغەمبەرە، دەمکاتە پێغەمبەر، وشەی موبارەک پێشتر ئاماژەمان پێداوە بەشتێک دەوترێت موبارەک کە خزمەت بە خەڵکی بکات ئەوە واتای موبارەکە، ئەم منداڵەش کە گەورە بوو موبارەکە چونکە خزمەت بە خەڵکی دەکات، و تەوحید بڵاو دەکاتەوە و نەخۆش چارەسەر دەکات و لە ئینجیل دا یاسا و ڕێساکان ڕوون دەکاتەوە، پاشان فەرمان دەکات بەنوێژ و زەکات تا ئەو ڕۆژەی بمێنێت،

لێرەدا کۆمەڵێک دەڵێن (عیسا) کوڕی مەریم لە دواییدا مردووە ناگەڕێتەوە، ئەو هەڵکێشانە واتا ڕۆحییەی تا ڕۆژی قیامەت زیندووو نابێتەوە، ئەمانەش زۆرێک لە زانایانی ڕابردوو و ئێستا لەو بڕوایەدان، هەندێکی تریش پێیان وایە نەمردوووە لە ئاسمانە و دەگەڕێتەوە، ئەمەش زۆرینەی ئەهلی ئیسلام لەسەر ئەم ڕایەن، نووسەر- پێیوایە (عیسا)ی کوڕی مەریم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) مردووە، پاشان خوای گەورە زیندوووی دەکاتەوە دەبێتە کەسێک لە ئوممەتی محمد ﷺ و دەجال لە ناو دەبات، پاشان دەمرێت واتا مردنەکەی کاتییە (والله أعلم).

ئەم حاڵەتە ڕوویدا کۆتایی بە وتەکانی (عیسا) منداڵی ناو باوەشی دایکی هات، خاتوو مەریم لەسەر شانۆی ڕووداوەکان ون دەبێت، بە چەند هۆکارێک کە ڕوونی دەکەینەوە بە پشتیوانی خوای موتەعال.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ۚ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ ۖ سُبْحَٰنَهُۥٓ ۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٣٦﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ ۖ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾ أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا ۖ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلْيَوْمَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٤٠﴾﴾ مريم

واتە: ئا ئەمە (عیسا)ی کوڕی مەریەم-ەو ئەمە وتەی حەقە دەربارەی (عیسا)، نەك ئەوەی کە ئەو کەسانە ئیختیلافیان هەیە دەربارەی (عیسا)، کە ئەڵێن: کوڕی خوایە یان خوایە﴿٣٤﴾ خوای گەورە پێویستی بەوە نییە کە منداڵ بۆ خۆی بڕیار بدات، پاك و مونەززەهی بۆ خوای گەورە لەو قسەیە خوای گەورە ئەگەر بڕیاری هەر شتێك بدات ئەوە تەنها پێی ئەفەرمووێ: ببە ئەویش یەکسەر ئەبێت﴿٣٥﴾ (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەناو بێشکە پێی فەرموون: بە دڵنیایی (الله) پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە، ئێوە بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن، ئەمە ڕێگای ڕاستی خوای گەورەیە﴿٣٦﴾ حیزب و فیرقە و گرووپەکانی ئەهلی کتاب ئیختیلاف و جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە دەربارەی (عیسا) (عَلَيْهِ السَّلَامُ)، جولەکە ئەیانوت :کوڕی زینایەو دایکی زینای کردووە، گاورەکان هەندێکیان ئەیانوت: خوایە، هەندێکیان دەیانوت: کوڕی خوایە، هەندێکیان ئەیانوت: یەکێکە لە سێ خوایەکە، موسڵمانان وتیان بەندەو پێغەمبەری خوایە کە ئەمە وتەو بیروباوەڕی حەقە سەبارەت بە (عیسا) عَلَيْهِ السَّلَامُ کە خوای گەورە ڕێنمایی کردووین بۆیە خوای گەورەش ئەفەرمووێ: هەڕەشەو دۆزەخ بۆ ئەو کافرانە لە دیمەنەکانی ڕۆژی قیامەت کە ڕۆژێکی یەکجار گەورەیە خوای گەورە سزایان ئەدا لەسەر ئەو قسانەیان کە درۆ بۆ خوای گەورە

هەڵدەبەستن و دەڵێن منداڵی هەیە﴿٣٧﴾ ئای کە بیستن و بینینیان یەکجار بەهێزە لە ڕۆژی قیامەتدا لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا کە هەموو شتێك ئەبیستن و ئەبینن بەڵام سوودیان پێناگەیەنێت، بەڵام ستەمکاران ئەمڕۆ لە دونیادا لە گومڕاییەکی ئاشکرادان و حەق نابیستن و حەق نابینن﴿٣٨﴾ ئەی محمد ﷺ ئاگاداریان بکەوە لەو ڕۆژەی کە پەشیمان ئەبنەوە کە ڕۆژی قیامەتە کاتێك کە هەموو شتێك بڕیاری لەسەر ئەدرێ و یەکلا ئەکرێتەوە و کۆمەڵێك بۆ بەهەشت و کۆمەڵێك بۆ دۆزەخ جیا دەکرێتەوە، بەڵام ئەوانەی ئێستا لە دونیان بێئاگان و ئەوان ئیمان ناهێنن﴿٣٩﴾[20]

هەموو ئایەتەکانی کۆتایی پێناسەی لە دایک بوونی (عیسا)ی کوڕی مەریم بوو، جیاوازی هۆز و بەشەکان و ئایینەکان هەڵەیە و تاوان و کوفرە کە لە ڕۆژی قیامەت تۆڵەیان لێ دەسەنرێتەوە بەوەی کە یەهود دەڵێت ((عیسا) کوڕی ئافرەتێکی داوێن پیسە) پەنا بە خوا، بەم شێوەیە خوای گەورە تۆڵە لە هەردوو لایان دەکاتەوە، کە ئەوان زۆر ناشیرینیان کردووە واتا یەهود، پێچەوانەش نەسارا زۆر بەرزیان کردتۆتەوە تا ئاستی خوا، پەنا بەخوا، ئەهلی ئیسلامیش حەقی خۆیان داوەتێ کە ڕێزی زۆر لە دایکی و خۆی دەگرن کە مرۆڤێکە و وەکو هەموو پێغەمبەرانی تر پێغەمبەر بووە سەلامی خوا لە هەموویان بێت.

لە دوای گفتوگۆی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَام) لە ناو هەیکەل و بازاڕی یەهودا، خاتوو مەریم لە ماڵی خۆیاندا خۆی شاردۆتەوە، بۆ پارێزکاری کردن لە (عیسا)ی کوڕی کە ئیتر بە یەهود و ڕۆم بە شوێنیاندا دەگەڕان، لێرەدا دوو ڕیوایەت دەخەمەڕوو یەکێکیان ئەوەیە لە دوای لەدایک بوونی (عیسا) خاتوو مەریم شوی کردووە بە (یوسفی نەنجار)، ڕیوایەتی تری مێژووی دەڵێن بە عەزرائی ماوەتەوە، واتا هەر کچ بووە شوی نەکردووە و پاکیزە بووە، لە باسی ڕووداوەکاندا ئەم دوو بۆچوونە شی دەکەینەوە بزانین بە چی ئەنجامێک دەگات.

ئەگەر بڵێین خاتوو مەریم شوی نەکردووە هیچ دەقێکی لە سەر نییە، کە دەڵێن ئافرەتێکی پاکیزە و عەزاء بوو بە واتای تا کاتی لە دایک بوونی حەزرەتی (عیسا) (عَلَيْهِ السَّلَام)، پاشان ئەم خاتوونە پاکە کە یەکێکە لەو چوار ئافرەتەی خاتوون و شاژنی هەموو ئافرەتانی جیهانە، وەکو

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[20]- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: کە بەهەشتییەکان چوونە بەهەشتەوە و دۆزەخییەکان چوونە دۆزەخەوە مردن لەسەر شێوە بەرانێك دەهێنرێت و لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ ڕادەگیرێت و دەوترێت: ئەی بەهەشتییەکان ئایا ئەمە دەناسن؟ دەڵێن بەڵێ مردنە، بەدۆزەخییەکان دەوترێت: ئایا ئەمە دەناسن؟ دەڵێن: بەڵێ مردنە، فەرمان دەکرێت و سەردەبڕدرێت و دەوترێت: ئەی بەهەشتییەکان ئێوە نەمرن و مردن نەما، ئەی دۆزەخییەکان ئێوە نەمرن و مردن نەما، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ئەی محمد ﷺ ئاگاداریان بکەوە لەو ڕۆژەی کە پەشیمان ئەبنەوە کە ڕۆژی قیامەتە، کاتێك کە هەموو شتێك بڕیاری لەسەر ئەدرێ و یەکلا ئەکرێتەوەو کۆمەڵێك بۆ بەهەشت و کۆمەڵێك بۆ دۆزەخ جیا دەکرێتەوە، بەڵام ئەوانەی ئێستا لە دونیان بێئاگان و ئەوان ئیمان ناهێنن./ تەفسیری ڕێبەر

هەموو ئافرەتێکی تر مافی شووکردنی هەبووە، ئەو ماوەیەی کە لەگەڵ یوسفی نەجارڕدا بوو لە دوای لەدایک بوونی (عیسا) کوڕی مەریم، ناکرێت پیاوێکی نامەحرەم ئەم هەموو کاتە لەگەڵ خاتوو مەریەمدا بوو بێت، بۆیە زۆر ئاساییە کە یوسفی نەجارڕ بۆتە هاوسەری خاتوو مەریم، خاتوو مەریم خاوەنی منداڵی تر بووە لە کوڕ و کچ، بەڵام نەسارا حەز بە باسکردن و بڵاوکردنەوەی ناکات.

هۆکار چییە کە نەسارا باسی ناکات و دەیانەوێت خۆی و (عیسا) لە مرۆڤ بوونیان دەر بکەن، ڕاستیش ئەوان مرۆڤ بوون، هەموو پێکهاتەی مرۆڤ بوون گرتونیەتەوە. کەواتە خاتوو مەریم خاوەنی هاوسەر بووە لە دوای لە دایک بوونی حەزرەتی (عیسا) (عَلَيْهِ السَّلَامُ).

لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە کە یوسفی نەجارڕ لە خەوندا دوو فریشتە هاتوونەتە خەوی ئاگاداری کردۆتەوە لە ڕووداوەکە و پێیان وتووە کە مەریم منداڵێکی دەبێت بە ناوی (عیسا) مەسیح (عَلَيْهِ السَّلَامُ)، ئەمیش لەوکاتەوە هاوکاری خاتوو مەریم بووە لە گەڵیدا ژیاوە تاکاتی مردن هەروەها لە ئینجیل دا هاتووە لە دوای ئەوەی کە زاناکانی مەجوس هاتنە لای مەریم و دیاریی زۆریان پێشەکەش کرد بە (عیسا)ی کوڕی مەریم لە ئاڵتون و پارە، هەر ئەوانیش ئاگاداری مەریم و یوسفیان کرد کە خاکی فەڵەستین جێ بهێڵێن چونکە هێرۆدس و پیاوانی یەهودو بە دوایدا دەگەڕێن.

یوسف بڕیار ئەدات و لە شەودا بەڕێکەوت بەرەو وڵاتی میسر، لەو وڵاتە دەمێنێتەوە تا کاتی مردنی پادشای ئۆرشەلیم هیردۆس، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ شاری (الناصرة)، ناوی نەصاراش لەم شارەوە وەرگیراوە کە دەڵێن نەسارا یاخود دەشێت لە ئەنصاری عیساشەوە ناوەکە هاتبێت.

لە ڕاستیدا مێژوونووسانی ئیسلامی ڕای جیاوازیان هەیە و دەڵێن گوایە بەرەو ناوچەی دیمەشق ڕۆشتوون، هەندێک لەو زانایانە دەڵێن: گوایە بەرەو شاری (رملة) چوونە ئەوێ ماونەتەوە تا کاتی گەورە بوونی (عیسا)ی کوڕی مەریەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ).




## ڕووداوی ژیانی حەزرەتی (عیسا) کوڕی مەریم (عَلَيْهِ السَّلَامُ)

حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) ی کوڕی مەریم یانزە جار ناوی لە قورئاندا هاتووە، ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە بەشێکی ژیانی لاوێتی هاوڕێی حەزرەتی یەحیا بووە، گومانی تێدا نییە حەزرەتی یەحیا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە سەرەتای لاوێتییەوە پێغەمبەرایەتی حیکمەتی پێ بەخشیوە، خوای موتەعال حەزرەتی یەحیا و زەکەریا سەلامی خوایان لێ بێت هەردووکیان مژدە دەری حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بوون، لە کتێبی پیرۆزدا یەحیا بە ناوی ( یوحەنا مەعمەدان) ناسراوە، باوکیشی حەزرەتی زەکەریا بە پێغەمبەر نەناسراون، بەڵکو بە کاهین و گەورەی مەعبدەکانی گەلی ئیسرائیل ناسراون.

بە جوانی دیارە بە ئینجیلەوە کە دەستکاری کراوە، تەنانەت لە هەندێک لە بەشەکانی ئینجیل دا (عیسا)ی کوڕی مەریم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) هەر بە پێغەمبەر ناسراوە، تا ئەم ساتە وەختەش نەیانتوانیوە بیگۆڕن بە تایبەت لە ئینجیلی مەتا و مارکۆس دا، حەزرەتی (عیسا) لە ( بیت لەحم) کە نزیکە لە قودس لە دایک بووە.

ژیانی حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَام) لە منداڵییەوە تا تەمەنی سی ساڵی زۆر ئاسایی بردۆتە سەر و گەنجێکی پەروەردە کراوی ناو ماڵی پێغەمبەران و چاکە خوازان بووە لە دوای مردنی هێردۆس، بنەماڵەی یوسفی دارتاش هاوسەری خاتوو مەریم گەڕانەوە بۆ ناصرە، کە ماوەی چەند مانگ لە ( ئەسیوط) نیشتەجێ بوون پاشان گەڕانەتەوە، هەندێک بە ساڵ پێوانەی دەکەن هەندێک بە مانگ- بۆ زانیاری خوێنەر- ئەو ماوەی کە حەزرەتی (عیسا) تێیدا لە دایک دەبێت تا تەمەنی شانزە ساڵی زۆر نادیارە، ئەوەی لە بارەیەوە نووسرا وە تەنانەت جێگای بایەخیش نییە لای نەساراکان کە بە ( ئینجیلی مەریم) ناسراوە لە لایەن کەنیسەوە دانی پێدا نەنراوە.

بە ڕووداوەکاندا دەردەکەوێت کە (ئەلیصابات) یاخود ( ئەشیاع) خێزانی حەزرەتی زەکەریا سەردانی خاتوو مەریەمی کردووە لە ناصرە، بە پێچەوانەشەوە زۆر ڕوون دیارە کە خاتوو مەریەم بە تەواوەتی خۆی شاردۆتەوە لە چاو پیاوانی هەیکەل و ژیانی ئاسایی بەسەر بردووە لە ناصریە، ئاماژەمان دا بەوەی کە حەزرەتی یەحیا و باوکی بەڕێزی حەزرەتی زەکەریا مژدەی هاتنی مەسیحیان دا بوو بە گوێی خەڵکییدا، لە دوای شەهید بوونی یەحیا پێغەمبەرایەتی حەزرەتی (عیسا) دەست پێ دەکات، کە تەمەنی سی ساڵ بووە (عَلَيْهِ السَّلَام).

حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَام) کە بووە پێغەمبەر دایکی بەڕێزی جێ دەهێڵێت و بە خاکی فەڵەستین دا دەگەڕێت بۆ بانگەواز، (عیسا) کوڕی مەریم چوار برای هەبووە لە دایکی ناوەکانیان ( یعقوب، یوسف، یهوذا و سمعان).

هەرچەندە زۆرێک لە زانایانی ئیسلامی ڕەتی دەکەنەوە کە شووی کردبێت هەر بە پاکی ماوەتەوە!

نووسەر: لەگەڵ ڕێزم بۆ هەموو ئەو زانایانە، شووکردن و هاوسەرگیری زۆر پاکترە لە مانەوەی کچێک کە ژیانی ئاسایی خۆی نەکات و بڵێن پاکیزەیە، ئەمە وتەیە لە ئەدەبیاتی مرۆڤبووندا جێگای نابێتەوە، بەڵکو مەریەم-ی عەزراء تا ئەو کاتەی حەزرەتی (عیسا)ی بوو، کچ بوو پاکیزە بوو، خوای پەروەردگار بە موعجیزە (عیسا)ی پێ بەخشی، هیچ بەڵگەیک نییە لە ئیسلامدا ڕەتی بکاتەوە کە خاتوو مەریەم  شوی نەکردووە یان بۆی نەبووە شوو بکات! تەنانەت کەنیسەی پرۆتستانتی و کاتۆلیکی ئۆرتۆدۆکس تا ئەمڕۆش هەر قسە و باس لەسەر ئەوە دەکەن مەریەم شووی کردووە یان نەیکردووە، ڕای زۆرینە مەریەم شووی کردووە.

ئەوانەی کە دەڵێن مەریەم هەر بە پاکیزەیی و کچێتی ماوەتەوە، مەریەمیان لە مرۆڤ بوون دەرکردووە، لە ئێستادا لە کەنیسەکانی (شەرقی و مەشریقی) کاتۆلیکی عەقیدەی مەریەمیان هەیە و بە مەریەم لۆجی باسی دەکەن یان ماریالۆجی.

حەزرەتی عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەستی کرد بە بانگەوازی تەوحید و پاککردنەوەی گەلی ئیسرائیل بە مەسح کردنیان بە ئاو و پاکردنەوەیان لە تاوان کە هاوشێوەی غوسڵی ئیسلامە، بەڵام لای ئەوان بۆ تۆبەکردنیان مەسیحیان دەکردن بۆ پاک بوونەوەی لاشە و پاشان دڵ دەروونیان، گەشتی بانگەواز و پێغەمبەرایەتی (عیسا) کوڕی مەریەم لە ناصرەوە دەستی پێکرد، ئەو وتانەی کە لەسەری وتراوون کە گوایە دایکی و خۆی لە ئارامییەکانن، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە. ئەوەش کە گوایە لە منداڵییەوە مردوووی زیندووکردۆتەوە، نەخۆشی چارەسەر کردووە بە تایبەت لە وڵاتی میسر ئەویش ڕاست نییە، هەروەها وشەی (مەسیح) بە واتا زۆر گەڕان دێت لە ڕاستیدا قورئان ئاماژەی کردووە بە دەرچوونیان لە جێگای خۆیاندا لە قورئاندا، بەڵام دیاری نەکراوە ئایا جێگاکە کوێیە، داخۆ ( میسرە، دیمەشقە یان خودی فەڵەستینە) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَـٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴿٥٠﴾﴾ المؤمنون

واتە: (عیسا)ی کوڕی مەریەم و دایکیشیمان کردە موعجیزەیەك لەسەر تاك و تەنهایی و توانا و دەسەڵاتی خوای گەورە کە بەبێ باوك دروستی کرد، پەنامان دان بۆ شوێنێکی بەرز کە زەوی (بيت المقدس) بووە، کە شوێنی نیشتەجێ بوون بووە و ئاویشی لێ هەڵئەقوڵا﴿٥٠﴾

﴿مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴿٧٥﴾﴾ المائدة

واتە: (عیسا)ی کوڕی مەریەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) نە خوا بوو و نە کوڕی خوا، بەڵکو تەنها پێغەمبەری خوا بووە چەندەها پێغەمبەرانی تریش لە پێش (عیسا)وە ڕۆیشتوون و مردووون. دایکیشی ڕاستگۆ بووە لەو قسەیەی کە کردویەتی، وتی: زینام لەگەڵ کەس نەکردووە و بە ئیزنی خوا منداڵم بووە، یاخود بەڕاستدانەری ئەو پەیامە بووە کە کوڕەکەی هێناویەتی کە یەکخواپەرستییە کە هەردووکیان خواردنیان ئەخوارد، واتە: مرۆڤ بوون ئەوەی کە پەروەردگار و خوا بێت پێویستی بە خواردن نییە، بەڵام ئەمان خوا نەبوون و خواردنیان خواردووە ئەوەی کە خواردن بخوات پێویستی بە چوونە سەر ئاو هەیە، خوای گەورە زۆر لەوە بەرز و بڵندتر و گەورەترە کە ئەوان ئەو شتانە ئەدەنە پاڵ خوای گەورە، سەیر بکەو بزانە چۆن ئێمە ئایەتەکانی خۆمانیان بۆ ڕوون ئەکەینەوە، پاشان تەماشا بکەن لەدوای ئەم ڕوون کردنەوەیەش ئەمان چۆن لە حەق لائەدەن ﴿٧٥﴾

ئبن کەثیر لە ئبن عەساکیرەوە لە کاتی بوون بە پێغەمبەری عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) کۆمەڵێک موناجاتی نێوان حەزرەتی (عیسا)ی گواستۆتەوە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، بەڵام هیچ بەڵگە و سەنەدێکی تەندروستی نییە، بۆیە دەمانتوانی وەکو مێژوویەک تۆماری بکەین لەم کتێبەدا، بەڵام

تەنها پڕکردنەوەی لاپەڕەی سپی بوو بێ سوود وەرگرتن، بۆیە بە باشمان زانی وازی لێبهێنین و ئەوەی ڕاست و دروستە بۆ خوێنەری بگوازینەوە.

## دەسپێکی بانگەوازی (عیسا)ی کوڕی مەریەم (عَلَيْهِالسَّلَامُ)

(عیسا) کوڕی مەریەم مژدە پێدراو بوو لە لایەن زەکەریا و یەحیاوە، بەڵام خودی خۆی هیچ زانیاری وەحی پێنەگەیشتبوو، بۆیە ئەوانیش بە خواناس و دینداری شوێن هەردوو پێغەمبەرەکەی تر کەوتبوو، وەکو زۆرێک لە پێغەمبەران ئەویش حەز بە دوورکەوتنەوە دەکات و ماوەیەک لە تەنهایدا خەڵوەت دەگرێت تا کاتی تەواو بوونی خەڵوەتەکەی، شەیتان و تا خودی ئیبلیس-یش ڕێگای پێ دەگرێت و وەسوەسەی زۆری بۆ دروست دەکات، سەرەتا بەوە وەسوەسەی بۆ دروست کرد پێی وت ئەگەر تۆ هەڵبژاردەی خوا بیت و خوا تۆی خۆش دەوێت ڕۆحی قودس بۆ خۆت دایکت ناردووە، خۆت لە شاخەوە فڕێ بدە خوارەوە.

حەزرەتی (عیسا) فەرمووی: هیچ کات بەندە خوای خۆی تاقی ناکاتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە خوای گەورە بەندەکانی تاقی دەکاتەوە.

(عیسا) بە ڕۆژووو بوو شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست کرد کە داوا لە خوا بکات بەردی بۆ بکات بە نان، لە وەڵامدا حەزرەتی (عیسا) فەرمووی مرۆڤ مەرج نییە تەنها بە خواردن بژی زیکر و بەندایەتی زیندوووی دەکاتەوە، پاشان شەیتان وتی: تۆ مرۆڤ نیت.

ئینجا حەزرەتی (عیسا) داوای هاوکاری و کۆمەکی لە خوای پەروەردگار کرد و خوای گەورە بە حەزرەتی جوبرەئیل و ئیسرافیل شەیتانی لێ دوورخستەوە.[21]

پاشان خوای گەورە وەحی کردووە بۆ (عیسا)ی کوڕی مەریم و فەرمویەتی: ﴿إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ۖ وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ۖ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى ۖ وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾﴾ المائدة

واتە: خوای گەورە ئەفەرموێت: ئەی (عیسا)ی کوڕی مەریەم (عَلَيْهِالسَّلَامُ) باسی ئەو نیعمەتانەی من بکە بەسەر خۆت و دایکتەوە کە بە بێ باوك دروستم کردیت وە کردمیت بە پێغەمبەر، لەبێشکەدا هێنامیتە قسە تا شایەتی بدەیت لەسەر داوێن پاکی دایکت، دانت نا بە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[21]- ( ئەم باسە ئیبن کەثیر لە "الحافظ أبوبکر الخطیب" هێناویەتی لە تاریخ دمشق ( ٣٨٧/٤٧ ).

پەرستنی مندا، تا بیسەلمێنێت کە ئەوانە خوا نەبوون و خوای گەورە پشتیوانی کردوون و نیعمەتی خۆی ڕژاندووە بەسەریاندا کە من پشتیوانی تۆم کردووە و بەهێزم کردیت بە (روح القدس) بەو ڕوحە پاکەی کە خستمە بەرت، یاخود بە جبریل (عَلَيْهِ السَّلَامُ) کۆمەڵێك موعجیزەی بە (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بەخشی بۆ پشتیوانی کردنی کە تۆ لە ناو بێشکەدا مناڵ بووی قسەت لەگەڵ خەڵکیدا ئەکرد، کاتێ کە بەتەمەن بووی لەهەردوو حاڵەتەکەدا وەکو یەك قسەت ئەکرد، فێری نووسین و تێگەیشتنتم کردیت، فێری تەورات و ئینجیلم کردیت، لە قوڕ شێوەی باڵندەت دروست ئەکرد و فووت پیا ئەکرد بەئیزنی خوای گەورە ئەبووە باڵندەو ئەفڕی بە ئاسماندا، ئەوەی کە هەر لە زگماکەوە کوێرە بە ئیزنی خوا چاکت ئەکردەوە و بەڵەکت چاکت ئەکردەوە بە ئیزنی خوای گەورە، تا بزانن کە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) خوا نەبووە و کوڕی خوا نەبووە بەڵکو عەبدی خوا و پێغەمبەری بووە لەناو گۆڕەکاندا مردوووت دەرئەکردو زیندوووت ئەکردوە بە ئیزنی خوای گەورە یادی ئەم نیعمەتەم بکەوە بەسەرتەوە کە نەم هێشت و مەنعی بەنی ئیسرائیلم کرد و لەسەر تۆم لادان، کاتێك کە ویستیان بتکوژن بەرزم کردیتەوە بۆ ئاسمان، کاتێك کە ئەو هەموو موعجیزە و بەڵگە ڕوون و ئاشکرایەت بۆیان هێنا کافران وتیان: ئەمە هیچ شتێك نییە تەنها سیحر و جادوویەکی ئاشکرا نەبێ﴿١١٠﴾

پاشان خوای موتەعال باسێکی ڕەوشی سەردەمی حەزرەتی (عیسا)-مان بۆ دەکات و ئاگاداری ڕەوشەکەمان دەکات کە بۆچی پێغەمبەری نارد بۆ جولەکە و دەفەرموێت: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴿١٦١﴾﴾ النساء

واتە: بەهۆی زوڵم و ستەمی جوولەکەکانەوە و سەرپێچی کردنی پێغەمبەرانیان هەندێك شتی حەڵاڵ و پاکمان لەسەریان حەرام کرد کە پێشتر بۆیان حەڵاڵ کرابوو، بەهۆی ئەوەی کە ڕێگری و بەربەستیان ئەکرد لە ڕێگای خوای گەورە لە ئیسلام و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و لە کوشتنیان بۆ پێغەمبەران﴿١٦٠﴾ بەهۆی ئەوەی کە مامەڵەیان بە ڕیباوە ئەکرد و ماڵی خەڵکیان بەناحەق ئەخوارد، لە کاتێك کە نەهیان لێکرابوو قەدەغە کرابوون کە ڕیبا بخۆن، ماڵی خەڵکیان بەناحەق و بە باتڵ ئەخوارد وەکو بە ڕەشوە و بە بەرتیل بۆ کافران لەوان سزایەکی زۆر بەئێش و ئازارمان داناوە﴿١٦١﴾

سەرەتا لەگەڵ پیاوانی ئایینی جولەکەدا کەوتە گفتوگۆ لەسەر تاوانەکانیان و شاردنەوەی حەق و ڕاستییەکان، بە ئاشکرا پێی ڕاگەیاندن کە خوای گەورە ناردوویەتی تا چی ڕای جیاواز و ناڕوونەکانیان بۆ ڕوون بکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدْ

جِئۡتُكُم بِٱلۡحِكۡمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي تَخۡتَلِفُونَ فِيهِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ۝ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ۝﴾ الزخرف

واتە: کاتێك کە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا و موعجیزەی هێنا وتی: ئەوە من حیکمەت یان پێغەمبەرایەتیم بۆ هێناون تا هەندێك لەو شتانەی کە ئێوە ئیختیلاف و ناکۆکی و جیاوازی لە نێوانتاندا هەیە لە ئەحکامی تەورات بۆتان ڕوون بکەمەوە ئێوە تەقوای خوای گەورە بکەن گوێڕایەڵی خوای گەورە و گوێڕایەڵی من بکەن۝ بە ڕاستی تەنها (الله) پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیە، ئێوە بەتاك و تەنها ئەو بپەرستن و شەریکی بۆ دامەنێن، ئەمە ڕێگای ڕاستی خوای گەورەیە۝

لەوسەردەمەدا کۆمەڵێک پەیدا بووبوون بەناوی (صدوقییەکان) کە تاقمێک بوون لە جوولەکە، فەلسەفەی یۆنانییان تێکەڵ کردبوو بە بیروباوەڕیان، پێیان وابوو کە دوای مردن زیندووبوونەوە نییە، جا ئایا بڕواکەیان وابوو کە یەکدەگرنەوە ڕۆحەکان و بڕوایان بە (وەحدەی وجود) هەبوو یان بیروباوەڕێکی گەندەڵ بوو تایبەت بە خۆیان؟.

(عیسا) زۆرترین کێشەی لەگەڵ ئەم کۆمەڵەدا بوو، هەروەها کۆمەڵێکی تر هەبوون بەناوی (پیاوانی یەهوذا، یان پیاوانی ئایینی) ئەمانیش دینیان دەفرۆشت و کێ پارەی بدایە حەڵاڵیان بۆ حەرام دەکرد و حەرامیشیان بۆ حەڵاڵ دەکرد.

تاقمێکی تر کە بریتی بوون لە (فریسییەکان) ئەمانیش گەندەڵ و خراپەکاری زۆریان هەبوو، بەڵام تا ڕادەیەک لەوانی تر باشتر بوون، واتا لەناو خراپەکاندا باشتر بوون، نەک لە ناوچەکاندا باشتر بووبن. زۆر دەمە دەمێیان لەگەڵ عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەکرد و بە ساحیر ناویان دەبرد، وەڵامی هەمووو پرسیارەکانی ئەدانەوە و شارەزایی تەواو بوو لە تەورات، لەوان جوانتر و باشتری دەنووسی.

هەرچییان شاردبووەوە لەپارە و سامان هەمووی ئاشکرا دەکرد لە ڕێگای وەحییەوە، لەبەر چاویاندا پەیکەری قوڕینەی دروست دەکرد لە شێوەی باڵندە فووی پێدا دەکرد بە فەرمانی خوا گیانی تێدەهات، بۆ بەرپەرچدانەوەی جوولەکە صدوقییەکان ڕۆژێک دایکێک تاقە کوڕێکی هەبوو مرد، صدوقییەکان بە گاڵتەپێکردنەوە وتیان (عیسا) ئێستا زیندوووی دەکاتەوە، ئەوان گاڵتەیان بە (عیسا) دەکرد و حەزرەتی (عیسا) چووە لای دایکی کوڕەکە دەگریا و هەر ئەو کوڕەی هەبوو، پێیوت ئەی پێغەمبەری خوا هاوکاریم بکە کوڕەکەم مردوووە، (عیسا)ش فەرمووی نەمردوووە بەڵکو خەوتووە، بانگی کرد لە کوڕە مردوووەکە و لە بەرچاوی هەموویان زیندووو بوویەوە.

ئیتر چی کەچەڵ و گول و ئەوانەی نەخۆشی وایان بوو کە چارەسەری نەبوو حەزرەتی (عیسا) بە موعجیزە بۆی چارەسەر دەکردن و خوای گەورە هاوکاری دەکرد، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّى قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۗ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾﴾ آل عمران

واتە: خوای گەورە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ)ی فێری نووسین و زانیاری و تێگەیشتن و حیکمەت و تەورات و ئینجیل ئەکات، کە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) تەورات و ئینجیلیشی لەبەر بووە﴿٤٨﴾ ئەیکاتە پێغەمبەرێك و ئەینێرێ بۆ لای بەنی ئیسرائیل پێیان ئەڵێت: من لای خوای گەورەوە موعجیزەم بۆتان هێناوە من لە قوڕ وەکو شێوازی باڵندەتان بۆ دروست ئەکەم و دوای ئەوە کە دروستی ئەکەم فووی پیا ئەکەم بە ئیزنی خوای گەورە ئەبێتە باڵندەیەك و ئەفڕێ بە ئاسماندا، کوێر و نابینای زگماك و بەڵەك چاك ئەکەمەوە بە ئیزنی خوا، مردووو زیندووو ئەکەمەوە بە ئیزنی خوای گەورە، خوای گەورە ئەم موعجیزانەی پێبەخشی چونکە لەو سەردەمەدا زانستی پزیشکی بڵاو بوو، پزیشکەکان توانای چارەسەری ئەم شتانەیان نەبوو، لە ماڵەوە هەر شتێك ئەخۆن یان هەڵیدەگرن بۆ سبەینێ من هەواڵتان پێ ئەدەم وە پێتان ڕائەگەیەنم و ئەزانم، ئا ئەمانە هەمووی نیشان و بەڵگە و موعجیزەیە بۆ ئێوە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی من، بۆ ئەوەی ئیمان بێنن ئەگەر باوەڕدارن﴿٤٩﴾ ئەو تەوراتەی کە لە پێش مندا بۆ موسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) هاتووە منیش بە دڵنیایی بە ڕاستی دائەنێم و ئەویش مژدەی پێی دابوون کە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بەو شێوازە دێت، بۆ ئەوەش هاتوومە کە هەندێك لەو شتانەی کە لە تەورات دا لەسەرتان حەرام کرابوو کە خۆتان حەرامتان کردبوو لەسەر خۆتان تا بۆتانی حەڵاڵ بکەمەوە، موعجیزە و نیشانەیەکیشم لەلایەن پەروەردگارەوە بۆتان هێناوە لەسەر ڕاستگۆییم ئێوەش تەقوای خوای گەورە بکەن و گوێڕایەڵی من بکەن و شوێنی من بکەون﴿٥٠﴾ بە دڵنیایی هەر (الله) کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیە و ئێوە بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن و شەریکی بۆ دامەنێن و من مەکەن بەشەریکی خوای گەورە، ئەمە ڕێگای ڕاستی خوای گەورەیە﴿٥١﴾

هەموو ئەم موعجیزەو پەرجۆیانەی (عیسا)یان بینی، بەڵام ئەوان بڕیاری ئەوەیان دا تا مردنیان لەگەڵ (عیسا) بجەنگن و خەریکی پیلاندانان بوون دژی.

لاتان سەیر نەبێت گەلی یەهود ئەوە ڕەفتاری بووە، بۆیە خوای موتەعال پێغەمبەر لە دوای پێغەمبەر بۆی دەناردن کەچی هەر لارێتر دەبوون، زۆرترین موعجیزە لە ناویاندا ڕووی داوە، بەڵام ئەوان ئارەزوومەندی مادییەت بوون حەزیان بە بوونی هەستەکانیان دەکرد، دژی ئیمان بوون، دژی فریشتەکان بوون ڕقیان لە جوبرەئیل بوو، ڕقیان لە پێغەمبەران بوو دەیانکوشتن، بیروڕایان بە پەرتوکەکانی خۆشیان نەبوو، ئەوەی لە بەرژەوەندییان بوایە دەیانوت ڕاستە، ئەوەی دژییان بوایە وازیان لێ دەهێنان، خەریکی کوشتنی یەکتری و لەناو بردن و ئەسیرکردنی یەک بوون...هتد.

خوای موتەعال ئەو دیمەنەمان بۆ باس دەکات دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ۚ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾﴾ البقرة

واتە: پاشان ئێوە کەسانێکن عەهدو پەیمانتان شکاند و یەکتری ئەکوژن و هەندێکتان هەندێکتان لە ماڵ و حاڵی خۆیان دەرئەکەن، پشتیوانی و هاوکاری یەکتری ئەکەن بەتاوان و بەدژایەتی کردن. کاتێك کە دیلیشتان دەست بکەوێ بە پارە و فیدیە بەری ئەدەن و ئازادی دەکەن و دەڵێن: لە تەوراتدا هاتووە کە حەرامە یەکتری دەربکەین ئایا ئێوە باوەڕتان بەهەندێ لەو شتانە هەیە کە لە کتابەکەتاندا هەیە کە تەوراتە وەکو ئازادکردنی دیل بە پارە، باوەڕتان بە هەندێکی نییە وەکو کوشتنی یەکتری و دەرکردنی یەکتری، هەندێکی جێبەجێ ئەکەن و هەندێکی جێبەجێ ناکەن، هەر کەسێ ئیمانی بەهەندێ لە کتابی خوای گەورە هەبێ و ئیمانی

بەهەندێکی نەبێ سزای ئەم کەسانە هیچ شتێك نییە، تەنها سەرشۆڕی نەبێ لە ژیانی دونیادا لە ڕۆژی قیامەتیش ئەگەڕێنەوە بۆ سەختترین سزا، خوای گەورە بێئاگا نییە لەو کردەوانەی کە ئێوە ئەیکەن کە یاریکردنە بە ئایەتەکانی خوای گەورە﴿٨٥﴾ [22] ئەم کەسانە قیامەتیان گۆڕیەوە بە دونیا، دونیایان هەڵبژارد بەسەر قیامەتدا، لە ڕۆژی قیامەت سزایان لەسەر سووك ناکرێ وەك ئەوە نییە کە ئەڵێن: تەنها حەوت ڕۆژ بێت یان سووك بکرێ کەسیش نییە سەریان بخات و سەرناخرێن﴿٨٦﴾ ئێمە تەوراتمان بە (موسا) بەخشی و بۆیمان نارد، لە دوای ئەویش چەندەها پێغەمبەرانی ترمان نارد بۆ (عیسا)ی کوڕی مەریەم-یش جۆرەها موعجیزە و بەڵگەی ڕوون و ئاشکرامان نارد کە مردووی زیندووو ئەکردەوە بە ئیزنی خوای گەورە، کوێر و کەڕ و لاڵی چاك ئەکردەوە، هەواڵی زۆر شتی غەیبی پێیان ئەدا، ئینجیلمان بۆی دابەزاند بە هێزمان کرد و پشتیوانیمان کرد بە جبریل، ئایا ئێوە هەر کاتێك پێغەمبەرێکتان بۆ بێت کە لەگەڵ هەوا و ئارەزووی ئێوەدا نەگونجێ و حەزتان پێی نەبێ خۆتان بەگەورە ئەزانن لەوەی کە وەڵامی بدەنەوەو شوێنی بکەون کۆمەڵێك لە پێغەمبەرانتان بەدرۆ زانی وەکو: (عیسا) و محمد کۆمەڵێکیشتان دەکوشت وەکو: یەحیا و زەکەریا، هەوڵی کوشتنی (عیسا) و محمدیان دا سەلامی خوا لە هەموو پێغەمبەران﴿٨٧﴾ وتیان: ئێمە دڵمان پەردەی بەسەرەوەیە هیچ لە قسە حاڵی نابین و لێی تێ ناگەین و ناگاتە دڵمان تا ئیمان بێنین، دڵمان پڕە لە زانست و پێویستمان بە قورئانی ئێوە نییە، بەڵکو ئەمە خوای گەورە لەعنەتی لێیان کردووە و دەریانی کردووە و دووریانی خستۆتەوە لە ڕەحمەتی خۆی بەهۆی ئەوەی کە ئیمانیان نەهێنا بە پێغەمبەری خوا، کەمێکیان هەن کە ئیمان بێنن و زۆر عینادیان کردووە﴿٨٨﴾ کاتێکیش جوولەکە لەلایەن خوای گەورەوە کتابێکیان بۆ هات کە قورئانە، کە بەڕاستدانەری تەوراتە دەبوایە ئیمانیان پێ بهێنایە، پێش ئەوەی کە خوای گەورە قورئان دابەزێنێ و پێغەمبەری خوا ﷺ بنێرێ ئەوان بە کافرانیان ئەووت بەم نزیکانە پێغەمبەرێك دێت ئەو کاتە ئەگەر هات بزانن چۆن ئێمە شوێنی ئەکەوین و ئێوە لەناو ئەبەین، بەڵام کاتێك کە ئەو پێغەمبەرە هات و ناسیان کە محمدە و لە خۆیان نییە کوفریان پێی کرد و شوێنی نەکەوتن لەعنەتی خوای گەورە لە کافران بێت﴿٨٩﴾ ئەمە خراپترین شت بوو کە گۆڕیانەوە و کڕیان بەوەی کە نەفسی خۆیان بەهیلاکدا و ڕووبەرووی سزای ئاگری دۆزەخیان کردەوە، کە لە حەسوودیدا کوفریان کرد بەو قورئانەی خوای گەورە دایبەزاندووەکە خوای گەورە فەزڵی خۆی دائەبەزێنێ بۆ سەر هەر کەسێك کە ویستی لێ بێ لە بەندەکانی، ئەمجارە بۆ سەر پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە لە عەرەب بوو لە جوولەکە نەبوو، ئەوان

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[22]- لەپێش ئیسلامدا لە مەدینە (ئەوس و خەزرەج) کە بتپەرست بوون شەڕیان بکردایە (بەنو نەزیرو بەنو قەینوقاع) کە جوولەکە بوون هاوپەیمانی (خەزرەج) بوون و (بەنو قورەیزە) کە جوولەکە بوون هاوپەیمانی (ئەوس) بوون و کوشتاری یەکتریان دەکرد و یەکتریان دەردەکرد کە حەرام بوو لەسەریان، دیلی یەکیان بەپارە ئازاد دەکرد کە دروست بوو، باوەڕیان بە هەندێك لە تەورات هەبوو و باوەڕیان بە هەندێکی تری نەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند./تەفسیری ڕێبەر

گەڕانەوە بە تووڕەبوون لەسەر تووڕەبوونی خوای گەورە لەبەر ئەوەی کوفریان بە (عیسا) کرد و کوفریان بە محمد ﷺ -یش کرد لەوەدا خوای گەورە غەزەبی لێیان گرت لەمیشدا غەزەبێکی تر، یاخود کوفریان بە پێغەمبەر ﷺ کرد و دواتریش زوڵمیان لێی کرد بەڕاستی کافران سزایەکی زۆر بەئێش و ئازار و ڕیسواکەر و ئیهانەکراویان بۆ هەیە﴿٩٠﴾ کاتێك کە پێیان بڵێی ئیمان بێنن بەو قورئانەی کە خوای گەورە دایبەزاندووەئەڵێن: ئێمە ئیمان دێنین بەوەی بۆسەر خۆمان دابەزیوە واتە: تەورات، کوفریش ئەکەن بەوەی کە لە دوای تەوراتدا هاتووە قورئانەکە قورئانیش ئەو حەقەیە کە ئەوەی لە تەوراتدا هەیە ئەمیش بەڕاستی دائەنێ پێچەوانەی ناکات و یەکسانە، ئەی محمد ﷺ پێیان بفەرمە ئەی ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن بۆچی پێغەمبەرانی خواتان ئەکوشت لە پێشتردا کە نەهی-تان لێ کرابوو بیانکوژن وەکو باب و باپیرانتان کە پێغەمبەرانی خوای گەورەیان کوشتووە﴿٩١﴾

بۆیە چیتر (عیسا)ی کوڕی مەریەم، هیوای چارەسەری نەما لە ناو پیاوانی ئایینی و جولەکەکان کە شارەزا بوون بە دین، حەزرەتی (عیسا) سەرەتا لەوانەوە دەستی پێکرد، چونکە ئەگەر گەورە باش بوو ژێردەستەکان خۆیان چاک دەبن، بەڵام کە گەورەی وڵات خراپ بوو خەڵکەکەی ژێر دەسەڵاتی خراپ دەردەچن، هاوشێوەی خێزانێک دایە.

بۆیە (عیسا) کەوتە ئەنسار کۆکردنەوە و دروستکردنی ڕێکخستنی سەرەتایی کە ناسراون بە ١٢ حەوارییەکە، یان هاوەڵانی (عیسا) کە ١٢ کەس بوون، هەڵبەت ئەو ژمارەیە لەناو ئەهلی نەساراوە وەرگیراوە، هیچ بەڵگەیەکی شەرعی یان ئیسلامییان لە سەر نییە، (عیسا) لەناو خەڵکەکەدا هاواری کرد کێ پشتیوانم لێ دەکات و دەمینێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿۞فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنۡهُمُ ٱلۡكُفۡرَ قَالَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾﴾ آل عمران

واتە: کاتێك کە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) هەستی کرد بەردەوامن لەسەر کوفر و ئیمانی پێ ناهێنن، فەرمووی: کێ پشتیوانی منە لە دەعوە و بانگەواز کردن بۆ گەیاندنی دینی خوا، حەواری و قوتابی و کەسە تایبەتەکانی خۆی کە دوانزە کەس بوون وتیان: ئێمە پشتیوانی دینی خوای گەورە و پێغەمبەری خوای گەورە ئەبین بۆ بڵاو کردنەوەی دینی خوا ئیمانمان بەخوای گەورە هێناوە، وە تۆیش لە ڕۆژی قیامەت شایەتیمان بۆ بدە کە ئێمە موسڵمانین﴿٥٢﴾ ئەی پەروەردگار ئیمانمان هێنا بەو ئینجیل و ئایینەی کە بۆ ئەو پێغەمبەرەت دابەزاند و شوێنی کەوتین تۆش لەو کەسانەمان ناونووس بکە کە شایەتی ئەدەین بە وەحدانیەتی تۆ و پێغەمبەرایەتی عیسا

(عَلَيْهِالسَّلَامُ)﴿٥٣﴾ کافران نەخشە و پیلانیان دانا و فێڵیان کرد، خوای گەورەش لە بەرامبەر نەخشە و پیلان و فێڵی ئەوان نەخشە و پیلان و فێڵی بۆیان دانا، باشترین نەخشەدانەر کە فێڵی ئەوان هەڵوەشێنێتەوە خوای گەورەیە، کەسانێك لە بەنی ئیسرائیل چوونە لای پاشای ئەو کاتە کە کافر بوو وتیان (عیسا) زۆڵە و خەڵکی گومڕا دەکات و لە گوێڕایەڵی تۆ لایان دەبات و کێشە دروست دەکات، پاشا خەڵکی نارد بیکوژن و لە خاچی بدەن، خوای گەورە ڕزگاری کرد و لە پەنجەرەی ماڵەکەوە بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان و شێوەی خستە سەر یەکێك لە قوتابیەکانی و ئەویان کوشت و لە خاچیاندا وایانزانی عیسا (عَلَيْهِالسَّلَامُ)-ە﴿٥٤﴾

هەروەها لە جێگایەکی تردا دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّـۧنَ مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌۖ فَأَيَّدْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُواْ ظَـٰهِرِينَ﴿١٤﴾﴾ الصف

واتە: ئەی باوەڕداران ئێوە بن بە پشتیوانی خوای گەورە و پشتیوانی دینەکەی خوای گەورە بکەن و سەریبخەن هەروەکو چۆن (عیسا)ی کوڕی مەریەم (عَلَيْهِالسَّلَامُ) بە حەوارییەکانی فەرموو: کێ پشتیوانی دینەکەی خوای گەورە ئەکات و دینی خوا سەرئەخات لەگەڵمدا؟ حەوارییەکان ئەوانەی کە سەرەتا ئیمانیان پێ هێنا کە دوانزە پیاو بوون وتیان: ئێمە پشتیوانی لە دینی خوا ئەکەین و دینی خوا سەرئەخەین، کۆمەڵێك لە بەنی ئیسرائیل باوەڕیان بە (عیسا) هێنا و کۆمەڵێکیشیان کوفریان پێی کرد کە جولەکە بوون و دایکیان تۆمەتبار کرد بە زینا کردن، ئێمەیش پشتیوانی و پاڵپشتی ئەو کۆمەڵەمان کرد کە ئیمانیان هێنا، بەهێزمان کردن بەسەر کافران و دوژمنانیاندا، ئەمان بەرز و بڵند و زاڵ و سەرکەوتوو بوون بە ناردنی پێغەمبەری خوا ﷺ، والله أعلم ﴿١٤﴾

حەزرەتی (عیسا) کاتێ کە دەگەڕا بەناو خاکی فەڵەستین دا کاری بانگەوازی دەکرد و پیاوانی مەعبەدەکانی یەهودی ڕسوا دەکرد و ئاشکرای دەکردن لە گەندەڵی و دزی و خراپەکاری، لەهەمان کاتدا هانی خەڵکی ئەدا بۆ ئازادی و سەربەستی، چونکە ڕۆم خاکی فەڵەستینی داگیر کردبوو، بەم پاوپێوەندە جوولەکەکان هانی دەسەڵاتیان ئەدا کە حەزرەتی (عیسا) دەستگیر بکەن بەبیانووی ئەوەی کە هانی گەلی ئیسرائیل ئەدات بۆ شۆڕش کردن.

## گەڕان و فێرکاری (عیسا)ی کوڕی مەریەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ)

سەرەتا (عیسا) قوتابییەکانی فێر کرد کە واز لە موڵک و ماڵ و سامان بهێنن، بە واتای ئەوەی وێڵ مەبن بە دوای دنیا و خۆشییەکانی دنیادا، (عیسا) فەرمووی بە حەوارییەکانی چەندێک لە دەسەڵاتدار و مەلیکەکان حیکمەتیان بە جێ هێشتووە لە دوای خۆیان، ئێوەش هێندەی حیکمەتی پادشاکان دونیا ویست بن.[23]

ئەم وتەیە لە ناوەخنیدا زۆر قووڵە تێگەیشتنی قوڵی دەوێت، چونکە پادشا و مەلیکەکان خاوەنی حیکمەت نین، بۆیە مرۆڤ بەو ئەندازەیە کەمە شوێن دنیا بکەوێت.

داوای دەکرد لە گەلی ئیسرائیل کە ژیانی کولەمەگی( تەقەشوفانە) بژین، خەڵکی کەلێیان دەپرسی بۆچی وا بکەین؟ دەیفەرموو: لەبەر ئەوەی شوکرانە بژێر و سوپاسگوزارنین.[24]

هەروەها فێری خەڵکی دەکرد کە لە دونیادا تێپەڕ بن نەک ئاوەدانی بکەنەوە، خۆشەویستی دونیا سەرتۆپی هەرچی تاوانە، نەزەرکردن لە ئافرەت چاندنی تۆوی شەهوەتە لە دڵدا.[25]

حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بڕۆیشتایەتە هەر جێگایەک زیاتر بۆ پاککردنەوەی دڵ و دەروونیان بوو، چونکە سەردەمی جەنابیان بت پەرست نەبوو، بەڵکو دوای جەنابیان بت پەرستی دەستی پێکرد.

لە کۆڕ و مەجلیسەکانیدا دەیفەرموو: ئەی نەوەکانی ئادەم ئێوە لاوازن، لە خوا بترسن لە هەر کوێیەک هەن، خۆ بپارێزن، لە دنیادا وەکو میوان بن ماڵەکانتان بکەنە مزگەوت، چاوەکانتان پڕ کەن لە گریان، یاخود چاوەکانتان فێری گریان بکەن، لاشەتان فێری ئارامگری بکەن، دڵتان فێری بیرکردنەوە بکەن، گرنگی مەدەن بە ڕزق و ڕۆزی، چونکە دەتانخاتە ناو تاوان کردن.[26]

بە قوتابیەکانی فەرموو: هیچ کەس لە ئێوە ناتوانێت لەسەر دەریادا شەپۆلەکانی خانوو دروست بکات، بەڵام دنیاش مەکەن بە جێگای نیشتەجێ بوونتان.[27]

ئەگەر دیقەتی وتەکانی حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بدەین هەموو لە چوار چێوەی فێرکاری ڕۆژی قیامەت زوهد و خواناس پاککردنەوەی دڵ و دەروونە، چونکە گەلی ئیسرائیل تووشی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[23]- إبن عساكر، تأريخ دمشق.

[24]- هەمان سەرچاوەی پێشوتر.

[25]- رواه عبدالله بن احمد بن حنبل، في الزهد، ص٩٢.

[26]- تأريخ دمشق، ابن عساكر.

[27]- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دەروونی بوو بوون وابەستە بوو بوون بە ژیان و دنیاوە، قیامەتیان لە بیرکرد بوو بگرە باوەڕیان پێ نەمابوو.

سوفیانی ثەوری دەگێڕێتەوە: حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَام) فەرمووی خۆشەویستی دنیا و ئاخیرەت لە دڵی ئیمانداردا کۆ نابێتەوە، هەروەکو چۆن ئاگر و ئاو لە جامێکدا بەیەکەوە کۆ نابنەوە.

(عیسا) فەرمووی بە قوتابیەکانی: بە ڕاستی شەیتان لەگەڵ دنیادایە، فێڵی لە پارەدایە، خۆ پاکڕاگرتنی لە هەواو ئارەزوودانە، ئارامگری لە شەهوەت دایە. [28]

لەناو خەڵکدا کۆ دەبووە نانی دەبەخشی پێیان و خزمەتی دەکردن، ژنێک لە حەزرەتی (عیسا)ی بینی بەو جۆرە خزمەت دەکات، وتی: خۆزگەم بەو خاک و خۆڵەی بەسەریدا دەڕژێت، خۆزگەم بەو باوەشەی تۆی هەڵگرتووە، خۆزگەم بەو سنگەی تێر شیر کردووە، ئینجا حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَام) وەڵامی دایەوە فەرمووی: خۆزگەم بەو کەسەی کە لای خواو پەرتوکەکەی دەخوێنێتەوە و شوێنی دەکەوێت، هەروەها فەرمووی: خۆزگەم بەو چاوەی کە دەخەوێت و هیچ تاوانێکی ئەنجام نەداوە، خۆزگەم بەو نەفسەی کە ڕۆژانە چاودێری خۆی دەکات تا تاوانێک ئەنجام نەدات. [29]

هەروەها فەرمووی: کار بۆ خوای پەروەردگار بکەن نەک بۆ ورگتان یاخود سکتان، باڵندە لە ئاسماندا دەگەڕێت و خوای گەورە لەسەر زەوی ڕزق و ڕۆزی ئەدات، نە تۆ دەچێنێت و نە دروێنەش دەکات، بەڵام خوای گەورە لە بیری ناکات، پاشان فەرمووی: دەزانم ئێستا ئێوە دەڵێن ئاخر سامان گەورەیە تەماشای ئەو مانگا و گوێرەکە و گوێدرێژانە بکەن لە ئێوە سکیان گەورەترە، نە تۆ دەچێنێت نە دروێنە دەکەن، شەوڕۆژ دەکەنەوە، خوای گەورە ڕزقیان ئەدات، جا لە شوێنەکەت و بە گەورە ڕاگرتنی دنیاوە مەبن، چونکە لای خوای پەروەردگار پیسە. [30]

کاتێک بە لای مەعبەدی جوولەکەکان تێپەڕین زۆر بە جوانی دروست کرابوو وتیان: ئەی مەسیحی خوای پەروەردگار تەماشای ئەو معبدە بکەن، چەندە جوانە جەنابیان فەرموویان: دەزانم دەزانم، بەڵام بە ڕاستی پێتان دەڵێم خوای گەورە دیوار و بەردی ئەو مزگەوتە تێکو پێک ئەدات لەبەر تاوانی مرۆڤەکانی ناوی، خوای موتەعال پێوانە لەسەر ئاڵتون زیو ناکات، هەروەها بەو بەرد و نەخشەسازیەی کە لاتان جێگای سەر سوڕمانە، خوای گەورە زۆر لای خۆشەویسترە

---

28- ابن عساکر، تأریخ دمشق.

29- هەمان سەرچاوەی پێشووتر.

30- هەمان سەرچاوەی پێشووتر.

کە چاکەخواز بێت و زەوی بە چاکە ئاوەدان بکاتەوە، ئەگەر ئەو دڵانە نەبوون لەسەر زەوی، خوای پەروەردگار وێرانی دەکات.[31]

ئینجا ڕووی کردە قوتابییەکانی فەرمووی گەنجینەکانتان بنێرن بۆ ئاسمان با لەسەر زەوی نەبێت، بەڕاستی دڵی مرۆڤ گەنجینەکەیەتی، بەردەوام بوو لە فێرکاری و دەیفەرموو: هەر کەس فێربێت و خەڵکی فێربکات و کاری پێ بکات، ئەوا لە مەلەکوتی خودا زۆر بە گەورە بانگ دەکرێت. [32]

ڕۆژێک (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) شوانی بەرازی بینی، بە شوانەکەی فەرموو: گەوهەر و مرواری مەکە بە بەرازەوە چونکە سوودی نییە و ناتوانێت کاری پێکبات، واتا (خۆی پێ جوان بکات بەراز هەر بەرازە).

لە پاشاندا ڕووی کردە خەڵکەکەی و فەرمووی: حیکمەت مەدەن بە کەسێک کە کاری پێناکات و نایەوێت، چونکە زۆر لەو گەوهەر و مروارییە گرانبەهاترە، ئەو کەسەش کە نایەوێت زۆر لە بەراز خراپترە.[33]

پاشان کە ڕووی کردە زاناکانی گەلی ئیسرائیل پێی دەفەرموون: ئەی زانا خراپەکارەکان دنیاتان خستۆتە سەر سەرتان و قیامەتیش لە ژێرپێتاندا، وتەکانتان شیفایە بۆ خەڵکی بەڵام کردارتان ژەهر و دەروون نەخۆشییە، ئەی زانا خراپەکارەکان ئێوە وەکو داری (الدفلي) وان، کە خەڵکی ئەتانبینێت سەرسامە پێتان، کە لە بەرهەمەکەتان و بەروبوومتان کوشندەیە ئەوەی لێی بخوات دەیکوژێت.[34]

بەم بانگەوازەوە دەگەڕا لە نێوانی بەیت لەحم و قودس و ناصرە، واتا بە شێوەیەکی بازنەی لەو شار بۆ ئەو شار ڕێنمایی گەلی ئیسرائیل و گەلانی تری دەکرد.

ڕۆژێک لەسەر دەریا یان دەریاچەی طەبەریە یاخود ڕووباری ئەردەن، هەموو لەناو بەلەمێک بوون بەڵام حەزرەتی (عیسا)ش بە پێ موبارەکەکانی لەسەر ئاوەکە وەستابوو، قوتابییەکانی فەرموویان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمەش دەتوانین وەکو تۆ بکەین؟

حەزرەتی (عیسا) فەرمووی بەڵێ بەدڵنیاییەوە ئەگەر باوەڕتان هەبێت بە خوا و دڵسۆزی بیپەرستن، هەموو وتیان: بەڵێ بڕوامان پێیەتی، قوتابییەکانی چوونە سەر ئاوەکە و ماوەک لەسەر

---

[31]- ابن عساكر، تأريخ دمشق.

[32] رواه البيهقي في الشعب.

[33]- تأريخ دمشق، إبن عساكر.

[34]- درەختی دفلی جۆرێکە لە داری ژەهراوی و گەڵاکەی کوشندە و تاڵە.

ئاوەکەدا وەستان، پاشان شەپۆلێک هات هەموو کەوتنە ناو ئاو نغرۆ بوون، دوای ئەوەی کە بە مەلە کردن چوونە ناو بەلەمەکەیان، حەزرەتی (عیسا) فەرمووی لە چی ترسان؟

ئەوانیش وتیان: شەپۆلی ئاوەکە، حەزرەتی (عیسا) فەرمووی: ئەگەر لە خوای شەپۆلی ئاوەکە بترسانایە نە دەکەوتنە ناو ئاوەکە.[35]

کاتێک کە باسی مردنی دەکرد حەزرەتی (عیسا) لە ترساندا عارەق بەهەموو پێستیدا دەهاتە خوار (دەشێت مەبەستی قیامەت بێت).

کەسایەتییەکی ڕۆح سوک و لەخۆبردوو، خاوەن حیکمەت و پڕ زانیاری، هەرگیز خۆی بە گەورە نەزانیوە، سواری ئەسپ نەبووە و بە گوێدرێژ گەڕاوە، هاوکاری هاوڕێکانی بووە، پارەی لە گیرفاندا نەبووە، بۆ پێداویستی زانستی بەخشیوە و هەرگیز جنێوی نەداوە بە نەیارەکانی، بەڵکو بە لۆژیک و ئەقڵانی تەواوی وەڵامی داونەتەوە، لەناو خەڵکی بەو هۆکارە و هۆکاری ڕاستگۆیی و خواناسی زۆر خۆشەویست بووە.

دەگێڕنەوە جارێک بەلای مەعبەدی جوولەکەدا دەڕوات ئەوانیش تانەو تەشەری لێ ئەدەن، بانگی لێ دەکەن کوڕی زیناکارەکە!

(عیسا)ش بەوپەڕی ڕێزەوە وەڵامیان ئەداتەوە، تەنانەت قوتابییەکانی زۆر پەست و بێتاقەت دەبن لە جوان وەڵام دانەوەی حەزرەتی (عیسا) بەرانبەر یەهودییەکان، ئەویش دەفەرموێت: مرۆڤ چی پێ بێت ئەوە سەرف دەکات، دەکرێ سەگ گازت لێ بگرێ و گاز لە سەگەکە بگریتەوە؟

پاشان حەزرەتی (عیسا) فەرمانی کرد بە حەوارییەکانی کە ماوەی مانگێک بەڕۆژ ون بن، ئەوانیش مانگەکە  بەڕۆژووو بوون و دوای ئەوە چوونە لای حەزرەتی (عیسا)، داوای سفرو خوانێکی بەهەشتیان کرد، یاخود خواردنێک لە ئاسمانەوە بۆیان دابەزێت، بۆ ئەوەی دڵنیا بن کە خوای گەورە ڕۆژوووەکەی قبوڵ کردوون، هەروەها بێتە ڕۆژی جەژنیان، هەژارانیان دەوڵەمەند بێت.

حەزرەتی (عیسا) سەرزەنشتی کردن کە خوا تاقی نەکەنەوە، بەڵام ئەوان زیاتر لەسەری جەختیان کردەوە ناچار حەزرەتی (عیسا) داوای کرد لە پەروەردگاری کە سفرە و خوانێکیان بۆ

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[35]- إبن عساكر، تأريخ دمشق.

بنێرێت، خوای گەورەش پەیوەستی کردووە بەوەی کە خراپەی کرد، ئازار و ئەشکەنجەیەکی ئەدات کە هاوشێوەی نەبێت.[36]

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۖ قَالَ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ ٱلشَّـٰهِدِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةً مِّنكَ ۖ وَٱرْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّى مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ ۖ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّىٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾﴾
المائدة

واتە: ئەم حەواریانە قوتابیانی (عیسا)- صلى الله عليه وسلم - کە گومانیان نەبووە لە خوای گەورە چۆن ئیبراهیم فەرمووی:خوایە نیشانم بدە چۆن مردووو زیندووو ئەکەیتەوە بۆ ئەوەی دڵی ئارام بێ؟ ئەمانیش بۆ دڵئارامی و دڵنەوایی  لەبەر ئەوەی کە برسی بوون و خواردنیشیان نەبوو وتیان: ئەی (عیسا)ی کوڕی مەریەم- صلى الله عليه وسلم - ئایا پەروەردگارت ئەتوانێ سفرەو خوانێکمان لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێنێ کە لێی بخۆین برسیەتیمان نەهێلێت ئەویش فەرمووی :تەقوای خوای گەورە بکەن و واز لەو پرسیارەو هاوشێوەی ئەمانە بێنن، ئەگەر ئێوە بەڕاستگۆیی ئیمانتان هێناوە و ئیمانداری ڕاستگۆن﴿١١٢﴾ وتیان: ئەی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئێمە ئەمانەوێ لێی بخۆین و پێویستمانە تا دڵئارام بین و بەچاوی خۆمان توانا و دەسەڵاتی خوای گەورە ببینین بگەینە یەقین و ئیمانمان زیاد بکات کە تۆ ڕاستگۆ بوویت لەگەڵمان لە پێغەمبەرایەتییەکەت تا شایەتیش بین لەسەری بۆ بەنی ئیسرائیل، یان بۆ تێکڕای خەڵکی﴿١١٣﴾ (عیسا)ی کوڕی مەریەم فەرمووی: ئەی پەروەردگار خوانێکمان لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێنە تا ببێتە جەژنێك بۆ ئێمەو ئەوانەی دوای ئێمەش و ئەو ڕۆژە بکەین بە جەژن، ببێتە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەسەر تواناو دەسەڵاتی تۆ ڕزق و ڕۆزیمان بدە هەر تۆ باشترین ڕۆزی دەری﴿١١٤﴾ خوای گەورە فەرمووی: من ئەو خواردن و سفرەیەتان بۆ دائەبەزێنم، بەڵام هەر کەسێك لە ئێوە لە دوای ئەوە کوفر بکات، ئەوە من سزایەکی ئەدەم کە سزای هیچ کەسێکم لە جیهانی سەردەمی خۆتاندا بەو شێوازە نەدابێ﴿١١٥﴾[37]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[36]- ئیبن جەریری طەبەری لە موجاهید و حەسەنی کوڕێ حەسەنی بەصری هێناویەتی کە حەوارییەکان پەشیمان بوونەتەوە لە داواکەیان و خوای گەورەش بۆی نەناردوون، هەر بۆیە لە کتیبەکاندا هیچ باسێکی ئەو سفرە و خوانە نەکراوە.

[37]- موجاهیدو حەسەنی بەصری دەفەرموون: خوای گەورە بۆی دانەبەزاندن، بەڵام (جمهورو ابن جرير و ابن كثير) دەفەرموون: خوای گەورە بۆی دابەزاندن، (ابن عباس) ئەفەرمووێ: خوای گەورە لە ئاسمانەوە سفرەو خوانێکی بۆیان دابەزاند کە ماسی و نانی لەسەر بوو و لە هەر شوێنێکەوە لێیان بخواردایە پڕ بوو لەسەری.

خوای پەروەردگار سورەتی المائدة-ی بەهۆکاری ئەو ڕووداوە ناوناوە.

## مژدەدانی ئینجیل و تەورات بە هاتنی محمد ﷺ

حەزرەتی (عیسا) دوای سێ ساڵ لە بانگەواز کردن ئاگاداری کردنەوە کە (عیسا)-ی کوڕی مەریەم کۆتا پێغەمبەری گەلی ئیسرائیلە، بەدوای ئەودا کەسی تر نایەت تا بانگەوازی گەلی ئیسرائیل بکات، بەڵام مژدەتان دەدەمێ بە پێغەمبەری کۆتا زەمان کەناوی (احمد)ە، ناوی بە (أحمد، محمد، محمود) هاتووە کە هەرسێ ناوەکە بە مانای سوپاسکراو دێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ۝٦ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٧ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ۝٨﴾ الصف

واتە: کاتێك کە (عیسا)ی کوڕی مەریەم فەرمووی: ئەی بەنی ئیسرائیل من پێغەمبەری خوای گەورەم، خوای گەورە بۆ لای ئێوەی ناردووم، ئەو ئینجیلەی کە بۆم هاتووە بەڕاستدانەری تەوراتە کە لە پێش مندا بۆ (موسا) هاتووە و مژدەی ناردنی منی تیادا بووە، منیش لە ئینجیلدا موژدەتان پێ ئەدەم بە پێغەمبەرێك کە لە دوای من دێت کە ناوی ئەحمەدە،[38] کاتێك کە (عیسا) پێغەمبەر موعجیزە و بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای بۆ هێنان باوەڕیان پێ نەکرد و وتیان: ئەمە جادوویەکی زۆر ئاشکرایە و جادوومان لێکراوە، یاخود وتراوە: کە پێغەمبەری خوا هات بەویان وتووە ئەمە جادووگەرە۝٦ کێ لەو کەسە ستەمکارترە، واتە: هیچ کەسێك لەو کەسە ستەمکارتر نییە کە درۆ بۆ خوای گەورە هەڵئەبەستێ و بەناوی خوای گەورە و دینەکەی قسە ئەکات و بانگەشەی ئیسلام ئەکات و خۆی ئەداتە پاڵ ئیسلام، خوای گەورە هیدایەتی ئەو کەسە ستەمکارانە نادات کە ئەمە حاڵیانە۝٧ ئەیانەوێ بە فووی دەمیان نوور و ڕووناکی خوای گەورە بکوژێننەوە کە دینەکەی خوای گەورەیە، خوای گەورە نوور و دینەکەی خۆی ئەگەیەنێت و بڵاوی ئەکاتەوە لە هەموو شوێنێکدا با کافرانیش پێیان ناخۆش بێ۝٨

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[38] ئەحمەدو محەمەد ناوی پێغەمبەری خوان ﷺ ، واتە: ئەو کەسەی کە حەمدو سوپاس ئەکرێ لەلایەن خەڵکیەوە.

عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَـٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَـٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ الأعراف

واتە: ئەو کەسانەی کە شوێن ئەو پێغەمبەرە ئەکەون کە ڕەسول و نەبی بووە، نێردراوی خوای گەورە بووە (الْأُمِّيَّ) بووە واتە: نەخوێندەوار بووە و بۆ لای قەومێکی نەخوێندەوار نێردراوە کە عەرەب بوونە، کە جوولەکە و گاورەکانیش لە لای خۆیان سیفەتی ئەو پێغەمبەرە کە محمد -صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- ئەبینن و نووسراوە ئەو پێغەمبەرە فەرمانیان پێ ئەکات بە هەموو کارێکی چاك، کە چاکترینیان پەرستنی خوای گەورەیە بە تاك و تەنها قەدەغە و ڕێگرییان لێ ئەکات لە هەموو کارێکی خراپ، کە خراپترینیان هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوای گەورە. هەموو شتێکی پاك و بەتام و چێژو بەلەزەتیان بۆ حەڵاڵ ئەکات، بەتایبەتی ئەوەی کە بەنی ئیسرائیل کاتی خۆی لە خۆیانیان حەرام کردبوو، هەموو شتێکی پیسیان لێ حەرام ئەکات ئەو بارە گرانانەی کە خۆیان خستبوویانە سەرشانی خۆیان ئەم هەموو ئەو بارە قورسانەیان لەسەرشان لائەدات ئەو کۆت و زنجیرانەی کە پێیانەوە بوو کە باری قورسیان خستبووە سەرشانی خۆیان بەبێ ئەوەی بەرژەوەندییەکی تیادا بێت، ئەم پێغەمبەرە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەموو ئەو شتانەیان لەسەر لائەدا، جا ئەو کەسانەی کە ئیمانی پێ بێنن لە بەنی ئیسرائیل لە غەیری ئەوانیش، وە بەگەورەی بزانن و ڕێزی لێ بگرن و سەری بخەن شوێن ئەو نوور و ڕووناکییە بکەون کە لەگەڵیدا دابەزیوە کە قورئانی پیرۆزە، ئا ئەمانە کە ئەم سیفەتانەیان تیا بێت ئەمانە سەرکەوتوو و سەرفرازن لە دونیاو قیامەتدا﴿١٥٧﴾

ئەم دوو ئایینە پەیامی حەقیقیی و ڕاستییە کە لە ئاسمانەوە هاتوە بۆ دوو پێغەمبەر کە (موسا) و (عیسا) سەلامی خوایان لێبێت، دەمانەوێت سۆراخێك بکەین یان گەشتێك بە ناو دەقەکاندا و ناوەڕۆکی ئایینەکەیان بپشکنین.

گومانیشی تێدا نییە هەموو ئایینەکان دیارە مەبەستمان ئەو ئایینانەیە کە لە ناو قورئاندا بانگێشتی بۆ کراوە، هەمووی حەقیقەتن لە یەك ڕیشە و سەرچاوەوە هەڵقوڵاون.

یان تەنها جیاوازییان لە هەندێ ئەحکام و یاساو ئەرکی سەرشان و ڕێکخستنی ژیان و مرۆڤایەتی دا هەیە.

باشترین بەڵگەش بۆ ئەم قسەیەمان گەواهی دانی پاشای حەبەشەی مەسیحیەکانتان بیر دەخەینەوە، کە کاتێك موسوڵمانەکان کۆچیان کرد بۆ ئەو جێگایە، یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی بۆ خوێندەوە، ئەویش ئەم شاهیدییەی دا وتی ئەوەی کە گوێ بیستی بووم لە قورئاندا هاتووە ئەمە ئەوەیە کە (عیسا) هێناویەتی و لە یەك سەرچاوە دەردەچن.

گومانیشی تێدا نییە هەر لە ئادەمەوە تا خاتەم هەموو پەیامبەران بەتایبەت ئەوانەی کە خاوەنی پەیامی گەورە بوون. مەبەستمان لە پەیامی گەورە واتا خاوەنی پەرتوکی ئاسمانی بوون و ڕێگەیان بۆ پێغەمبەرانی دوای خۆیان خۆش کردووە تاکو ڕەوتی هیدایەت و ڕێنوێنی بۆ مرۆڤایەتی ببەستنەوە.

لە مرۆڤەوە بۆ خوای گەورە واتا ئیشی هەموو پەیامبەرەکان ناساندنی پەیامبەری دوای خۆیان بووە.

کە تا بنچینەکانی پەیامبەری داهاتوو لە کۆمەڵگەدا بە خەڵکی داهاتوو بناسێنێت و ئامادە بکرێن بۆ پەرستش دیارە پەرستشی خوای پاك و تەنها.

ئەم وشانەی کە دامان بە گوێی ئێوەدا دەبێ وا دەربکەوێت و بیسەلمێنین بۆ ئێوە لە تەورات و ئینجیل دا ڕێ خۆشکەر بووە بۆ پەیامی ئیسلام، ئایا هیچ باسێك کراوە کە ئیسلام دوا پەیامە و محمد ﷺ-یش دوا پێغەمبەرە.

پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێك دەبێت ئەم پرسیارانە لە ئەستۆ بگرێ و بە دوای ڕاستییەکاندا بگەڕێت، ئەگەر کەسێکی دیندار بوو وەك ئەرکێکی قیامەتی، ئەگەر کەسێکی خۆ بەڕۆشنبیر زانە بۆ دەوڵەمەندکردنی زانیاریەکانی خۆی با لەلای بمێنێتەوە، تاچەندە ئەم زانیارییانەی ئێمە ڕاستە، زیاتر مەبەستمان لەوەیە کە هەموو مرۆڤێك بەرپرسە لە چارەنووس و بەدیهێنانی بەختەوەری و کامەرانی بۆ خۆی، ئەمە لە ڕووە ئەبیستمۆلۆژیەکەوە واتا ژێرخانە مەعریفییەکان.

لەوانەیە پرسیارەکە بە دیوێکی تردا وا لێبکەین کە ئەگەر هیچ کەسێك خاوەنی زانیاری نەبێت لەسەر هەر بیرو بۆچوون و یاخود ئایین و ئایدۆلۆژیا و یان فکر و مەنهەجێك زۆر عەیبە کە دوای بکەوێت، یان ئەگەر زانیاری لەسەر نەبێت قسەشی لەسەر بکات، ئێمە دەزانین کە ئەمڕۆ سێ ئایینی گەورەی خودایی لە بەردەستماندایە.

یەکەم: ئایینی یەهودی کە پغەمبەرەکەی (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بووە ئێستا کەسانێك پەیڕوی ناکەن جگە لە پاش ماوەکانی گەلی ئیسرائیل نەبێت کە سەرجەم ژمارەیان لە جیهاندا ناگاتە (٢٠)ملیۆن کەس، چونکە جوولەکەکان کردوویانەتە ئایینێکی نەتەوایەتی و ناسیۆنالیستی کە سەر بە ئیسرائیلن، واتا لە نەوەی (یعقوب)ن گومانیشی تێدا نییە لە ڕووی فکرەوە دینێکی دەمارگیرییە و دەرگا لەسەرخۆ داخستنە.

دەمارگیری و دابڕان دەڕوێنێ لە ناو خەڵکیدا و خەڵکی فێری دوژمنایەتی دەکات، ئەم ئایینەی کە بۆ (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) هاتووە و پەیامەکەی تەورات-ە دەقەکانی هەڵشێوێنراون بەسەر یەکتریدا.

چونکە ئەو پەیامەی کە لە تەوراتی ڕاستیدا هاتوە ئەو پەیامە نییە کە ئێستا لەم تەوراتەدا هەیە، پاشان باسی دەستکاری کردن و دەقەکانی یەك بە یەك دەکەین ئەمە تەنها سەرەتایەك بوو بۆ چوونە ناو ئایینی یەهودییەتەوە.

دووەم: ئایینی مەسیحی، ئەم ئایینەش لە پاش مەسیح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دووچاری گۆڕین و دەستکاری و شێواندن بوو لێکۆڵەرەوان لە کاروباری مەسیحی دا خۆیان دانیان بەم ڕاستییەدا ناوە، خۆیان ئەو ئەنجامە خەتەرناکەیان بڵاوکردۆتەوە کە دەڵێن گوایە ئەو بۆچوونانەی کە لە ئایینی مەسیحی دا هەیە بۆچونەکانی باوکە (پۆڵس)ە.

پێمان باشە مێژوویەکی (پۆڵس)باس بکەین کە کێیە و لە کوێوە سەرچاوەی گرتوە؟

دیارە کە (پۆڵس) ناوی (شائول)ە لە ڕەگەز و نەژادی ڕۆمانیە لە ڕەچەڵەکدا، لە قودس خویندویەتی لەسەر ئایینی یەهودی پەروەردە و گەورە بووە. لە ناو خەڵکیشدا بە کابرایەکی باوك دۆست و نیشتمان پەروەر ناسرابوو نەسرانییەکانی دەچەوساندەوە لەو سەردەمەدا.

پۆڵس خۆی یەکێك بوو لەوانەی شایەدی بەرد بارانکردنی (ئیستفانۆس) بوو، خۆشی بەشدار بوو لەو کاتەدا.

ئیستفانۆس لەلای نەسرانییەکان بە شەهیدی یەکەم و پیاوێکی گەورە دەناسرێت، لە ساڵی (٣٠)ی زاییندا لە لایەن ڕۆماوە داوای لێکرابوو کە بچێت بۆ دیمەشق بۆ بەرەنگاری کردنی مەسیحیەت، بەڵام دواتر وای

بڵاو کردەوە کە مەسیح هاتۆتە لای و کاتێك کە چووە بۆ دیمەشق، گوایە مەسیح پێی وتوە بۆ دەمانچەوسێنیتەوە ئەویش لە دیتنی ئەو نورەی مەسیح سێ ڕۆژ کوێر بووە و پاشان چۆتە ناو دیمەشق و لەوێ چاوی کراوەتەوە ئیتر لەو سەردەمەوە چاو و دڵی کەوتۆتە کار و دەست بەکار بووە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی.

بەڵام لە ڕاستیدا مێژوونووسان دەڵێن کە ئەمە فێڵ بووە بۆ ئەوەی دەستوور و ئەحکامەکان بگۆڕێت و بە بیر و بۆچوون و داهێنانێکی نوێ بیاننووسێتەوە کە ئەویش بریتییە لە بیری سێگانە (سێ خوایی) (الثالوث).

گومان لەوەدا نییە کە ئێمەی موسوڵمان هەردوو پەیامە ئاسمانییەکە بە نێردراوی خوای گەورەی دەزانین و گومانیشمان لەوەدا نییە کە دەستکاری کراوە، کاتێك کە سەیری چەمك و دەقەکان دەکەین لە هەردوو کتێبەکەدا تێگەیشتنێکی وشك و زشت و شێواوی پێوە دیارە، بە هیچ جۆرێك بیری ئیمان و باوەڕ ناتوانێت تەعبیر لە بانگەوازی پەیامی ئەو پێغەمبەرە ناکات، جا بۆ زیاتر باسکردنی ئەم باس و بابەتە با سۆراخێك بە ناو تەورات و ئینجیلی ئەمڕۆدا بکەین

بە باشی سەرنجیان بدەین و لێیان بکۆڵینەوە تا بزانین بەرجەستە ترین و زەقترین نیشانەکانی گۆڕین و دەستکاریەکی ڕوون و ئاشکرای پەیامی مەسیحی لەوەدا دەردەکەوێت کە یەك ئینجیل هاتۆتە خوارەوە بۆ عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) کەچی ئێستا بە چوار ئینجیل ناسراوە و بەناوبانگە، سەرباری بەکار هێنانی دەیان ئینجیلي دیکەش هەمووی لافی ئەوە دەدەن کە ئینجیلی ئەوان سرووشتێکی خواییە، لە کاتێکیشدا کە هەموو ئینجیلەکان لە ڕووی گیان و ئایدیا و بیرو بۆچوونەوە هاتۆتە خوارەوە بۆ عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بۆیە دەپرسین کە ئەم ئایینە ئایینێکی لۆژیك نییە، دەکرێ بپرسین لە مەسیحیەکان ئەم دوو ئینجیل-ە لە کوێوە هاتوون؟ هەموشی بیری سێگانە دەخاتە ڕوو واتا باوك و دایك و ڕۆحێکی پاك کە لە ڕاستیشدا پێغەمبەر عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بانگەوازی بۆ یەکتاپەرستی کردووە.

ئەگەر سەرنجی چەند دەقێکیش بەین، ئەگەرچی گۆڕانکاریشیان پێوە دیارە دان بە یەکتاپەرستندا دەنێت لەوانەیە کە لە (یوحەنا)دا ڕیوایەت کراوە کە دەڵێت:

{ ژیانی هەتا هەتایی ئەو ژیانەیە کە بتانناسن بەوەی تەنها تۆی خوای حەقیقی و ڕاستەقینە، یەسوعی مەسیحیش هەر تۆ ناردوتە} ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە خوا تاك و تەنهایە و مەسیحیش فرستادەی خوایە هەروەها (مەرقەص) لە بەشی دوانزەیەمی ئینجیلەکەی خۆیدا هەمان شایەدی یەکتاپەرستی لەچەند جێگایەکدا دەدات، دەڵێت: {یەکێك لە هۆشمەند و نووسەرەکان لە یەسوعی پرسی دەربارەی یەکەم وەسیەت و ڕاپرسی، ئەویش وەڵامی دایەوە، وتی یەکەم وەسیەت و ڕاپرسی ئەی گەلی ئیسرائیل گوێ بگرە پەروەردگار خوای ئێمەیە ئەویش یەك خوا و پەروەردگارە، نووسەرەکە پاشان پرسی وتی ئەی مامۆستا؟ کەواتە ئەویش یەکێکە و جگە لەویش یەکێکی ترنییە کاتێك یەسوع بینی کە ئەو بە ئەقڵ وەڵامی دەداتەوە وتی تۆ لە فریشتەکانی ئاسمان دوور نیت}، بەڵام ئایدیای شێواو و دەستکاری کراوی پۆڵس هەموو چەمك و مەفهوم و حەقیقەتی یەکتاپەرستیی سڕییەوە پاشماوەی یەهودی خستە ناو واتا ئایدیای سێگانە ( سێ خوایی) خستە ناو.

ئەو بەڵگە ڕونانەی کە نیشانەی دەست هەڵبەست و گۆڕینی ئایینی مەسیحی و یەهودین، بریتین لەم بەڵگانە:

یەکەم: لە ناوبردنی بیری یەکتاپەرستی، هێنانە کایەی بیری بتپەرستی وەك شیرك و هاوەڵدانان بۆ خوای گەورە لە هەمووی نەگبەتی تر جەستەدارکردنی خوا، واتا خوا موجەسەم بکرێت لەوەش ماڵوێران تر کە (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بکرێت بە خوا یان کوڕی خوا.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەگەر جوان لە ئایینی مەسیحی، ورد بینەوە کوتومت لێکچونە لەگەڵ بتپەرستی باوی سەردەمی ڕۆمەکان. کە لە ڕاستیدا ڕووی بێگەرد و درەخشانی ئینجیلیان شێواند هەرچی بیری زشت و شێوا و بەناو ئایدیایەکی نوێ خرایە ناو ئینجیلەوە، کە

هەمووی دەقی نامۆ و دوور لە ڕاستی نیشان دەدات کە دووره لە بێگەردی ئینجیلی ڕاستەقینە، لای هەمووشتان ئاشکرایە لە هەر سەردەمێکدا ڕاهیبێك و قەشەیەك بە ئارەزووی خۆی نوسیویەتییەوە، بەکار کردنە سەر ئەو شارستانیەتیانەی لە سەریان بووە ئەگەر سەرنجی ئایینی مەسیحی بدرێت هەر لە کاتۆلیك و پرۆتستانت و ئۆرتۆدۆکس لێکچووی ئایینی ئەقدومییەکانە، ئایینی کریشنا یان ئایینی هیگنی کە ئەم ئایینانە دەگەڕێتەوە بۆ ئایینی یەك بوونی باوك و کوڕ کە سەرچاوەکەی ئایینی کۆنی بەرهەمییە کە لە شارستانی ڕۆمەکان سەرچاوەی گرتوە هەرچەندە دەڵێن کە ئەم ئایینانە لە هیندستان و وڵاتی پارسەوە هاتوون.

دووەم: بریتییە لەو بەڵگەیەی کە ئەم ئایینانە دەستکاری کراون کە ئێستا لە دەستی جوولەکە و گاورەکاندان، بەوەی کە پێغەمبەران بە خراپەکار و زیناکار و مەی خۆر و شەرواڵ پیس ناوزەد دەکەن کە لای هەمووان ئاشکرایە کە پێغەمبەران پاك و بێگەردن کە تەورات و ئینجیل شێوێندراون پڕن لەم چەشنە تانە و تەشەرانە. بۆ نمونە لە تەورات دا هاتووە لە باسی داستانی لوط پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-دا لەگەڵ دوو کچەکەی خۆیدا لە چیا لە بەشی نۆزدەیەمی سەفەری کە بریتیە لە ( پێکهاتن واتا التكوين) هاتووە کە [خوشکە گەورەکەی بە خوشکە بچووکەکەی وت خۆت دەزانی کە باوکمان پیر بووە لەم سەرزەویەشدا پیاوێك نییە بێتە لامان، واتا لەگەڵمان جووت بێت، وەرە با پێکەوە مەی دەرخواردی باوکمان بدەین و لەگەڵی جوت بین تا وەچەیەك لە باوکمان بخەینەوە کە دوو شەو مەییان دەرخواردی باوکیان دا و هەردوو کچەکەشی لەگەڵیا جووت بوون، هەردووکیان سکیان لە باوکیان پڕ بوو، گەورەکەیان کوڕێکی بوو لە باوکی ناوی نا (موئاب)، کە بە باوکی موئابییەکان ناسراوە و بچووکەکەشیان کوڕێکی بوو ناوی نا (بن عەمی) کە ئەویش بە باوکی بەنی عەمون ناسراوە]

هەروەها لە بەشی یازدەیەمی بابەتی (شمۆئیلی) دووەمدا هاتووە کە پێغەمبەر (داوود عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەگەڵ ژنەکەی (ئۆریای) موجاهیدی باوەڕدار کە لایەنگری خۆی بوو زینای لەگەڵدا کردووە دەڵێت: کاتێکیش کە ویستی خۆی لە ئۆریا ڕزگار بکات ناردی بۆ جەنگ لەبەرەی پێشەوە داینا و کوژرا، ئەویش دەستی گرت بەسەر ژنەکەیدا. هەروەها لە بەشی (٣٨)دا لە تەوراتی سەفەری پێك هاتن واتا تەوراتی (تكوين) هاتووە کە (یەهوزای کوڕی یەعقوب) زینای لەگەڵ ژنی کوڕەکەی خۆیدا کرد کە ناوی (سامار) بوو دەڵێت : [ژنەکە لە یەهوزا سکی پڕ بوو دوو کوڕی لێی بوو ناوی نان (فارص) و (زارح)]، جا ئینجیلی مەتا لە بەشی یەکەمدا کێشەکە لەوەدایە کە نەسەب و ڕەگەز و نەژادی یەسوعی مەسیح و سولەیمان پێغەمبەر و (داوود)ی باوکی سولەیمان سەلامی خوا لەهەموویان بێت، لە وەچەی (فارص) ناوزەند دەکات لە ئەنجامی زینای یەهوزا لەگەڵ ژنەکەی (سامار)ی کوڕی خۆیدا کردی، هەروەها بەشی یەکەمی کتێبی (هۆشەع )دا هاتووە کە یەکەم قسەی خوا کە کردی لەگەڵ هۆشەع دا: وتی بڕۆ بۆ خۆت بەزینا ئافرەتێك بدۆزەرەوە هەر بەزیناش چەند منداڵێکی لێبهێنە بەرهەم، چونکە هەموو زەوی

بوون بە زیناکار و وازیان لە خوا هێناوە، ئەویش چوو (جومرەی کچی ویلامی ) گرت و سەرنجام سکی پڕ کرد کە دوو کوڕی بوو بە ناشەرعی واتا بە زینا.

هەر لە بەشی سێیەم هاتووە کە هۆشەع دەڵێت: بە ئافرەتێکی تر لە بەنی ئیسرائیل بۆ زیناکاری بەکاربێهنە، هەروەها لە بەشی دووەمی ئینجیلی یوحەنادا هاتووە دەڵێت گوایە (عیسا عَلَيْهِ السَّلَام) چووە بۆ لای کوڕێك کە زەماوندی هەبووە، کوڕەکە مەی و شەرابی لێ بڕا و بوو ئەویش بە موعجیزەیەك شەش کوپ شەرابی هێنایە بەردەست.

لە بەشی یانزەیەمی ئینجیلی لوقادا هاتوە کە (عیسا عَلَيْهِ السَّلَام) مەیخۆرێکی زیادەڕەو بووە.

لە ڕاستیدا ئەم جۆرە وتانە هەڵبەستراوی خۆیانە و دوورە لە ڕوخساری پاکی ئینجیل و تەوراتەوە.

سێیەم: بریتیە لەوەی کە فەیلەسوفەکان یان بیرمەندەکان و مێژوونووسەکان لەبارەی ئایینەوە چۆن

دەدوێن یان پیاوانی ئایینی خۆیان، بۆ نموونە (نیچە) لەم بارەیەوە دەڵێت: لەمەڕ ئەو جیاوازییانەی کە لە نێوان ئایینی مەسیحی و هەڵبەستراوەکەی (پۆڵس)دا دەڵێت: بانگەوازی (عیسا) لە ڕاستی و جەوهەر و ناوەرۆك دا بانگەوازێکە بۆ سیستەم و هێز و دەسەڵات، بەڵام (پۆڵس)گۆڕی بۆ ئایینێك کە بۆتە لانەی ترسنۆك و تۆقیوەکان.

بەردەوام دەڵێت: پۆڵس بەوە ناوزەند دەکات ناوی لێناوە (باسکاڵی یەهودیەت)، چونکە بڕوای پۆڵس لەسەر بنەمای فرتو فێڵ و ئەفسانە ئایینە کۆنەکان دامەزراندوە.

کۆڵن وڵسن: ئەو لەسەر مەسیحیەت دەڵێت (عیسا) وتوێتی خۆت سەروەر و گەورەی خۆت بە، بەڵام بە جارێك پۆڵس ئەم بیرو باوەڕەی هەڵتەکاندوە و گۆڕیویەتی لەسەر بنەمای ڕاستی خۆی نەماوە، بۆیە نموونەی نامەکەی پۆڵس دێنێتەوە کە بۆ ڕۆمای ناردوە ئەم وتەیەی تێدا نووسیوە:

[با هەموو کەسێك سەر بۆ دەسەڵاتداران دابنەوێنێت، چونکە دەسەڵات نایەت تاخوا نەی نێرێت وە هەر کەس لە ڕووی دەسەڵاتداراندا بوەستێت کەواتە ئەو کەسە لە ڕووی دەسەڵاتی خوادا وەستاوە] ماوەتەوە بڵێین بیروباوەڕی ئێستای مەسیحیەت لە سەر بنەمای دەستوورەکانی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَام) دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر ئەو ئایدیا و بۆچوونە خورافییەی کە پۆڵس دایهێناوە.

لێرەدا جێگای خۆیەتی شتێکتان بیربخەینەوە کە ئازادیخوازان دەڵێن مەبەستی ئیسلاحی و ڕێفۆرمی پرۆتستانتی بەقازانجی بیری ئایینی مەسیحی بوو! بەڵام بەداخەوە لەڕاستیدا وانەبوو، بەڵکو بە قازانج و بەرژەوەندی مەسیحیەتی پۆڵس بوو.

جیگەی خۆیەتی مێژوونووسی بەناوبانگ (وێڵز) بە نموونە بێنمەوە کە لە کورتەی مێژووەکەیدا دەڵێت: مەسیح و ئەم بیرو باوەڕەی ئێستا، ئاسمان و ڕێسمان لەیەکەوە دوورن، بەڵام مەسیحییەت ئەمڕۆ بریتییە لەوەی کە پۆڵس دایهێناوە.

ئەویش کەلە ئەسکەندەریەی لاهوتی دەرسی خوێندووە، بۆیە کاریگەری دەستووری بتپەرستی میسرییەکانی لەسەر بووە کە ئایینەکەی ئەوان تێیدا هاتووە کە مرۆڤ دەبێت بتوێتەوە لە نێوان (باوك و کوڕ و گیانی پیرۆز)دا کە لە ئایینی میسرییەکاندا (ئیزیس و هۆرس و سیزاییس) لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەگەر سەرنجتان دابێت زۆربەی مەسیحییەکان لە شێوەی خاچێکدا ئەم دەقە لەسەر سنگ و نێو چاویان دەیخوێنن بە ناوی (باوك و دایك و گیانی پیرۆز).

چوارەم و کۆتایی: بریتیە لە دەسەڵاتی کڵێسا کە بەردەوام درێژەی داوە بە ناشیرینکردنی شێوەی مەسیحییەت تا ئەو ڕادەیەی وای لە خەڵکی ئەم ئایینە گەیاند بوو دەتوانن لە گوناهەکانیان خۆش بێت لەسەر ئەم زەویەدا، هەر لە زەویشەوە بەهەشتیان پێ بفرۆشێت ئەگەر چی خراپەکار و تاوانبار و سەرپێچییان ئەنجام دابێت، ئەویش بە کڕینی پسووڵەی بەرائەت یان بە نامەی لێبووردن پاك دەبوونەوە دیارە پاپاکان بەڵێنی لێبووردن و لێخۆش بوون و سڕینەوەی گوناهەکانیان تیایدا دیارە، هۆکارەکەشی وەرگرتنی چەند بەستەیەك پارە بوو، چونکە ئەوان خۆیان بە نوێنەری خوا دەزانن، ئەوان پیاوانی ئایینی بوون.

ئەمە نەك هەر دوورە لە ڕاستییەوە بەڵکو گاڵتە بازاڕییە بە ئاکارە بەرزەکانی مەسیحییەت.

هەر قەشە و پاپاکان بوون حەرامیان حەڵاڵ دەکرد یان بە پێچەوانەوە بە ئارەزووی خۆیان وشەی چاکیان دەبەخشی بە بەگزادە و سەروەتمەندەکان ئەم دەقانەش کە باسمان کرد لە ڕێگەی یەسوعەوە دەسەڵات دراوە بە پیاوانی ئایینی مەسیحییەت بۆ نمونە نامەیەکی سەدەی هەژدە کە لە دائیرەت و لمەعاریفی ئەوروپی دا نووسرا وە کە بۆ بەگزادەیەك لە بەگزادەکانی ئیتالیا نووسرا وە دەڵێت:

{ئەی فڵانی کوڕی فڵان یەسوعی پەروەردگارمان بەزەی بە تۆ بەخشی، ئەویش خۆی بە شایستە گەیشت بە ئێش و ئازارەکانی خۆی دا لە خاچ لەبەر تۆ، منیش ئەو دەسەڵات و نوێنەرایەتییەم پێ دراوە لە تەواوی گوناهەکانت خۆش بم، ئەو دەسەڵاتەش کڵێسا فەرزی کردووە و من خۆم دەتبوورم لە تەواوی گوناهەکانت و زیادە ڕەوییەکانت، ئەگەر چی تاوانەکانیشت گەورە بن و بەقەد دەریایەك بن ئەوە تۆمان پاك کردەوە لەلایەن پاپای باوکی پیرۆز و کورسی نوێنەرایەتیمان پێ بەخشیت.[39]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[39] هەرچی وشەی (رب) هەیە کراوە بە (الأب) لە ئینجیل دا.

ئەمەش مشتێك بوو لە خەروارێك لە سەر ئەو بنەمایانەی کە ئایینی یەهودی و مەسیحیەتی ئێستادا هاتوون.

کە ئەم دوو ئایینە کۆتایان پێ هاتووە و پێشتریش ئاماژەمان پێ کرد وتمان پێغەمبەران ڕێگایان بۆ پێغەمبەرانی دوای خۆیان خۆش کردووە بزانین لەم دوو ئایینەدا، دەردەکەوێت کە باسی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ کراوە لەم دوو ئایینەدا، دێینە سەر باسی ئەوە، ئەو دەقانە بێنین کە چۆن باس لەوە دەکەن، ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە هەموو ئایینەکان نەسخ بوونەتەوە و ئەوەی کە بێگەرد و بێ خەوشە تەنها ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، ئەویش لەسەر ئەم بنەمایانە بە چەند ئایەتێك لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا دەیسەلمێنین.

## هەڵوەشانەوە و تەواو کردن

﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ١٣٦﴾ البقرة

واتە: بڵێن: ئێمە بڕوامان هێناوە بەخوا و بەوەی وا بۆ ئێمە هاتۆتە خوار، بەوەی بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و ئەسباط هاتۆتە خوار، بەوەی وا بە (موسا) و (عیسا) دراوە، بەوەی کە پێغەمبەرانی تر لە پەروەردگاریانەوە پێیان گەیشتوە ئێمە جیاوازییەك لە نێوانیاندا دانانێین و ئێمە تەنها تەسلیمی فەرمانی خوای تاك و تەنهاین١٣٦

گومان لەوەدا نییە کە سەرجەم پەیامە یەزدانییەکان لەسەر یەك ڕێباز پێك دێن و یەك دەگرنەوە هەموو بەرەو یەك ئەنجامیش ملی ڕێگای ڕاستیان گرتووە، ئەویش ڕزگار کردنی مرۆڤایەتی و بەندایەتی تاکی مرۆڤە لە خواکانەوە بۆ خوای پاك و بێگەرد، ئەویش لە ڕێگەی بنەما باوەڕیەکانەوە کە پێغەمبەران مزگێنی و مژدەیان پێ داون یان بە گشتی فرستادە و نێردراوەکانی خوا بانگەوازیان بۆ کردووە.

هەروەك ئاماژەشمان پێ کرد ئا بەو جۆرە تەواوی پەیامەکان بەدوای یەکدا دەڕۆن و ڕێگە بۆ ئایینی دوای خۆی خۆش دەکات و سیستەم و یاسا و نەریتە بۆگەنەکان لەناو دەبات و لەهەر یەك بوون و فراماسیۆنێکی شارستانیەتیدا کە بێتە سەر ڕووی خاکەکەی، تا پرۆسەی بنیات و ڕووناکی تر بهێنێتە گۆڕێ تا ڕووناکی بیر و هزرو ڕۆح دابمەزرێنێت.

مەبەست لە تەواو کردن ئەوەیە کە مرۆڤایەتی کۆتا پەیامی خۆی وەربگرێت لە بەرز ترین و باڵاترین و پێش کەوتووترین شکڵ و قاڵب داڕێژراو بێت، بڕوای شارستانیەتی شیاو و شایستە بێت ئەویش کە مرۆڤەکان لەبەردەمیا دەستەوسان بن، ئەو پەیامەش کۆتا پەیامی مرۆڤایەتییە.

﴿... ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ...﴿٣﴾﴾ المائدة

واتە: ئەمڕۆ دینی ئێوەم کامل کرد نیعمەتی خۆمم لەسەر ئێوە تەواو کرد باشترین ئایینم بۆ ئێوە هەڵبژارد ئەو ئایینەش ئایینی پیرۆزی ئیسلامە﴿٣﴾

﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ آل عمران﴿١٩﴾﴾

واتە: ئایین لە لای خوای گەورە تەنها ئیسلامە﴿١٩﴾

﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴿٨٥﴾﴾ آل عمران

واتە: هەر کەسێك جگە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەر دین و ئایدۆلۆژیا و ئایینێکی تر هەڵبژێرێت و پەیڕەوی لێبکات، ئەوە ئەو کارەی لێوەرناگیرێ و لە دواڕۆژدا لە ڕیزی ڕەنجەڕۆ و زیان مەندەکانە﴿٨٥﴾

پەیامە یەزدانییەکان پرۆسەی گەشەکردنَ و تەواو کاریان لە داهێنانی تەشریعی و شارستانیەتی خۆیاندا لەڕێگای دوو ئاکارەوەیە.

یەکەم: ئاکاری سڕینەوە و هەڵوەشاندنەوەی حوکم: ئەویش بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی شەریعەتێکی پێشو تر و هێنانە کایەی جێگرێك کە بریتی بێت لە شەریعەتێکی پشتگیر، بۆ ئەوەی جێگای ئەوی تر بگرێتەوە بۆشاییەکان پڕ بکاتەوە کە بە گوێرەی سەردەم و کات گۆڕاوە.

﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَذُرِّيَّةٗۚ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأۡتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ لِكُلِّ أَجَلٖ كِتَابٞ ﴿٣٨﴾ يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴿٣٩﴾﴾ الرعد

واتە: لەڕاستیدا ئێمە بەر لە تۆ پێغەمبەرانێکمان نارد ژن و منداڵمان پێ دابوون هیچ پێغەمبەرێک نەبووە بەر لە تۆ نیشانەیەك ببینێت، مەگەر ڕێگەی لەلایەن خوای گەورەوە پێ درابێت بۆ هەر ڕۆژگارێك پەرتوکێکمان ناردوە ﴿٣٨﴾ هەرچی خوا بیەوێت لەناوی دەبات و هەرچی ئەو ئارەزوومەند بێت دەیهێڵێتەوە کۆڵەکەو کتێبی ئەسڵی بریتییە لە حەڵاڵ و حەرام یان یادی پەروەردگار﴿٣٩﴾

جا هەر بەو جۆرە شەریعەت و پەیامە ئاسمانییەکان بەگشتی کەوتوونەتە ژێر باری دیاردەی هەڵوەشاندنەوە مەبەست لە حوکم گۆڕینە، ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلامیش لەچوارچێوەی خۆیدا کەوتۆتە ژێر باری بنەمای تەواوکاری زاتی لە ئەحکامەکانیدا.

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەم دیاردە تەشریعییە تەواوکارییەی شەریعەتی ئیسلامی کردووە کە دەفەرموێت :

﴿۞مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ نُنسِهَا نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ أَوۡ مِثۡلِهَآۗ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١٠٦﴾ البقرة

واتە: ئەگەر ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان هەڵبوەشێنینەوە (نەسخ) بکەین یان لەبیری ببەینەوە ئەوا ئەو ئایەتە هەڵناوەشینینەوە، ئەگەر لەو چاکتر یان نموونەی ئەومان نەهێنابێتەوە، خوای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و هەر خۆی باڵا دەستە١٠٦

ئەمە مەبەست بە گەیشتنە فەرمانڕەوایەتی و حوکمڕانیەتییە و گەیشتنە بە بنەما یاساییەکان بۆ داڕشتنی بنەما تەشریعییەکان، چۆن مرۆڤەکان ئاڕاستە دەکات و جۆری ڕەفتار و پەیوەندییان پتەوتر دەکات.

دووەم: ئاکاری پەرەپێدان و گەشەکردن و درێژە کێشان لە ئەحکام و یاسا و تێگەیشتن لە چەمکەکاندا: بێگومان هەر پەیامێك کە لەلایەنی خوای گەورەوە بۆ مرۆڤایەتی هاتبێت لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیاندا بووە گومانیشی تێدا نییە خاوەنی بەرفراوانترین ئاسۆ بوون و سەرتاپا گشتگیرتر لە ڕێخستنی کۆمەڵگە بوون و چالاك کردنی مرۆڤ و باڵاترین لایەنە جۆراو جۆرەکانی سۆسیۆلۆژی و ئەنتۆنۆژیا و پڕ تواناترین پەیام بووە لە هەموو سەردەمەکاندا بەگوێرەی شارستانییەتەکان.

بەم پێیە ئەگەر لەسەر ئەم ڕێچکەیە وتوێژ بکەین درێژەی ڕەوتی خۆی داوە پەیامە ئاسمانییەکان تا دوا مەنزڵگای خۆی کە کۆتا پەیام پەیامی بێگەردی ئیسلامە کە بۆ حەزرەتی محمد ﷺ هاتووە کە قورئانی پیرۆز لە فەرمودەیەکی خۆیدا ئەم دیاردە شەرعییە یاسا داڕێژە داهێنانە لە پەیامەکەدا تۆمار کردووە و پەیوەندی نێوان بنەماکانی ڕوون کردۆتەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِۖ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ٤٨﴾ المائدة

واتە: ئەو کتێبە کە بریتییە لە قورئانی پیرۆز ناردویەتییە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر کە هەموو کتێبە ئاسمانییەکانی بە حەق زانیوە و شایەدی داوە بە حەق بۆ هەموویان و هەموویانی بەڕاست و دروستی پەرتوکە ئاسمانیەکانی دەرخستوە، کەوابوو تۆش ئەی پێغەمبەر لەناو ئەواندا (ئەهلی کیتاب) حوکم بەوە بکەن کە خوا ناردوویەتی، شوێن هەوا و ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە پەیڕەویان لێمەکە، ئەگەر داوایان لێکردی بۆ هەریەك لەو گەلانە شەریعەت و بەرنامە و پرۆگرامێکمان ناردووە و بەندایەتیشمان بۆ دیاری کردبوون (ئەگەر خوا بە ویستی ئەزەلی و بڕیاری ئەزەلی بیویستایە) ئەوە هەمووتانی دەکردە یەك ئوممەت و نەتەوە، بەڵام خوای گەورە ئەوکارەی نەکرد تا پێشبڕکێ لە ئاکاری خێروچاکەدا بکەن، چونکە گەڕانەوەی هەمووتان بۆلای خوایە و ئەو خوایە لەهەرشتێکدا کە ئێوە جیاوازیتان هەیە ئاگادارتان دەکاتەوە لە سزای ناکۆکییەکان و کارو کردەوە خراپەکانتان﴿٤٨﴾

## مژدەپێدانی پێغەمبەری خوا ﷺ

پاش ئەوەی بۆمان دەرکەوت کە سەردەمی دوو ئایینی یەهودی و مەسیحی لە ڕووی واقعیی، مێژووی کۆتایی هاتووە، ئەو کات پرۆسەی هەڵوەشانەوە و تەواو کردن دەبێتە کارێکی سروشتی لەبانگەوازی پەیامی خوایدا، دەبێت مرۆڤ پەنا بەرێتە بەر ئایینێکی تر تا ڕۆحی خۆی تێر بکات.

پوختەی باسەکەمان ئەوەیە کە کۆتایی هاتووە بە تەواوی یاسای تەشریعی و ئەحکام و هەموو بنەماکانی ئەو دوو ئایینە کە بەهیچ شێوەیەك کاری پێ ناکرێت، هەر ئەو دوو ئایینەش مژدەی تەواویان داوە بە هاتنی پێغەمبەر محمد ﷺ تا خەڵکی ئاگادار بێتەوە کە شوێن ئەو سەروەری مرۆڤایەتییە بکەون.

﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾﴾ البقرة

واتە: کاتێك کە قورئان لە لایەن خواوە هات بۆ پێغەمبەر لەگەڵ ئەوەدا کە پەیام و کتێبەکانی ئەوان ئەم قورئانەیان دەسەلماند، لەگەڵ ئەوەشدا پێش هاتن و چاوەڕوانی زاڵ بوون و سەرکەوتنیان دەکێشێت بەسەر کافر و خوا نەناسەکاندا بەهۆی دەرکەوتنی کۆتا پێغەمبەر، بەڵام کاتێك کە هات نیشانەی ئەو پێغەمبەرەیان ناسییەوە بڕوایان پێ نەهێنا دەك نەفرینی خوای گەورە لە کافر و بێباوەڕان بێت﴿٨٩﴾

﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾﴾

واتە: ئەی پێغەمبەر ئێوە لاتان وایە ئەو کەسانەی کە ئینکاری قورئان دەکەن، پێیان بڵێ ئێوە لاتان وایە چ کارێك لەسەر ئەوە دەکات کە ئەم قورئانە بڕوای پێ بێنن و لەلایەن خوای گەورەوە هاتووە، مادام کە ئێوە هەر بڕوای پێ ناهێنن لە کاتێکیشدا کە شاهێدێکی بەنی ئیسرائیلی (عبدللە کوڕی سەلام) شایەتی لەسەر حەقیقەتی ئەو قورئانە بدات و بڕوای پێ بێنێت، بەڵام ئێوە لووتبەرزی دەکەن جگە لەوەی کە بەدەستی خۆتان خۆتان ماڵ وێران دەکەن، بێگومان خوای گەورە کەسانی ستەمکار ڕینمونی ناکات﴿١٠﴾

ئەم ئایەتە لەسەر (عبدللە کوڕی سەلام) هاتە خوارێ کەسێك بوو لە بەنی ئیسرائیل پاشان موسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند بە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی لە جوولەکەکان بپرسە دەربارەی من بزانە چی بە تۆ دەڵێن؟ دیار بوو ئەو ئازیزە کە پرسی لە وەڵامدا وتیان: (عبدللەی کوڕی سەلام) لە هەمووومان زانا تر و دەمڕاستی هەموومانە و گەورە و پێشەوامانە و کەسێکی بەتوانایە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی لەو بپرسن کە سیفەت و وەسفەکانی من لە تەوراتدا بە ڕوونی و ئاشکرایی باس کراوە ئەوە بوو ئەویش شایەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ دا و ئیمانی خۆی ڕایگەیاند.

چەندەها ئایەتی تر هەیە کە باس لەوە دەکات کە لە تەورات و ئینجیلدا لە باسی پێغەمبەری خوا ﷺ کراوە.

با لێرەدا واز لە دەقە قورئانییەکان بهێنین تا نەڵێن موسوڵمانان بە قورئانەکەی خۆیان بەڵگە دێننەوە بۆ باسی پێغەمبەرەکەیان، بەڵکو بەڵگەی تەورات و ئینجیلی خۆیان بهێنینەوە یان وتووێژی زاناکانی خۆیان کە لێکۆڵینەوەکانیان لەبەرانبەر پێغەمبەری خوادا ﷺ کردووە.

پرۆفیسۆری زانای مەسیحی (دایڤید بنجامین کلدانی) لەبارەی پێغەمبەری خواوە دەڵێت: تەورات و ئینجیل دەربارەی هاتنی محمد ﷺ وا دەڵێت کە لە دەقە ئینجیلەکاندا هێناویەتی، جەخت لەسەر کەسایەتی ئەو پێغەمبەرە دەکات، مژدەی پێدراوە کە هەواڵێکی سروشتییە کە دەڵێت نوورێکی درەوشاوە نمونەی درەخشانی خۆر و نورێک لە( فاران)[40]ەوە هاتووە کە خۆی بریتیە لە (سارانی مەککە) و ئەم وشەیەش لە تەوراتدا هاتووە لە بەشی (٣٣)ی تەکوین کە لە ڕستەی دوای ئەو دەقە ئاوا نووسرا وە {پەروەردگار لە سیناوە هاتوو لە سەعیرەوە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

40- (فاران) بریتیە لە سارانی مەککە، ئاماژە کردنە بە جێگا و وڵاتی هاتنی پێغەمبەر ﷺ کە دەهەزار جەنگاوەری لە مەدینەوە هێنا بۆ گرتنی مەککە، هەروەك هەموومان ئاگامان لە داستانی گرتنی مەککە هەیە.

بۆیان هەڵهات و کاتێك لە چیای فارانەوە درەوشایەوە لەدەم کەلەکەیەوە، لەگەڵیدا دە هەزار پیاوی پیرۆز هاتن لەدەستی ڕاستی ئاگرێك بوو کە شەریعەتی تێدا بوو هەڵچوو بوو }.

جا نووری پەروەردگار تەشبیهی کردووە بە نووری خۆر، کە خۆر لە سیناوە هاتووە و لە سەعیرەوە بۆیان هەڵهاتوە، بەڵام نوورەکە لە ماجدی فارانەوە درەوشاوەتەوە کە پێویست بوو دەربکەوێت لەگەڵ دە هەزار پیاوی پیرۆزدا بەدەستی ڕاستی شەریعەتێکی بۆ هەڵگرتبوون.

لە ڕاستیدا لە هیچ سەردەم و کاتێکدا هیچ یەکێك لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل بە (عیسا)-یشەوە (عَلَيْهِ السَّلَامُ) هیچ پەیوەندییەکیان بە فارانەوە نەبووە و فارانیش شاخێکە لای مەککە.

بەڵکو هاجەر لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕیدا لە ناوچەی ساران-ی فاران-دا نیشتەجێ بوون!

هەروەها لە جێگایەکی تردا لە لاپەڕە (٣٣)دا لە وەحی (ئیسحاحی ئەشعیا) هاتووە کە لە ئیسحاحی (٢١)ئایەتی (١٣-١٧)دەڵێت: ئەم سروشە سرووشێکە کە لە تەڕەفی وڵاتی عەرەبەوە شەونخونیتان بۆ دەکات و کاروانی ڕاستیتان بۆ دەخاتە ڕێ، ئەی دانیشتوانی سەر زەوی کە دەزانن دەگاتە جێ هەریەکە بۆ خۆی بە نانەکەی دەستییەوە هەڵدێت، چونکە ئەوان لەبەرانبەر شمشێرەکاندا و لەبەرانبەر تیرە دابەستراوەکاندا و لەبەرانبەر تین سەندنی جەنگدا هەڵدێن، سەروەر ئاوای پێ وتم، کەلە ماوەی ساڵێکدا وەك ساڵی (ئەجیر) هەموو سەربازێکی قیدار لەناو دەچێت و باقی تیرهاوێژەکانی تر، پاڵەوانانی بەنی قیدار هەڵدێن و دەپوکێنەوە.

لە دەقێکدا بە ئاشکرا باس لە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەکات دەڵێت:

لە داهاتودا هەموو نەتەوەکان دەشڵەقێنم (ئەحمەد) دێت بۆ هەموو نەتەوەکان، ئەوجا ئەم هەموو ماڵەکان پڕ دەکات لە سەربەرزی، پەروەردگاری سەربازان وتویەتی زیو من خاوەنیم و زێڕیش هەر من، ئاوا دەڵێت پەروەردگاری سەربازان لەم شوێنەدا سەلام و ئاشتی دەبەخشم، ئاوا دەڵێت پەروەردگاری سەربازان، ئەم دەقە لە ئیسحاحی دووەم لە سفەری حەجی ڕستەی (٧-٩)دا هاتووە.

پرۆفیسۆر دیڤید بنجامین کلدان-ی[41] دەڵێت: خۆم هەڵسام بە وەرگێڕانی ئەم دەقە، کە نوسخەیەکم لە ئینجیلە کۆنەکە لەلا مابوو، کە ئەویش ئافرەتێکی ئاشووری ئامۆزای خۆم بەخواستن پێی دابووم، ئەو بەرگە بە زمانی نیشتمانی باوی ئەو سەردەمە نووسرا بوەوە بەڵام با

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[41]- قەشە (دیڤد بنجامین کلدان)ی باوەڕی بە ئیسلام هێنا و ناوی خۆی گۆڕی بۆ پرۆفیسۆر (عەبدولئەحەد داوود) و خۆی لە هۆزی کلدانیە خواپەرستەکانی سەر بە کڵێسای کاتۆلیکی ڕۆمانییە و خاوەن بڕوانامەی (لیسانس)ە لە زانستی لاهوت دا، پاش ئیسلام بوونی کتێبێکی دانا بە ناوی (موحەمەد لە پەرتوکی پیرۆزدا).

سەیرێکی وشە تەرجومە کراوەکە بکەین  کە لە عیبرییەوە وەرگیراوە وشەی (حەمدا)یە بۆ (ئەحمەد) بەکار هاتووە ئەویش بەمانای ئومید و ئارەزوو تەرجومە کراوە و وشەی (شالوم)یش بۆ (ئیسلام) تەرجومە کراوە، پاشان  (قسیس، پرۆفیسۆر عەبولئەحد) دەڵێت:

کاتێك کە ئەم دەقەم بینی یەکسەر بڕوام پێ هێنا و زانیم کە محمد ﷺ نێردراو و فرستادەی خوایە و موسوڵمانبوونی خۆم ڕاگەیاند، ئیتر نکوڵی و ئینکاریم نەکرد تێیدا، چونکە ڕێك گونجاوە لەگەڵ کەسایەتی (ئەحمەد) و نێردراوی بە ئیسلام هەردوو وشەی (حەمدا، شالۆم) یان لە جێگایەکی تردا بە(شەلاماش ) کە بەڵگەن لە سەر مانای هەردوو وشەی (ئەحمەد و ئیسلام).

ئەوەی کە لێیدواین پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد  سەردەمی کۆن بوو یان تەورات، بەڵام بێنە سەر ئینجیلەکە لەبەر  دەستایە  بزانین چۆن باسی  پێغەمبەری  ئازیز دەکات، وێڕای ئەو شێواندنانەی کە ئاشکرا پێوەی  دیارە. لە لاپەرە (٤٩-٥٠)ی ئینجیلی یوحەنادا هاتووە  دێڕی (١٥-٢٥) دەڵێت: ئەگەر ئێوە منتان خۆش دەوێت وەسیەت و ڕاپرسییەکانم بپارێزن منیش لە باب داوا دەکەم ئەویش (بارقلید) خەباتگێرێکی ترتان پێ دەدات تا لەگەڵتان بمێنێتەوە  بۆ هەتاهەتایی.

خەباتگێری گیانی پیرۆز ئەو کەسەیە کە لە دوای باب هەربەناوی من دەینێرێت، ئەو خۆی هەمووشتێکتان فێر دەکات ئەو شتانەتان بیر دەخاتەوە کە من پێشتر پێم وتوون.

زۆرتان لەگەڵ نادوێم چونکە سەرۆکی ئەم جیهانە بۆ خۆی دێت و کە هیچ شتێك نییە لە مندا هی ئەو نەبێت، جا کە ئەو هات ئەو خەباتگێرە لەلایەن گیانی حەقەوە، من بۆتان دەنێرم ئەویش هەر لە  بابەوە دەردەچێت، ئەو دەم ئەو شاهیدیش بۆ من دەدات بەڵام من حەقیقەتتان پێ دەڵێم ئەو کەسە چاکترە بۆ ئێوە لەوەی کە من دەربچم تا من دەرنەچم و نەڕۆم ئەو خەبات گێرە نایەت بۆتان، بەڵام  گەر من چووم ئەو دەنێرم بۆتان ئەویش هەرکات هات جیهان شمشێر دەگریت بۆ ئەوەی گوناهو تاوان نەهێڵێت و خێرو چاکە لەسەر دادپەروەری و لێپرسینەوە  ئەنجام دەدات لەسەر گوناهو تاوان، هۆکەی ئەوەیە کە ئەوان بڕوا بە من ناکەن ناهێڵن کە من ڕۆشتم بۆ لای پەوەردگار ناشم بیننەوە، بەڵام ئەو سەردارو لێپرساوە، چونکە ئەو سەرۆکی ئەم جیهانەیە خۆی دین و ئایینێکی گرتووە ئەوجا من گەلێ شتی تریشم لەلایە کە پێتان ڕابگەیەنم، بەڵام ئێوە ناتوانن بچنە ژێری و لەئەستۆی بگرن بەڵام ئەو گیانی حەقە کە هات ڕێنمونیتان دەکات و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ هەموو حەق و ڕاستییەك  چونکە ئەو کەسە لە خۆیەوە نادوێت و قسە ناکات  هەر شتێك لەلای بابەوە بێت پێتان دەڵێت هەواڵی کۆمەڵێك ڕووداوی داهاتووتان پێ ڕادەگەیەنێت، ئەو کەسە من سەربەرزو

مەزن دەکات، چونکە من هەرچیم هەیە ئەو بۆ خۆی دەبات و وەری دەگرێتەوە هەموو هەواڵێك بە ئێوە دەگەیەنێت.

لێرەدا بە وردی دەمانەوێت چەند خاڵێك بخەینە ڕوو:

١. (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) وەسیەت دەکات و مژدە دەدات بە هاتنی خەباتگێڕێك و کارسازێك لەدوای خۆی.

٢. هاتنی کارساز و ئەو پەیامبەرە بەستراوە بە ڕۆشتنی عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ)

٣. ئەو کەسە نێردراوە لەلایەن خوای گەورەوە، واتا موعجیزەی هەیە.

٤- ئەو کەسە هەموو شتێك دەزانێت.

٥- ئەو کەسە بە یادی خەڵکی دێنێتەوە ئەوەی کە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) وتوویەتی.

٦- ئەو شایەتی ڕاستگۆی بۆ عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەدات.

٧- جیهان شوێن ئایینەکەی دەکەون.

٨- ئەو کەسە لە خۆیەوە نادوێت، بەڵکو بەوە دەدوێت کە دەی بیستێت.

٩- ئەو کەسە هەواڵ بەشتی داهاتوو دەدات.

١٠- ئەو کەسە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) سەر بەرزو مەزن دەکات.

١١- ئەو کەسە بۆ هەتاهەتای لەگەڵتان دەمێنێتەوە.

کەواتە (تبیان لکل شيء) النحل/٨٩ بە ئاشکرا هەواڵی ناردنی پێغەمبەری ئازیزە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

لێرەدا (١١)خاڵمان ئاماژە پێداوە، بەڵام زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت کە لێی بکۆڵیتەوە.

شتێکی زۆر باڵکێش کە سەرنجی منی ڕاکێشا ئەویش ئەوەیە کە نووسرا وە ئایینەکەشی لە جیهان بڵاو دەبێتەوە بۆ هەمیشەیی و هەتا هەتایی دەمێنێتەوە، دیارە ئەو بیر و باوەڕی ئێمە زیاتر پەتوتر دەکات، موعجیزەیەکی تر ڕووی داوە ئالەم دەقەدا، ئەوەش وشەی خەباتگێڕو کارساز هاتووە لە ڕاستیدا تەرجومەی وشەیەکی شێوێندراوی یۆنانییە کە ئەو زمانەیە کە لە سەرەتادا ئینجیلی یوحەنای پێ نووسرا وەتەوە کە وشەکەش بریتییە لە (بیریکلیتۆس) کە بنەڕەتی وشەکە بریتییە لە وشەی (ئەحمەد)، بەڵام وشە کە لە ئینجیل دا گۆڕاوە بۆ (بارکلیتۆس) کە بنەڕەتی ئەم وشەش بە خەباتگێڕ و کارساز دێت.

ئەمەش بەتەواوەتی ئەو ئایەتە موعجیزەکەیمان نیشان دەدرێت کە خوای گەورە دەفەرموێت: لە سەر زمانی (عیسا) (عَلَيْهِ السَّلَامُ).

﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾ ﴾ الصف

کاتێك کە (عیسا)ی کوڕی مەریەم بە بەنی ئیسرایلییەکانی وت منیش هەر پێغەمبەری خوام و ڕەوانەکراوم بۆلاتان، بڕوام بەوەیە لەبەردەستمدایە لە تەورات هەیە، مژدەی پێغەمبەرێکتان پێ دەدەم کە پاش من دێت و ناوی (ئەحمەدە)، بەڵام کاتێک ئەو پێغەمبەرەی ئێمەیان بۆ هات و لەگەڵ خۆیدا چەندین ئایەت و بەڵگە و موعجیزەی هێنا، وتیان ئەمە سحر و ئەفسانەیە و جادوویەکی ئاشکرایە﴿٦﴾

## لە خاچدانی یان هەڵکشانی (بەرزکردنەوەی) ؟!

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: کاتێک خوای گەورە سفرە و خوانی بۆ دابەزاندن لە ئاسمانەوە بریتی بوو لە نان و گۆشت، فەرمانی پێ کردن، کە خیانەت لە یەکتری نەکەن و هەرگیز هیچ پاشەکەوت نەکەن، هیچ شتێک هەڵنەگرن بۆ ڕۆژی دوایی واتا بەیانی، بەڵام ئەوان خیانەتیان کرد پاشەکەوتیان کرد، شتومەکیان هەڵگرت، ئیتر خوای گەورە ئەقڵ و هۆش و بیری کردن بە بەراز و مەیمون.[42]

یەکێک لەوانەی لە گەڵیاندا نانی دەخوارد خۆی بە حەواری و قوتابی (عیسا) (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەزانی، لە ناویاندا جاسوس موونافیق بوو بە ناوی ( (داوود)ی کوڕی نورا)، لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە گوایە ئەو کەسە ناوی (یەهوزای ئەسخەربوطی) بووە.

پێشتر حەزرەتی (عیسا)ی کوڕی مەریەم بۆ ڕزگاری گەلی ئیسرائیل لە بن دەستی ڕۆم دەریانبهێنێت، کەچی زۆرینەی گەلی ئیسرائیل دژی بوون، تەنها بەشێک لەو گەلە کەوتنە شوێنی. جوولەکەکان توانیان فەرمانی دەستگیرکردن و لە خاچدانی لە لایەن پادشای ڕۆمەوە بهێنن کە ناوی (بیلاطۆس) بوو یەهوذای ئەسخەر بوطی جێگای حەزرەتی (عیسا)ی ئاشکرا کرد بۆ جوولەکەکان بە پارە، داوایان لێکرد کە خۆی بڕواتەوە ناویان ئاشکرا نەبێت، بەڵام لە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

42- عن عمار بن ياسر، عن النبي صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: نزلت المائدةُ من السّماء عليها خبزٌ ولحمٌ، وأُمروا أن لا يخونوا، ولا يرفعوا لغد، فخانوا وادّخروا ورفعوا، فمُسخوا قردةً وخنازير. وكذا رواه ابنُ جرير، عن الحسن بن قزعة

بەرەبەیاندا حەزرەتی (عیسا)ی کوڕی مەریەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەگەڵ چەند قوتابییەکی دەرباز بوو ( یەهوزای ئەسخەربوطی) خوای گەورە شێوەی خستە سەر (عیسا)ی کوڕی مەریەم و ئەو لە خاچ درا و سەربازەکانی ڕۆم وەکو گاڵتە پێ کردن و ئیهانەکردن دڕک و داڵیان لەسەری پێچا تا مرد، (عیسا)ی کوڕی مەریەمیش خوای گەورە بردیەوە بۆ ئاسمان و پاراستی، خوای گەورە ڕووداوەکەمان بۆ باس دەکات لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ۝ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ۝﴾ آل عمران

واتە: کافران نەخشە و پیلانیان دانا و فێڵیان کرد، خوای گەورەش لە بەرامبەر نەخشە و پیلان و فێڵی ئەوان نەخشە و پیلان و فێڵی بۆیان دانا، باشترین نەخشەدانەر کە فێڵی ئەوان هەڵوەشێنێتەوە خوای گەورەیە، کەسانێك لە گەلی ئیسرائیل چوونە لای پاشای ئەو کاتە کە کافر بوو وتیان (عیسا) زۆڵە و خەڵکی گومڕا دەکات و لە گوێڕایەڵی تۆ لایان دەبات و کێشە دروست دەکات، پاشایش خەڵکی نارد بیکوژن و لە خاچی بدەن خوای گەورە ڕزگاری کرد و لە پەنجەرەی ماڵەکەوە بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان و شێوەی خستە سەر یەکێك لە قوتابیەکانی و ئەویان کوشت و لە خاچیاندا وایانزانی (عیسا) (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ۝

کاتێك کە خوای گەورە فەرمووی: ئەی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئەتخەوێنم، (وفاة) لێرە بە مانای خەوتن دێت نەك مردن وەکو خوای گەورە لە ئایەتی تر دەفەرموێ: خوای گەورە بەشەو دەتانخەوێنێت نەك دەتانمرێنێت، لە دوعای لە خەوهەستان سوننەتە بڵێیت: (الحَمْدُ للهِ الذي أحيانا بَعدَ ما أماتَنا وإليه النُّشُور) واتە: حەمد و سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەخەبەری هێناین پاش ئەوەی خەواندمانی و گەڕانەوەیش هەر بۆ لای ئەوە) بەرزت ئەکەمەوە بۆ لای خۆم بۆ ئاسمان، یان پاش و پێش لە ئایەتەکە هەیە، واتە: بەرزت دەکەمەوە بۆ لای خۆم پاشان دەتمرێنم بە بەرزکردنەوەت پاکت ئەکەمەوە لەوەی کە لەلای ئەم کافرانە بیت، ئەوانەی کە شوێن تۆ کەوتوون موسڵمانان ئەبێ بەرز بن و لەسەرووی کافرانەوە دەبن تا ڕۆژی قیامەت، پاشان لە ڕۆژی قیامەتیش گەڕانەوەتان هەر بۆ لای خۆمە و خۆم بڕیار لە نێوانتاندا ئەدەم لەو ئیختیلاف و جیاوازییەی کە لەگەڵ کافراندا هەتانبووە۝

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ وَكُفۡرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتۡلِهِمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَقَوۡلِهِمۡ قُلُوبُنَا غُلۡفُۢۚ بَلۡ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيۡهَا بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ۝ وَبِكُفۡرِهِمۡ وَقَوۡلِهِمۡ عَلَىٰ مَرۡيَمَ بُهۡتَٰنًا عَظِيمٗا ۝ وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ

وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ النساء

واتە: لەبەر ئەوەی ئەمان دیسانەوە عەهدو پەیمانیان لەگەڵ خوای گەورەدا ئەشکاند، کوفریان ئەکرد بەئایەتەکانی خوای گەورە، پێغەمبەرانی خوای گەورەیان ئەکوشت بەناحەق وەکو (یەحیا)و (زەکەریا)و جگە لەوان ئەیانووت: ئێمە دڵمان وەك ئەوە وایە کە پەردەیەکی بەسەردابێ هیچ شتێك نابیستین و هیچ شتێك تێناگەین بەڵکو خوای گەورە بەهۆی کوفری خۆیانەوە مۆری لەسەر دڵیان داوە بۆیە ئیمان ناهێنن تەنها کەمێکیان نەبێت﴿١٥٥﴾ بەهۆی کوفرکردنیان بە (عیسا) و بوهتانیان بۆ (مەریەم)ی دایکی کرد کە وتیان: لەگەڵ (یوسفی دارتاش) دا زینای کردووە کە یەکێك بووە لە پیاوچاکان﴿١٥٦﴾ درۆیشیان کرد و شانازیان ئەکرد بە کوشتنی (عیسا) (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-ەوە ئەیانووت: ئێمە (عیسا)ی کوڕی مەریەم)مان کوشتووە، خوای گەورە بەدرۆیان ئەخاتەوە ئەوان نە (عیسا)یان کوشت نە لە خاچیشیاندا، بەڵکو لێیان تێکچوو شێوەی (عیسا) خرایە سەر یەکێك لە حەوارییەکانی و ئەویان کوشت و خۆشیان هەر گومانیان هەبوو ئایا ئەمە (عیسا)یە یان حەوارییەکەیە، ئەو کەسانەی کە ئیختیلاف و جیاوازیان هەبوو، هەندێکیان وتیان: کوشتمان و هەندێکیان بینیان کە خوای گەورە بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان وتیان: نەمان کوشتووە و جیاوازی کەوتە نێوانیان ئا ئەمانە خۆیان گومانیان هەیە سەبارەت بە (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) هیچ زانیارییەکیان نییە لەو بارەیەوە تەنها شوێنی گومان کەوتوون و دوو دڵن بە یەقینی ئەوان (عیسا) (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-یان نەکوشت﴿١٥٧﴾ بەڵکو خوای گەورە (عیسا)-ی بەرز کردەوە بۆ لای خۆی، ئەمەش بۆ خوای گەورە ئاسانە، خوای گەورە زۆر بە عیززەت و باڵادەستە و زۆر کاربەجێیە، ئیشەکانی خوای گەورە پڕە لە حیکمەت﴿١٥٨﴾ هیچ کەسێك نییە لە ئەهلی کتاب جوولەکە بێ یان گاور ئیلا ئیمان بە (عیسا) ئەهێنن پێش ئەوەی کە (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بمرێ واتە: دوای ئەوەی لە کۆتایی زەماندا خوای گەورە (عیسا) دائەبەزێنێتەوە بۆ سەر زەوی هەموویان ئیمانی پێ دێنن. لە ڕۆژی قیامەتیشدا (عیسا) شایەتی ئەدات لەسەریان لەسەر جوولەکە بەوەی کە درۆیان کردووە کە وتیان مەریەم زینای کردووە و (عیسا)ش زۆڵە، بەسەر گاورەکان شایەتی

ئەدات کە زیادڕەوییان کردووە کە وتیان: کوڕی خوایە یان خۆی خوایە یان یەکێکە لەسێ خوایەك(١٥٩)[43]

خوای پەروەردگار ئاماژەی بەوەش کردووە کە گومان و هەڵەشەیی و درۆو دەلەسەی زۆر هەڵبەستراوە بۆ (عیسا)ی کوڕی مەریەم کە گوایە لە خاچ دراوە، بەڵام زۆرێک لە گرووپەکانی مەسیحی بە تایبەت سێ تاقمی سەرەکی بڕوایان وانییە کە (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە خاچ درابێت، ئەوانیش بریتین لە (ساترینوسییەکان، مارکۆییەکان، پاردیسانییەکان) زۆریتریش هەن لەو تاقمانەی کە بڕوایان بە لە خاچ دانی (عیسا) نییە.

کورت و پوخت حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە خاچ نەدراوە، بەڵکو بەرزکراوەتەوە بە جەستە بۆ لای خوای پەروەردگار، ئەمەش ڕای جیاوازی لەسەرە یەکێکیان دەڵێت: مردوووە ڕۆحەکەی بەرزکراوەتەوە و لاشەی لەسەر زەوی ماوەتەوە، وەکو هەموو پێغەمبەرانی تر، هەندێکی تر دەڵێن: مردوووە و لاشەکەی بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان.

ڕای زۆرینەی ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوەیە کە بەرزکراوەتەوە و نەمردوووە، بەڵکو جۆرێک لە خەوتن خەوی لێ خراوە دەگەڕێتەوە سەر زەوی، ئەوانەشی کە وەکو موعتەزیلەکانی کۆن بیردەکەنەوە دەڵێن: مردوو ناگەڕێتەوە.

ڕای بەهێز لای ئەهلی سوننەتە کە دەڵێن: دەگەڕێتەوە، بەڵام بۆ خەوورنەکە، بڵێین "مردوووە و بە فەرمانی خوای گەورە زیندووو دەکرێتەوە و دەگەڕێتەوە سەر زەوی" خەوتنەکەش هەر جۆرێکە لە مردن بەڵام بە خەوتنی کاتی، یان مانەوەی لە ئاسماندا بە موعجیزەی خوای گەورە دەگەڕێتەوە سەر زەوی، بۆ ئەوەی بڵێن مردوووە وشەکە ڕاستەوخۆ تەرجومەی وشە قورئانییەکەیە، ئەوەش پێویستە بڵێین کە هەمان وشەی مردن (توفی)یە بۆ خەویش بەکار هاتووە.

کەواتە کاری حەزرەتی (عیسا) تەواو نەبووە لە یەکێک لە نیشانەکانی قیامەتە و جەنابیان دەگەڕێنەوە سەر زەوی و بانگەوازەکەی تەواو دەکات، بەڵام بێ پێغەمبەرایەتی، بەڵکو وەکو

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[43] چەندەها فەرموودەی صەحیح لەو بارەیەوە هاتووە کە عیسا پیاوێکی چوارشانەی سوورو سپییە، شێوەی لە (عورووەی کوڕی مەسعودی) هاوەڵی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەچێت، لەلای منارەی ڕۆژهەڵات لە دیمەشق دادەبەزێت لە کاتی نوێژی بەیانی هەردوو دەستی لەسەر باڵی دوو فریشتەیە، قژەکەی وەك ئەوە وایە ئاوی پیابچۆڕێتەوە هەرچەندە ئاوی بەرنەکەوتووە، کار بە شەریعەتی ئیسلام دەکات و خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت و سەرانە لەسەر گاورو جوولەکە هەڵدەگرێت و بە جگە لە ئیسلام لێیان ڕازی نابێت، دەججالیش دەکوژێت، لەسەردەمی عیسادا هێمنی و ئارامی بڵاو دەبێتەوە تا شێر لەگەڵ وشتر و پڵنگ لەگەڵ مانگا و گورگ لەگەڵ مەڕ دەلەوەڕێن، منداڵ یاری بە مار دەکات و زیانی پێ ناگەیەنێت، ڕق و کینە لە دڵی کەسدا نامێنێت، و زەوی پڕ خێر و بەرەکەت دەبێت تا هەنارێك بەشی کۆمەڵێك لە خەڵکی دەکات، حەوت ساڵ دەمێنێتەوە پێشتریش سی و سێ ساڵ ژیاوە هەمووی دەکاتە چل ساڵ پاشان دەمرێت و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن./ تەفسیری ڕێبەر

یەکێک لە ئوممەتی محمد پێغەمبەر و بانگەوازی ئیسلامی دەکات، بەڵگەش زۆر هاتووە لە سەر گەڕانەوەی حەزرەتی (عیسا) لە فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەردا.

نووسینەوەی لێرەدا ناچێتە بواری مێژووی ڕابردوو، بەڵکو ئەوانە هەموو هەواڵی پەنهانین، بۆیە بە پێویستی نازانین باسکردنی لەم کتێبەدا، چونکە دەچێتە بوارەکانی نیشانەی قیامەت.

## کۆی گشتی باس

حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) ژیانی وەکو زۆرێکی تر لە پێغەمبەران زۆر دیار نییە، بەڵکو ژیانی زۆر شاراوەیە! هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ گەڕانەوەی لە نزیکی قیامەت و کە دەججال بە دەستی جەنابیان لە ناو دەچێت، پاشان لە دوای خۆی فەرمانی کرد بە (حەوارییەکان) کە خوای گەورە بپەرستن و شەریکی بۆ بڕیار نەدەن.

ئەوانەی کە ئینجیلیان نووسیوەتەوە زۆرن، دوانیان لەگەڵیدا ژیاون و دیتویانە. ئەوانیش، جەنابی یوحەنا و مەتا بوو ڕەحمەتی خوایان لێبێت ئەو کەسەی تر بە ناوی مارکۆس و لوقا(لوکا) تەنها حەوارییەکانی حەزرەتی (عیسا) (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-یان بینیووە ڕەحمەتی خوا لەهەموویان بێت. ماوەیەکی زۆر ئایینی حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) قەدەغە بووە، تەنانەت پەیڕەوکارانی زۆر تووشی ئازار و ئەشکەنجە بوونەتەوە لە لایەن ڕۆم و یەهود کە زۆر دژی ئایینی حەزرەتی (عیسا) بوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴿١١٣﴾﴾ البقرة

واتە: جوولەکە وتیان: گاورەکان لەسەر هیچ شتێك نین و دینەکەیان پووچەڵ و بەتاڵە، گاورەکان وتیان: جولەکە لەسەر هیچ شتێك نین و دینەکەیان پووچەڵ و بەتاڵە، لە کاتێکدا کە ئەوان کتابیان بۆ هاتبوو کتابیان ئەخوێندەوە، بەهەمان شێوە ئەوانەی تریش ئوممەتانی تریش کە نەزان بوونە هاوشێوەی قسەی جوولەکە و گاورەکانیان کردووە، خوای گەورە خۆی لە ڕۆژی قیامەتدا بڕیاریان لە نێواندا ئەدات لەو ئیختلاف و جیاوازییەی کە لە نێوانیاندا هەبووە﴿١١٣﴾

(٢٠٠) ساڵ ئایینی مەسیحی لە چەوساندنەوەدا بوو، ئەگەرچی زۆرێک لە خەڵکی بڕوایان پێهێنا، بەڵام بە داخەوە نوسینەوەی ئینجیل لە دوای (٢٠٠-٣٠٠) ساڵ نووسراوەتەوە، ئەوەی کە کڵێسا دانی پێ داناوە، تەنها ئەو چوار ئینجیلەیە کە ئێستا بەردەستە هەرچەندە پێدەچێت ئینجیلی (بەرنابا) ڕاسترین بێت، چونکە ناوی (عیسا)ی کوڕی مەریەم بە پێغەمبەری دەبات، هەرچەندە لە ئینجیلەکانی تیشدا ناوی (عیسا) لە چەند جێگادا بە پێغەمبەری خوا هاتووە.

پاشان لە دوای حەزرەتی (عیسا) کەسێک بە ناوی ( پۆڵس) زۆر ئازاری مەسیحییەکانی ئەدا، لە کۆتاییدا گوایە ئەم کەسە تۆبەی کردووە، وازی لە خراپەکاری هێناوە و بانگەوازی (عیسا) پێغەمبەری گەیاندووە لە دیمەشق کڵێسایەکی دروست کردووە، کە بە کڵێسای پۆڵس مەشهور بووە، پاشان ڕووخێنراوە.[44]

دیوێکی تری باسەکە ئەوەیە زۆرێکی تر لە مێژوونووسان زۆر بە چاوی خیانەتکار و خراپەکار تەماشای پۆڵس دەکەن کە گوایە شێوێنەری ئایینی مەسیحی یە و ئەم ئایینەی کە ئێستا بە نەسارا ناسراوە، خودی پۆڵس دروستیکردووە کە بنەڕەتی یەهودییە و زۆر دژی ئەم ئایینە بووە.

خوای گەورەش لە قورئاندا باسی ئەو ڕا جیاوازەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ ۖ قَالُوا۟ يَـٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًۭٔا فَرِيًّۭا ﴿٢٧﴾﴾ مريم

دوای ئەوەی کە عیسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ-ی بووعیسای هێنایەوە قەومەکەی سەرزەنشتیان کردوتیان: ئەی مەریەم بەڕاستی کارێکی زۆر گەورەو خراپت کردووە.

## گۆڕانکاری لە تەورات و ئینجیل دا

گومان لەوەدا نییە کە تەورات و ئینجیل دوو پەرتووکی ئاسمانین و کەلامی خوای پەروەردگارن، لە ڕێگای حەزرەتی (موسا) و (عیسا) (عَلَيْهِمَا ٱلسَّلَامُ)-ەوە هاتووە. لە نێوانی تەورات و ئینجیلدا کتێبی تر سفری تر) زۆر هاتووە، یاخود هەمووی کۆکراوەتەوە لە دوو بەشدا بە ناوی پەیمانی نوێ و پەیمانی کۆن لە دوو توێی کتێبێکدا بە ناوی پەرتووکی پیرۆز.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِى ثَمَنًۭا قَلِيلًۭا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ المائدة

واتە: ئێمە تەوراتمان دابەزاندووە کە هیدایەت و نوورو ڕووناکی تیا بووە پێش ئەوەی کە قورئان دابەزێ، موژدەی هاتنی تیا بووە بە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێویستە شوێنی بکەون کۆمەڵێك پێغەمبەر لە دوای (موسا) هاتن حوکمیان بە تەورات ئەکرد و لەسەر ئەو شەریعەتە ئەڕۆیشتن ئەو پێغەمبەرانەی کە موسڵمان بوونە و خۆیان تەسلیمی خوای گەورە کردووە کە

---

[44]- ئەم باسە لە ئبین کەثیر هاتووە.

ئەمیش لووتشکاندنی جوولەکەی تیایە کە پێغەمبەرانی ئەوانیش لەسەر دینی ئیسلام بوونە جوولەکە و گاور نەبوون, بەڵکو هەموویان موسڵمان بوون، پێغەمبەری ئەو کەسانە بوون کە یەهودی بوون و ئەوانەی کە ڕەببانی بوون. واتە: زانا و خواپەرست و کارکەرو فێرکارەکان، زانا گەورەکان کە خەڵکی شوێنیان دەکەون کە فەرمانیان پێکرابوو لەلایەن پێغەمبەرانیانەوە کە کتابی خوای گەورە بپارێزن و ئاشکرای بکەن و نەیشارنەوەو کاری پێبکەن، خەڵکی فێر بکەن و دەستکاری نەکەن و نەیگۆڕن. ئەوانیش شایەت و چاودێر بوون بەسەر ئەو کتێبانەوە بۆ ئەوەی کە نەگۆڕدرێ و دەستکاری نەکرێت، ئەی زانایان ئێوە لە خەڵکی مەترسێن و بە تاك و تەنها لە من بترسێن، ئایەتەکانی من مەگۆڕنەوە بەنرخێکی کەم بە دونیایەك کە کەمە، کە حوکم بە کتابی خوای گەورە نەکەن لەبەر دونیا و بەرژوەندی و ڕەشوە و بەرتیل، هەر کەسێك حوکم بەو قورئانە پیرۆزە نەکات کە خوای گەورە دایبەزاندووە ئا ئەو کەسانە کافرن﴿٤٤﴾ [45]

کاتێک ئەحبارەکان بە تەورات حوکمیان دەکرد، حوکمی هەموو جیهانیان دەکرد، بەڵام کە هەوا و ئارەزووی خۆیان بەکار هێنا بە ویستی خۆیان و پارە و پوول ئایەتەکانی تەوراتیان دەفرۆشت، ئیتر لێرەوە گۆڕانکاری تەواو کەوتە ناو ئایینەکە بە تایبەت بە زمانی عیبری تەوراتیان دەخوێند بە زمانەکانی تر وەریان دەگێڕا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴿٧٨﴾﴾ آل عمران

واتە: لەناو جوولەکەکانیشدا کۆمەڵێك هەن کە زمانیان گێڕ و خوار ئەکەنەوە لە کاتی خوێندنەوەدا بۆ ئەوەی کە قسەی تر بدەنە پاڵ دینەکەی خوای گەورە و وا بزانن ئەمیش هەر لە تەوراتەکەیە و ئەیخوێننەوە لە کاتێکدا کە قسەی خۆیانە و لە کتابی خوای گەورە نییە و شتی وا نەهاتووە ئەڵێن: ئەمەی کە ئێمە ئەیخوێنینەوە لەلایەن خوای گەورەوە دابەزیوە، بەڵام

---

[45] -ئەمە لەسەر جوولەکە دابەزیووە بەڵام موسڵمانیش ئەگرێتەوە کە حوکم بەقورئانی پیرۆز نەکەن، (ابن عباس) دەفەرموێت: هەر کەسێك ئینکاری حوکمی خوای گەورە بکات ئەوە کافر ئەبێ، بەڵام دانی پیادا بنێ و حوکمی پێ نەکات ئەوە زاڵمەو فاسقە، لە ڕیوایەتێکی تر ئەفەرموێت: ئەمە کوفرێك نییە کە لە دینی ئیسلام دەرتان بکات، بەڵکو کوفری بچووکە (كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ)، دەفەرموێت :ئەمە ئەو کوفرە نییە کە ئێوە بۆی دەچن، (طاوس) دەفەرموێت: کوفرێك نییە لە ئیسلام دەرت بکات، ئەگەر کەسێك سووکایەتی بە حوکمی خوای گەورە کرد، یاخود بەحەڵاڵی زانی کە حوکم بەغەیری قورئان بکات، یان ئینکاری حوکمی خوای گەورەی کرد یان بەکۆنەپەرستی ناوی برد، یاخود ئەگەر وتی: حوکمی خوا و حوکمی غەیری خوا یەکسانەو وەکو یەك وایە و جیاوازی نییە، یان وتی: حوکمی خوا باشترە و دروستە کار بە غەیری قورئانیش بکەی، ئەمانە هەمووی کافر ئەبن، بەڵام ئەگەر دانی بە حوکمی خوای گەورەدا نا بەڵام ئیشی پێ نەکرد ئەوکاتە کافر نابێ و زاڵم و فاسقە./تەفسیری ڕێبەر

ڕاست ناکەن و لەلایەن خوای گەورەوە نییە دیسان درۆ بۆ خوای گەورە هەڵئەبەستن و بەناو خوای گەورەوە درۆ ئەکەن لە کاتێکدا خۆیشیان ئەزانن ئەمانە گەورەترین تاوانە﴿٧٨﴾

خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە کە بە ویستی خۆیان ڕاڤەیان دەکرد و لە جێگای ڕاستی خۆیدا بەکاریان نەدەهێنا، بۆ نمونە ( ڕەجمیان) دەکرد بە (جەڵد) یان بە (التحمیم) واتا بەڕەشکردنی دەموچاو، یاخود ئەگەر کەسێکی شەریف دزی بکردایە گوێیان پێ نەئەدا، بەڵام هەژارێک دزی بکردایە لەسەری یاسایان پیادە دەکرد، هەروەکو کوردستانی خۆمان، هەرچی دز و جەردە و پیاوخراپ هەیە ماڵ و سامانی خەڵکی داگیر کردووە، کۆمپانیا لە دوای کۆمپانیا دایدەمەزرێنن و خاکی ئەو نیشتمانە بۆ خۆیان دەبەن و هەرچی پێیانە دەیکەنە هاوبەش، بەڵام میللەتەکە دەبێت بە دەمیاندا بڕوانێت، لەبەر ئەوەی ئەمانە شەریف و شۆڕشگێڕ و ئازا و جوامێر بوون، لە ڕاستی دا پێچەوانە بوو هەموو جاش داوێنپیس و سەرسەری و ترسنۆک بوون، کوڕی خەڵکیان دا بە کوشتن و خۆشیان وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون.

جوولەکەکانیش وەکو بەرپرسەکانی کورد بوون، بۆتان وێنا دەکەین تا باشتر تێبگەن.

خوای پەروەردگار لە بارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف

واتە: ئەو کەسانەی کە شوێن ئەو پێغەمبەرە ئەکەون کە ڕەسول و نەبی بووە نێردراوی خوای گەورە بووە (الأُمِّيَّ) بووە واتە : نەخوێندەوار بووە و بۆ لای قەومێکی نەخوێندەوار نێردراوە کە عەرەب بوون کە جوولەکە و گاورەکانیش لە لای خۆیان سیفەتی ئەو پێغەمبەرە کە محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-ە ئەبینن و نووسراوە، ئەو پێغەمبەرە فەرمانیان پێ ئەکات بە هەموو کارێکی چاك کە چاکترینیان پەرستنی خوای گەورەیە بە تاك و تەنها قەدەغە و ڕێگریان لێ ئەکات لە هەموو کارێکی خراپ، کە خراپترینیان هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوای گەورە هەموو شتێکی پاك و بەتام و چێژ و بەلەزەتیان بۆ حەڵاڵ ئەکات، بەتایبەتی ئەوەی کە گەلی ئیسرائیل کاتی خۆی لە خۆیانیان حەرام کردبوو هەموو شتێکی پیسیان لێ حەرام ئەکات، ئەو بارە گرانانەی کە خۆیان، خستبوویانە سەرشانی خۆیان، ئەم هەموو ئەو بارە قورسانەیان لەسەرشان لائەدات، ئەو کۆت و زنجیرانەی کە پێیانەوە بوو کە باری قورسیان خستبووە سەرشانی خۆیان بەبێ ئەوەی بەرژەوەندیەکی تیادا بێت ئەم پێغەمبەرە هەموو ئەو شتانەیان لەسەر لائەدا جا ئەو کەسانەی کە ئیمانی پێ بێنن لە گەلی ئیسرائیل و لە غەیری ئەوانیش بەگەورەی بزانن و ڕێزی لێ بگرن

و سەری بخەن شوێن ئەو نوور و ڕووناکییە بکەون کە لەگەڵیدا دابەزیوە کە قورئانی پیرۆزە، ئا ئەمانە کە ئەم سیفەتانەیان تیا بێت ئەمانە سەرکەوتوو و سەرفرازن لە دونیا و قیامەتدا﴿١٥٧﴾

هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە کە یەهود هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی نێوەندگیر بێت لە نێوانیاندا، دوو کەس یان کردبوو لە هۆزەکانی یەهودی شاری مەدینەی پێغەمبەر خوا ﷺ هاتن وتیان لە تەورات دا هیچ شک نابەین لەسەر زینا کردن حوکمەکەی چیبێت؟ پاشان وتیان حوکمی زینا لە تەورات دا نییە کە ڕەجم کردن نابێت! بەڵکو شاربەدەر دەکرێن واتا ناویان دەزڕێنین پاشان جەڵدەیان لێ ئەدەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی تەورات بهێنن، پێغەمبەری خوا ﷺ بە (عەبدوڵای کوڕی صوریایی) فەرموو: تەورات دیارە سفرەکەی دیاری کردووە پاش و پێشی ئایەتی ڕەجمی خوێندەوە لە تەورات دەستی خستبوە سەر ئایەتی ڕەجمەکە شاردبوویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( دەست بەرز بکەرەوە ئەی کوێر) کە دەستی بەرزکردەوە ئایەتی ڕەجمەکە لە ژێر دەستی دا بوو، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕەجمەکە لە ژێر دەستی دابوو، پاشان پێغەمبەر فەرمووی ڕەجمی بکەن، پاشان فەرمووی (اللهم إني أول من أحيا أمرک، أماتوه) بوخاری و موسلم، فەرموودەکەیان ڕیوایەت کردەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار من یەکەم کەسم فەرمانی زاتی بەرزت لە تەورات دا دەژینمەوە، واتا مەبەست یەهودی شاری مەدینە بووە.

کەواتە تەورات و ئینجیل لە دوای حەزرەتی (عیسا عليه السلام) دەستکاری کراوە، چونکە هەموو ئەو پێغەمبەرانە مەعصوم بوون جا چ زەکەریا، یەحیا، خودی حەزرەتی (عیسا) ئەگەر ڕاست نەبوایە وتەیان دەبوو لەسەری، بەڵام هەموویان دەستیان پێو گرتوە و حوکمیان پێ کردووە.

هەر بۆیە ئیختیلافەکە کەوتە نێوانی یەهود هاتنە لای پێغەمبەر خوا ﷺ، خوای گەورەش ئایەتی لەسەر دابەزاندن و فەرمووی: ﴿وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوْرَىٰةُ فِيهَا حُكْمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ﴿٤٣﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًاۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴿٤٤﴾﴾ المائدة

واتە: لە دوای ئەوە پشت هەڵئەكەن لە حوكمەكەی خوای گەورە و ئەیگۆڕن، ئەوان بەڕاستی ئیماندار نین﴿٤٣﴾ ئێمە تەوراتمان دابەزاندووە كە هیدایەت و نوور و ڕووناكی تیا بووە پێش ئەوەی كە قورئان دابەزێت، موژدەی هاتنی تیا بووە بە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێویستە شوێنی بكەون، كۆمەڵێك پێغەمبەر لە دوای (موسا) هاتن حوكمیان بە تەورات ئەكرد و لەسەر ئەو شەریعەتە ئەڕۆیشتن، ئەو پێغەمبەرانەی كە موسڵمان بوون خۆیان تەسلیمی خوای گەورە كردووە كە ئەمیش لووتشكاندنی جولەكەی تیایە، كە پێغەمبەرانی ئەوانیش لەسەر دینی ئیسلام بوون. جولەكە و گاور نەبوون، بەڵكو هەموویان موسڵمان بوون، پێغەمبەری ئەو كەسانە بوون كە یەهودی بوون و ئەوانەی كە ڕەببانی بوون. واتە: زاناخواپەرست و كاركەرو فێركارەكان، زانا گەورەكان كە خەڵكی شوێنیان دەكەون كە فەرمانیان پێكرابوو لەلایەن پێغەمبەرانیانەوە كە كتابی خوای گەورە بپارێزن و ئاشكرای بكەن و نەیشارنەوە و كاری پێبكەن و خەڵكی فێر بكەن، دەستكاری نەكەن و نەیگۆڕن. ئەوانیش شایەت و چاودێر بوون بەسەر ئەو كتێبانەوە، بۆ ئەوەی كە نەگۆڕدرێ و دەستكاری نەكرێت، ئەی زانایان ئێوە لە خەڵكی مەترسێن و بەتاك و تەنها لە من بترسێن، ئایەتەكانی من مەگۆڕنەوە بەنرخێكی كەم، بە دونیایەك كە كەمە و حوكم بە كتابی خوای گەورە نەكەن لەبەر دونیا و بەرژوەندی و ڕەشوە و بەرتیل هەر كەسێك حوكم بەو قورئانە پیرۆزە نەكات كە خوای گەورە دایبەزاندووە ئا ئەو كەسانە كافرن﴿٤٤﴾

هەر بۆیە وشەی تەورات بە ئارەزووی خۆیان دەگۆڕن خۆ ئەگەر وایان نەكردایە، هەموو ئایەتەكانی تەورات و ئینجیل بەڵگە بوون بەسەر خۆیانەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف

واتە: ئەو كەسانەی كە شوێن ئەو پێغەمبەرە ئەكەون كە ڕەسول و نەبی بووە نێردراوی خوای گەورە بووە (الْأُمِّيّ) بووە واتە : نەخوێندەوار بووە و بۆ لای قەومێكی نەخوێندەوار نێردراوە كە عەرەب بوون كە جولەكەو گاورەكانیش لە لای خۆیان سیفەتی ئەو پێغەمبەرە كە محمد ﷺ-ە ئەبینن و نووسراوە، ئەو پێغەمبەرە فەرمانیان پێ ئەكات بە هەموو كارێكی چاك كە چاكترینیان پەرستنی خوای گەورەیە بە تاك و تەنها قەدەغەو ڕێگریان لێ ئەكات لە هەموو كارێكی خراپ، كە خراپترینیان هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوای گەورە هەموو شتێكی پاك و بەتام و چێژو بەلەزەتیان بۆ حەڵاڵ ئەكات، بەتایبەتی ئەوەی كە گەلی ئیسرائیل كاتی خۆی لە خۆیانیان حەرام كردبوو هەموو شتێكی پیسیان لێ حەرام ئەكات، ئەو بارە گرانانەی كە خۆیان خستبوویانە

سەرشانی خۆیان ئەم هەموو ئەو بارە قورسانەیان لەسەرشان لائەدات ئەو کۆت و زنجیرانەی کە پێیانەوە بوو کە باری قورسیان خستبووە سەرشانی خۆیان بەبێ ئەوەی بەرژەوەندیەکی تیادا بێت ئەم پێغەمبەرە هەموو ئەو شتانەیان لەسەر لائەدا جا ئەو کەسانەی کە ئیمانی پێ بێنن لە گەلی ئیسرائیل و لە غەیری ئەوانیش بەگەورەی بزانن و ڕێزی لێ بگرن و سەری بخەن شوێن ئەو نوورو ڕووناکییە بکەون کە لەگەڵیدا دابەزیوە کە قورئانی پیرۆزە، ئا ئەمانە کە ئەم سیفەتانەیان تیا بێت ئەمانە سەرکەوتوو و سەرفرازن لە دونیاو قیامەتدا﴿١٥٧﴾

خۆ لە ڕاستیدا توانای گۆڕانکاری کەلامی خوایان نییە، بەڵکو جورئەتی گۆڕانکاری مانای داتاشراویان هەیە، واتا ئەسڵەکە پارێزراوە، بەڵام شاردراوەتەوە و دەشزانن، بۆیە خوای گەورە بانگیان دەکات بۆ ڕاستکردنەوەی کەواتە مەبەست تێگەیشتنەکەیە، گەڕانەوە بۆ بنەڕەتەکە نەک داتاشراوەکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُوا۟ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمۚ مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ﴿٦٦﴾﴾ المائدة

واتە: ئەگەر ئەمان جولەکە و گاورەکان ئەو ئەحکامانەی کە لە تەورات و ئینجیل دا هەیە جێبەجێیان بکردایە و پێی هەڵسانایە لە کۆی ئەو ئەحکامانەی لە تەورات و ئینجیل دا هاتووە، ئیمان هێنان و ئەمر کردنە بە ئیمان، باوەڕ هێنان بە پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەدان بە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، قورئان، ئەگەر ئەمەیان بکردایە ئەوەی کە لە پەروەردگارەوە بۆیان دابەزیوە لە هەموو کتێبەکانی تردا، ئەوا خوای گەورە ڕزقی ئەدان لەسەرووی خۆیانەوە بە باران بارین، لە ژێر پێیانەوە لە زەویەوە جۆرەها ڕزق و ڕۆزیانی ئەدا بەهۆی ئیمان هێنانیان، کە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمان و تەقوا هۆکارە بۆ ڕزق و ڕۆزی و بەرەکەت، هەروەکو چۆن کوفرو تاوان هۆکارە بۆ نەبوونی و برسێتی و گرانی، لەناویاندا کەسانێك هەن کە دادپەروەرو باوەڕدارن وەکو (عبدالله-ی کوڕی سەلام) کە جوولەکە بوو، ئەوانەی لەگەڵیدا بوون موسڵمان بوون، کۆمەڵێك لە گاورەکانیش کە موسڵمان بوون، بەڵام زۆربەیان خراپترین کار ئەکەن کە بەردەوامن لەسەر کوفریان و شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ ناکەون و ئیمانی پێ ناهێنن﴿٦٦﴾

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًاۖ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴿٦٨﴾﴾ المائدة

واتە: ئەی محمد ﷺ بە ئەهلی کتاب بە جوولەکە و گاورەکان بفەرموو: ئێوە لەسەر هیچ شتێك نین ئەو دینەی کە ئێستا ئێوەی لەسەرن پووچەڵ و بەتاڵە تا تەورات و ئینجیل

جێبەجێ نەکەن، لەبەر ئەوەی لە تەورات و ئینجیلدا مژدەی هاتنی محمد ﷺ هەیە و فەرمانیشتان پێکراوە کە شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ بکەون تا شوێن ئەوەیش نەکەون کە لە پەروەردگارەوە بۆتان دابەزیوە کە قورئانی پیرۆزە و بۆ تێکڕای خەڵکی دابەزیوە، دیسانەوە جوولەکە و گاورەکان ئەو قورئانەی کە لە خوای گەورەوە بۆ تۆ دابەزیوە لەجیاتی ئەوەی کە ئیمانی پێ بێنن لە حەسوودیدا زیاتر توغیان ئەکەن و سنوور ئەبەزێنن و کوفر ئەکەن، بۆیە ئەی محمد ﷺ خەفەت مەخۆ لە کەسانێکی کافر کە شوێنت ناکەون﴿٦٨﴾

ئەگەر بڵێین گۆڕانکاری بە سەر هەموو تەورات و ئینجیل دا هاتووە، پێم وانییە زۆر وردبین لەو (چامەیە) گۆڕانکاری زۆری تێدا کراوە گومانی تێدا نییە، بەڵام بنەڕەتی ماوەتەوە نموونە هەرچی (ڕەب) هەیە لە ئینجیل دا کراوە بە (أب) واتا باوک، واتا هەرچی وشەی پەروەردگار هەیە کراوە بە باوک، هەر ئەمەش گەورەترین شیرکی لە ناو نەسارای ئێستادا دروست کردووە.

یان نموونەی تەورات، یەهود لە داخی عەرەب گۆڕانکارییان کرد لە نێوانی ئیسماعیل و ئینسحاق دا کە کامیان سەر بڕاوە دەکەن، یەهود گۆڕی بۆ ئیسحاق.

خودی یەهود لە دوای هاتنی ڕۆم هیچ مەرجەعیان نەما، دەربەدەر بوون لە شار و وڵاتان لە ڕووسیا تا دەگاتە ئەوروپا، ئاسیا و ئەفریقیا، لە هەموو جێگاکاندا دەکوژران و لە ناو دەبران مەسیحییەکان زۆر ڕقیان لێیان بوو، تا ناچار بوون تەورات و ئینجیل تێکەڵ بکەن و بیکەنە کتێبی پیرۆز.

هەرگیزاو هەرگیز یەهود و نەسارا بەیەکەوە نەگونجاون، تەنها دژی موسوڵمانان یەک دەگرن، یەهود لە هەر جێگایەکی دنیادا بە ئارەزووی خۆی تەوراتی نووسیوە یان تەفسیر کردووە.

بەندایەتی و دروشمەکانیان تێک و پێکداوە بەسەر یەکدا، لە ئەوروپا جۆرێک لە یەهود هەیە، لە ئەمریکا جۆریکی ترن، لەو خودی بەریتانیادا لە دوو گروپەی تر جیاوازن، زایۆنیان هەیە یان سەبەتاییان هەیە، ماسۆنیەتیان هەیە، کەبالایان هەیە، ئەشکەنازیان هەیە و جۆری تر زۆرن، هەریەک لەم بەشانە دژایەتی یەکتر دەکەن، بەهێزترین جۆری یەهود لەو دنیای ئەمڕۆدا یەهودی (سەهیۆنە) زایۆنتیسی، کە سەر بە بیروباوەڕی (تیۆدۆر هرتزل)ن.

بۆ زانیاری خوێنەر تەوراتی یەهودی جیاوازترە لەو تەوراتەی کە لای نەسرانییەکانە، هیچ کات جوولەکە توانای موناقەشە و بەرگری کردنی نییە لە دینەکەی، کە زۆرت بۆ هێنان یان ڕادەکات یان شەڕ دەکات و دەست دەوەشێنێت، چونکە تەنها کۆمەڵێکی کەم لە حاخامەکانیان لە دینەکەیان شارەزان، خەڵکەکەشی وەکو مەڕ سەریان کردووە بە دووگی یەکتردا و دەڕۆن، دوای شوانەکەیان کەوتون کە حاخامەکانە.

هەروەها لە سفرەکانی تردا بە ویست و ئارەزووی خۆیان دەستکاریان کردووە، چونکە هەندێک لە پێغەمبەران بە دەستی خۆیان شەهیدیان کردون، پەرتوکەکانیان کە بە سفر یان ئامۆژگاری ناسراوە وەکو دانیال، حەزقیال، ئەرمیا و...هتد سەلامی خوا لە هەموویان بێت، بە تەواوەتی شێواندووە.

زەبووریش جوان پێوەی دیارە کە تەنها بە پادشا و ناوی (داوود) و (سولەیمان) براوە و بوختانی تەواو بۆ حەزرەتی (داوود) کراوە کە گوایە حەزی لە خێزانی سەربازی خۆی کردووە زۆری تر لەو باسانە.

ئەوە حاڵ و ڕەوشتی تەورات و زەبوور و سفرەکانە، پاشان ئینجیل حاڵی لەوانی تر باشتر نییە، بێجگە ئەو چوار ئینجیلەی کە ئێستا دان پیانراوە، لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی نارێکی و دژ بەیەک لە ناو چوار ئینجیلەکەدا هەیە (مارکوس، لوکا، یوحەنا، مەتا)

بگرە تەورات زۆر باشتر بوو چونکە هۆکاری گۆڕانکارییکەی لە زمانی عیبرییەوە دەیانگۆڕی بۆ زمانەکانی تر لە ڕووی ئەحکامەوە. وەکو حەڵاڵ کردنی ڕیبا بۆ هەموو کەس دەشێت، بەڵام جوولەکە لەناو خۆیاندا بە حەرامیان دانا، واتا بۆ جولەکە حەڵاڵە بەکاری بهێنێت لەگەڵ هەموو کەسێکی تر کە یەهودی نییە، ئەمە تەنها نموونەیەک بوو، بەڵام ئینجیل هەموو ئەحکامەکانی گۆڕا لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، وازیان هێنا لە نوێژ، خەتەنەکردن، ڕۆژوو، خواردنی گۆشتی بەراز و سەرباری هەمووی کردنی (عیسا) بە خوا، دروستکردنی ( ناسوت و لاهوت) و زیاد لە سەدان ئینجیل نووسراوە. هیچ کلیسایەک بڕوای بە کلیسایەکی تر نەبوو، دروستکردنی ڕۆژ لە بەهارداو جەژنی هێلکە و هەزارەها بیروباوەڕی کۆنی ئێران، یۆنان و میسر خزێنرایە ناو ئایینی حەزرەتی (عیسا)ی کوڕی مەریەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ)، زۆرێک لە مێژوونووسان هۆکاری ئەو گۆڕانکارییە زۆرەی کە کرا، دەیگەڕێننەوە بۆ پۆڵس کە دەستی سەرەکی تێدا بووە و بە فەرمانی ڕۆم کارەکەی ئەنجام داوە.

ڕۆم پێویستی بە پتەوکردنی شارستانیەتەکەی بوو، ئایینی نەبوو پێویستی بوو کە لەگەڵ زانستی یۆنان دا بنەمایەکی یاسای و ڕەوشتی دابمەزرێنێت بۆ سەربازە چاونەترسەکانی کە شەرەنگێز بوون، هەموو بە هێزی (جێرمەن) ناسرابوون، پۆڵس بنەمای شارستانیەتی ڕۆمی دابەزاند بەسێ کوچکە. هەرچەندە سەرەتا ڕۆما زانستی لە یۆنان گواستەوە بۆ شارستانییەتەکەی، پاشان ئایینی مەسیحی دروستکرد، یان بڵێین نەسرانی، هێزی سەربازی لە جێرمەن وەرگرت.

هەروەکو پرۆفیسۆر (جۆن هیرست) دەڵێت: لە شێوەی سێ گۆشەیەکی بازنەیدا کێشاوە بەم شێوەیە بۆ ئەکادیمای (لاتروب) لە ( ملبورن) لە وڵاتی ئوستورالیادا.




وێنەکە ئاماژەیە کەوا بەم شێوازە شارستانیەتی ڕۆم دامەزراوە، بە گوێرەی تیۆری (جۆن هیرست)، ڕۆم نەیدەزانی بە گوێی کام ئینجیل بکات، ( هیلانە) دایکی ( قوستەنتین) بوو، بووە نەسرانی، کوڕەکەی گەورە کرد تا بێتە پادشای ڕۆم، بووە قەیسەری ڕۆم (هیبلانە) داوای کرد لە قوستەنتینی کوڕی کە ئایینی مەسیحی بکاتە ئایینی فەرمی وڵات ئەویش ڕازی بوو، بەڵام تووشی گەورەترین کێشە بوەوە نەیدەزانی کام ئینجیل ڕاستە!

دوو گرووپ سەریان هەڵدابوو کە لە هەموویان بە هێزتربوون، یەکێکیان ناوی بە تریاک ئیکسندروس بوو لە ئەسکەندەریەی شاری میسر دەیوت: ((عیسا) کوڕی خوایە)، کەسێکی تر بە ناوی (عەبدوڵڵای کوڕی ئەریوس) دەیوت: ((عیسا) بەندەی خوایە)، کاتێک قوستەنتین گوێی لە هەردوولا گرت هەریەک خاوەن بەڵگە و وتەی خۆی بوو، ئەو سەردەمەش سێ کلیسای بەناوبانگ هەبوون کە بریتی بوون لە کلیسای ( ئەسکەندەر، ورمیە و ئەنطاکیە) زیاد لە (٢٠٠٠) کەس لە پیاوانی کلیسا لە ئوسقوف و بەتریاک جۆرەکانی تر لە چین و توێژەکانی پیاوانی ئایینی یەکەم کۆمەڵەیان دروست کرد بەناوی (کۆمەڵەی نیقیە) لە شاری نیقی-یە لە ساڵی ( ٣٢٥) زاینی لە کۆتایدا نزیکەی (٤٠٠) لە ئوسقوفەکان ڕێکەوتن کە بڵێن: (عیسا) کوڕی خوایە، پەنا بە خوا!

پێشتریش، بنەماڵەی قوستەنتین ( ئایینی صابیئیان) هەبوو موشریک بوون، بە گوێی ئەو (٤٠٠) ئوسقوفەی کرد و کۆمەڵەیەکی تری بۆ دروست کردن بە ناوی ( کۆمەڵە نیشتەجێی) کە لە خاکی ڕۆم نیشتەجێی کردن و ئەو دینە بووە ئایینی فەرمی وڵاتی ڕۆم.

ئیتر ئەم (٣٠٠ -٤٠٠) کەسە ئایینی نەسرانی سێ خوایی کە شیرک بوو دایانمەزراند، دژی هەموو بیر و ڕاکانی تری ئایینی نەسرانی بوو، ئەوانەشی کە هەڵگری ئایینی ڕاستی مەسیحی بوون دەکوژران و زیندانی دەکران، بە هۆکاری پادشای ڕۆم قوستەنتین ئەم ئایینە دروستکراو پەرەی سەند، بووە ئایینی سەرتاسەری لە وڵاتی ڕۆم دا پاشان جەنگیان لە پێناودا کرد، کلیسایان

دروست دەکرد. بە شێوەیەک کوفر و شیرکیان بڵاو دەکردەوە، ئینجا گرووپی تریان لێجیابویەوە بە ناوی (ئەستورییەکان) و ( یاعقوبیەکان) ئەمانە بە تەواوی یەکتریان کافر دەکرد لە ئاگری دۆزەخ یەکتریان دەهێشتەوە بە هەتا هەتایی، بیرباوەڕ زۆر گۆڕا وەکو ئبن کەثیر دەڵێت: ئەوەی بڕوای بە (باوک و کوڕ و وشەی پیرۆز نەبوایە دەکوژرا ( اقنوم أب، أقنوم الإبن، أقنوم الكمة) پاشان لە ڕووی فەلسەفییەوە بنەمای (یەکگرتن) و ( تێکەڵ) بوونی خوای لە لاشەی (عیسا)دا دروست کرا بە ناوی (ناسوت و لاهوت).

شوێنکەوتووانی عەبدوڵای کوڕی ئەدیوسیەکان لە سەر حاڵی خۆیان مانەوە و هەر (عیسا)یان بە بەندەی خوا دەزانی و دەیانوت پێغەمبەرە وەکو ئێستای موسوڵمانان.

لە نێوانی سەردەمی (عیسا)ی کوری مەریم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەگەڵ پێغەمبەر محمد ﷺ هیچ پێغەمبەرێک نەهاتووە کە ماوەکەی نزیکەی ( ٦٠٠) ساڵ بووە یان (٥٦٠) ساڵ لە نێوانیاندا هەبووە، هیچ پێغەمبەرێک لە نێوانیادا نەبووە واتا دوای حەزرەتی (عیسا) ڕاستەوخۆ لە نێوانی ئەو ساڵانەدا تەنها پێغەمبەر محمد ﷺ دێت و کە کۆتا پێغەمبەری مرۆڤایەتییە و (عیسا)ی کوڕی مەریەمیش کۆتا پێغەمبەری گەلی ئیسرائیلە، کەواتە بۆ گەلی ئیسرائیل هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت، وا ئێستا دەچنە ناو قۆناغێکی نوێ، ئەویش هاتنی پێغەمبەری ئاخر زەمانە کە ناوی (محمد مصطفی)یە ﷺ.

هەرچەندە باسەکە زۆر زیاتر هەڵدەگرێت لە ژیانی پێغەمبەردا، بەڵام دەبێت باسێکی تر بکەمەوە لە سەر ژیانی پێغەمبەری خوا محمد و پێغەمبەرانی تر سەلامی خوایان لێ بێت.

## مەملەکەتی هەژدەیەم:

## مەملەکەتی نووری محمد ﷺ

پێش باس:- لێرەدا ژیانی پێغەمبەری خوا نانووسمەوە کە هاوشێوەی سیرەتی موبارەکی بێت، چونکە لە کتێبی مەملەکەتی نوور بە چوار بەرگ تا ڕادەیەکی باش لە شێوەی ڕۆماندا باسکراوە و لەبەر دەستدایە.

کەواتە لێرەدا باسێکی نوێ دەکەینەوە ئەویش بۆچی ژیانی پێغەمبەران بۆ محمد پێغەمبەر باسکراوە؟!

پەیوەندی پێغەمبەرانی تر چیبووە بە محمد پێغەمبەرەوە، بۆچی باسی (٢٤) پێغەمبەر کراوە لە قورئاندا بۆ ئەم پێغەمبەرە ئازیزە؟ کورت و پوخت ئەم چەند لاپەڕەی کۆتا تەرخان دەکەین، بۆ ئەوەی بزانین ژیانی پێغەمبەرانی تر بۆچی بۆ ناو قورەیش و باسەکانی ڕابردوو بۆ ئەم ئوممەتە کراوە، کۆکراوەتەوە لە دوو توێی کتێبکێکدا بە ناوی قورئان؟

کەواتە ئەگەر دەتەوێت سیرەتی پێغەمبەر بخوێنیتەوە ئەوا بڕۆ بۆ کتێبی مەملەکەتی نوور، ئەگەر ئەتەوێت بزانیت بۆچی ژیانی پێغەمبەرانی تر بۆ پێغەمبەر و ئوممەتەکەی هاتووە، فەرموو هاو ڕێگا و هاوڕێم لە خزمەتاندا دەبین و باسەکان دەکەینەوە.




## محمد ﷺ و پێغەمبەرایەتی

کۆمەڵگەی قورەیش ژێر دەستەی هیچ لایەک نەبوو، بە واتای ئەوەی پادشا بۆ دانەنرابوو لە لایەن زلهێزانی ئەو سەردەمە، بەڵکو ناوچەیەک بوو لای زلهێزەکانی دنیا جێگای بایەخ نەبوو، نە لەڕووی ستراتیژی سەربازی نە لە ڕووی ستراتیژی ئابوری، کورت و پوخت کۆمەڵگایەکی پەراوێز خراوبوو، بەڵام ناوچەکانی دەوروبەری وەکو وڵاتی (یەمەن) لە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی فارس دا بوو، ناوچەکانی تری باکوور لە بن دەستی ڕۆمدا بوو، هەرچەندە بە ناو قورەیش خۆیان بە لایەنگیری فارس دەزانی، بەو پێیەی کە هەردوولایان هاوبەشدانەر و موشریک و بت پەرست بوون، بەڵام ڕوویەکی فەرمی و ئاشکرای نەبوو وەکو یەمەن، لە کاتی سەفەری بازرگانی تەنها قورەیش بۆ شام خۆیان وا نیشان ئەدا کە گوایە لایەنگری ڕۆمن، ئەمەش تەنها بەرژەوەندی بوو نەک پابەند بوون بە یاسا و ڕێساکانی هەردوو دەوڵەتەوە.

هەردوو دەوڵەتی زلهێزی ئەو سەردەمە فارس و ڕۆم گرنگی و بایەخیان پێ نەئەدا.

ئەم کۆمەڵگەیە خاوەنی شارستانیەت و زانا و فەیلەسوف نەبوون، گرنگی زۆری خەڵکەکەی بە هۆنراوە و بازرگانی بووە، بایەخیان نەئەدا بە ژیان و شارستانیەت، تەنها دەمارگیری عەشیرەتگەرایی کوێری کردبوون، خاوەنی هیچ ئایین و مەبدەئێکی دارێژراو نەبوون، خۆیان بە ئارەزووی دەسەڵاتدار و پیاو مەعقولانیان یاسا و ڕێسایان دادەڕشت، دز و جەردە و ڕێگریان زۆر بووە لەڕووی ڕەوشتەوە داڕمابوون، بەرزترین خانوویان لەدوو نهۆم تێپەڕ نەکردووە، خاوەن شەقام و باڵەخانە و ئەتەکێتی ژیان نەبوون، خاوەنی هیچ فەرهەنگێکی دیاریکراو نەبوون، ئەوەی کە باسدەکرێت تەنها خاوەنی هۆنراوە بوون لە ڕووی ژیانی عەرەبەوە زۆر بەهێز بوون، هەڵبەت قوڕەیش بەتەنها نا، بەڵکو دەشتەکییەکان بەهێز بوون.

واتا بە کۆی گشتی عەرەب زمانەوانیان هەبوو، نەک ناوچەیەک بە تەنها، پاشان خەڵکی ناوچەکە زۆر کەمتەرخەم بوون بۆ ژیان بە هەفتە نانیان نەخواردبایە لایان ئاسایی بوو، لای عەرەب سێ ژەم نانخواردن نەبووە، بەڵکو چەند ڕۆژێک جارێک نانیان خواردووە، بە گشتی لە هەموو ڕووەکانەوە لاوازبوون، تاقەتی بیرکردنەوەیان نەبووە بیریان بۆ نەدەکرایەوە، ناوچەکەیان نە خەڵکی زۆر بوو نە ئاژەڵ و سروشتی جوانی هەبوو، هەموو خۆڵ و خاک و بیابان باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو، ئەگەری چی لێرە و لەوێ، باخوباخات و کشتوکاڵ هەبووە بە ناوچەی نیوەدوورگەی عەرەب، بەڵام زۆر دوور دوورن لە شاری مەککە.

بۆچی باسی مەککە دەکەین؟ لەبەر ئەوەی بنەڕەتی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ لەوێوە دەستی پێکردووە، هۆکارەکەشی لەبەر ئەوەی کەعبەی لێیە ماڵی خوای گەورەیە، کێ دروستی کردووە ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی لە ڕابردوودا بە دوورو درێژی باسکراوە.

کەواتە محمد ﷺ کێ بوو؟ مرۆڤێکی ئاسایی نیوە دوورگەی عەرەب بوو، لە بنەماڵەیەکی ناودار بووە، سەرقاڵی بازرگانی و ئاژەڵداری بوون، محمد ﷺ وەکو هەموو مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە ژیاوە، هیچی لە لاشە و بیرکردنەوەی مرۆڤ بوونی لە خەڵکی قوڕەیش زیاتر و کەمتر نەبووە، لە ڕووی سروشتی مرۆڤ بوونەوە مەبەستمانە، دەنا وەکو ئەوەی کە پێغەمبەرە بەڕێزترین مەخلوقی خوای موتەعال محمد ﷺ.

ئەم پیاوە بەڕێزە ماوەیەک لە ژیانی حەزی بە خەڵوەت بوو، ئەم خەڵوەتە بە واتای دابڕانی لە کۆمەڵگە نییە، بە واتای ئارام بوون لە جەنجاڵی خەڵکی ئەو سەردەمە، دانانی ماوەیەک لە ژیان لە بیرکردنەوە، بیرکردنەوەی ئەو کەسە کە ناوی محمد ﷺ -ە زۆر ئەقڵانی بووە، دەیوت بۆچی هاتووم، کارم چییە؟ بۆ کوێ دەچم؟ کێ دروستی کردوم؟ خوای ئاسمان چییە و ئەم خوایانەی سەر زەوی کە خەڵک دەیپەرستێت واتا بتەکان چین؟ زۆر پرسیاری تریش پێغەمبەری خوا محمد ﷺ -یان سەقاڵ کردبوو، بۆ ئەم مەبەستە ئەم پیاوە بەڕێزەی ناو قوڕەیش کە تەمەنی چڵ ساڵ بوو دەچووە ناوچەی فێنک و ئەشکەوتەکانی دەوروبەری شاری

مەککە، خودی شارەکە لە دۆڵدایە هەموو چواردەوری بە شاخ ڕازاوەتەوە، بەڵام شاخی ڕووتەک و خۆڵاوی لوتکەی شاخەکان تاوێرە بەردی گەورە و زەبەلاحن.

لە پڕ خوای گەورە بۆ ئەم پیاوەی ناو قوڕەیش فریشتەیەک دەنێرێت کە پێشتر بۆ هەموو مرۆڤە پێغەمبەرەکانی تر خوای موتەعال ئەم فریشتەی ناردووە.

ئەم فریشتەیە لە سەر شێوەی مرۆڤ خۆیی نیشانی ئەم پیاوە بەڕێزەی شاری مەککە ئەدا، چەند زانیارییەکی ئەدا بە گوێ ئەم پیاوەدا کە عەرەب زۆر بەبێ نرخ (ئەرزش) تەماشای زانست، قەڵەم، ، بنەڕەتی دروست بوونی مرۆڤ پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ، قودرەت و هێزی خوای پەروەردگار لە دروستکاری دروستکراوەکانی، گۆشت پارەی مرۆڤ، فێرکاری لای خوای بۆ مرۆڤ یان دەکرد.

محمد ﷺ سەرسامە بە دیار ئەم پیاوەوە، وشەکانی لای عەرەب زۆر ئاشنا نییە و کەس باسی نەکردووە، لە ڕابردووشدا کەس گوێی لەم پیاوە نەبووە لە ناو قوڕەیش واتا محمد ﷺ قسەی لەم جۆرە بکات، لە هەمووی سەیر تر لە دوای ئەم چەند دێڕە لە وشە کەسەکە دیار نامێنێت.

بەڵام ئەو وشانە وەکو کۆرسێک بەیەکەوە خۆیان دووبارە دەکەنەوە لە گوێ و دڵ مێشک و هەموو لاشە و گیانی محمد ﷺ خوای گەورە پێ فەرموو: ﴿عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ۝﴾ العلق

واتە: ئەوەی کە مرۆڤ نەیزانیوە خوای گەورە بەهۆی قەڵەم و زانیارییەوە هەموو شتێکی فێر کردوون۝

بەڵام لە هەموو جێگاکانەوە دەنگێک دەهات محمد ﷺ گوێی لێبوو، بەس نەیدەزانی کێیە، هەموو دەنگەکەش بریتی بوو لەوەی ( مژدەت لێ بێت تۆ پێغەمبەری)، لە ناو عەرەبدا هیچ کەس باسی پێغەمبەرایەتی نەکردووە، جورئەتی ئەو قسەیان نەبووە، محمد ﷺ -یش نەک باسی نەکرد، بەڵکو ترس دایگرت و لەرز گرتی لە ناو ترسەکەی، ئەو وشانە هەروا ئاسان نەبوو لەسەر دڵ و دەروونی.

جیاوازی زۆر هەبوو لە نێوانی فەلسەفە و دیندا، فەلسەفە پرسیار دروست دەکات، دین وەڵامی پرسیار ئەداتەوە، ئەم وشانە هەموو وەڵامی پرسیارە نادیارەکانن، ڕاستە عەرەب مێشکی بەکار نەدەهێنا ئەو کات، بەڵام پەیامەکە جیهان دەگرێتەوە، ئەم محمد ﷺ -ەش کۆتا پەیامبەر دەبێت و دەبێت بە پەیامەکەی تا ڕۆژی قیامەت بە هێز و توانا بێت، داخۆ پەیامەکە چی بێت؟!

## قورئان

پەیامی خوای موتەعال بۆ ئەم مرۆڤە لەو جێگایەکدا کە زۆر دواکەوتوون ناوی ناوە قورئان، واتا زۆر خوێندنەوە، مرۆڤ بە زۆر خوێندنەوەی کاریگەری لەسەری دروست دەکات و وشەکانی فێری ئیمان و زانست و حیکمەت ئەزموون، زیرەکی و وریایی...هتد دەکات، بەڵام بە مەرجی ئەوەی هیدایەت وەربگرێت، کەسەکە بڕوای پێ هەبێت.

پێچەوانەکەی ئەگەر مرۆڤێک بە چاوی ئیمانی ڕەخنەگری بخوێنێتەوە، دیسان کاریگەری لەسەر دروست دەکات و زیاتر سەری لێ تێکئەدات و زیاتر بێ ئیمانی دەکات، کاریگەرییەکەی زۆر سەیرە!

هەرچەندە مرۆڤ بە گشتی سوود لە قورئان وەردەگرێت ڕێگا نیشاندەر لە هەموو بوارەکاندا، هیدایەتە بە هەموو خەڵکی، ﴿شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِیٓ أُنزِلَ فِیهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ ﴿١٨٥﴾﴾ البقرة

واتە: مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە خوای گەورە قورئانی پیرۆزی تیادا نارده خوارەوە، ئەم قورئانە هیدایەتە بۆ هەموو خەڵکی﴿١٨٥﴾

کاریگەری زۆر ئەرێنی هەیە بۆ ئیماندار بە دڵنیاییەوە لە ڕووی زیاد بوونی ئیمان و وەرگرتنی پاداشتی زۆر لای خوای گەورە و شیفایە بۆ دڵ و دەروونی نەخۆش، جا نەخۆشی لاشەیی بێت یان دەروونی بێت، چونکە قورئان کەریمە (القران الكريم) واتا خێر و زۆر پڕ فەڕ، ئەگەر کەسێک لە ناو عەرەبدا دەست و دڵی باشبێت دەڵێن کەسێکی کەریمە، قورئانیش کەریمە دڵ نەرم دەکات ئەگەر مرۆڤ شوێن تیلاوەکەی بکەوێت، کەریمە ئەوەی هەڵیدەگرێت پێی عەزیز دەبێت، ئەوەی شوێنی بکەوێت چاکتر و چاکتری دەست دەکەوێت، بەڵام ئیماندار بۆ ئیماندار وایە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِینَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِیَتۡ عَلَیۡهِمۡ ءَایَـٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِیمَـٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ یَتَوَكَّلُونَ﴿٢﴾﴾ الأنفال

واتە: ئیمانداری ڕاستەقینە تەنها ئەو کەسانەن کاتێك کە یادی خوای گەورەیان لەلا ئەکرێت و ناوی خوای گەورەیان لا دێنیت دڵیان دەترسێت و دێتە لەرزین، کاتێك بیەوێت تاوان بکات پێی بڵێیت: لە خوا بترسە، دڵی دەترسێت و دێتە لەرزین، کاتێك کە ئایەتەکانی خوای گەورەیان بەسەردا ئەخوێندرێتەوە ئیمانیان پێی زیاد ئەکات، تەنها پشت بە خوای گەورە ئەبەستن و کارەکانیان تەنها بەخوای گەورە ئەسپێرن﴿٢﴾

پێچەوانەکە بۆ کافر و مونافق، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كَٰفِرُونَ﴿١٢٥﴾﴾ التوبة

واتە: کاتێك کە سورەتێك دائەبەزێت لەناو مونافیقان هەیە ئەڵێت: ئەم سورەتە کە دابەزی کامتان ئیمانتان پێی زیادی کرد؟ واتە: گاڵتە بە ئیمانداران ئەکەن، ئەوانەی کە باوەڕداری ڕاستەقینەن ئیمانیان زیاد ئەکات بەدابەزینی سورەتێك و دڵیان پێی خۆشە و موژدە ئەدەن بە یەکتری﴿١٢٤﴾ بەڵام ئەوانەی کە نەخۆشی گومان لە دڵیاندا هەیە لە مونافیقان، بە دابەزینی هەر سورەتێك ئەوان پیسییان زیاد ئەکات لەسەر پیسیان، گومان و نیفاقیان زیاد دەکات لەسەر گومان و نیفاقی پێشتریان کە بەردەوام بن لەسەر ئەو نیفاقە بەکافری ئەمرن﴿١٢٥﴾

ئەویش کاریگەری ئەو قورئانەیە لەسەر خەڵکی جا بە دوو بەشەکەیەوە موسوڵمان و کافر، ئەم قورئانە هاتە خوار، هەموو پێغەمبەران خاوەنی موعجیزەی تایبەت بوون، موعجیزەی سەرەکیان هەبوو، محمد ﷺ خاوەنی موعجیزەی تایبەت بوو ئەویش ئەم قورئانەیە.

پوختەی باس حەزرەتی محمد ﷺ -یش پێغەمبەرە لە ڕێگای جوبرەئیلەوە پەیامی بۆ هاتووە ناوی قورئانە.

## پەیوەندی ئایینی ئیسلام بە پێغەمبەرانەوە

هەر ئایینێک هاتووە بێجگە ئایینی ئاسمانی ڕاست کە یەک ئاینە لە ئادەمەوە تا محمد سەلامی خوا لە هەموو پێغەمبەران هەر یەک داواکاریە، تەنها لە شەریعەتدا جیاواز بوون بە گوێرەی قۆناغەکانی سەردەم، بەڵام ئایینی دەستکرد و شێوێنراو تەنها لە خۆی زیاتر دان بە کەسی تردا نانێت، ئایینی ئیسلام بە برای خۆی داناوە چونکە بە ئاڕاستەی وەحی پەروەردە کراوە.

هاتنی هەر پێغەمبەرێک ناوی لە قورئاندا مەبەستێکی تایبەتی لەخۆ گرتووە، حیکمەت و زانست و زانیاری تێدایە و ئەزموونێکی زیاتری خستۆتە سەر ئەزموونی ئوممەتی محمد ﷺ.

بەو تێگەیشتنە قووڵەوە تەماشای ژیانی پێغەمبەران دەکەین کە هاتووە لە ناو قورئاندا بۆ پێغەمبەر و ئوممەتەکەی.

ئیسلام باسی پێغەمبەران و گەلەکانیانی کردووە، چۆن بوون داوای چیان کردووە و چۆن چۆنی حەزیان بە دینداری کردووە، هەموو پێغەمبەرانی ڕابردوو داوای موعجیزەی هەستەکانیان لێ دەکردن، حەزیان لەوە بوو کە بینراو بیستراو دەست لێدراو بۆن کراو هەست پێ کراو بزانێت، لە ئایینەکاندا شتی بەرجەستەیان هەبێت.

ئیسلام ڕێک پێچەوانەیە بە دوای بەرجەستەوە نییە و بە دوای ئەقڵانی بوونەیەوە، بۆیە ئەگەر تەماشا بکەین هەموو گوتاری قورئان ئەقڵانییە، جا بۆ قورەیش بێت یان خەڵکی بە گشتی.

## ئەقڵانییەت لە گوتاری قورئانی

پێغەمبەری خوا کە قورئانی بۆ هات بە دوو شێوە قورئانی بۆ ئاراستە دەکرا لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، جۆرێکیان بە هۆکار بوو، جۆرێکی تر بێ هۆکار کە زۆرینەی قورئان بێ هۆکار دابەزیوە، بەڵام بێ هۆکارەکە ڕاستە کەسێک یان ڕووداوێکی تایبەت نەبووە بە هۆکاری تا دابەزێت، بەڵام خودی ڕەوشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە تێیدا ژیاوە گەورەترین هۆکار بووە، کە دواییدا بە درێژی باسەکەشی دەکەین لە لێکۆڵینەوەکە دا دەردەکەوێت وەڵامەکە.

ئەگەر نموونەیەک وەربگرین لە قورئاندا خوای گەورە چۆن پەیوەندی نێوان بەندایەتی بە چواردەوەرمانەوەیە یان بە ژینگەوە دەبەستێتەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾﴾ البقرة

واتە: ئەی خەڵکینە ئێوە عیبادەتی ئەو پەروەردگارەتان بکەن کە ئێوەی دروست کردووە و ئەوانەی پێش ئێوەیشی دروست کردووە، بەڵکو تەقوای خوای گەورە بکەن و لێی بترسێن﴿٢١﴾ ئەو خوایەی کە ئەو زەویەی بۆ ئێوە کردووە بە ڕاخەر و لەسەری جێگیر بوون، ئەو ئاسمانەشی وەکو سەقفێکی پارێزراو بەسەر زەوییەوە داناوە لەو ئاسمانەیشەوە بارانتان بۆ ئەبارێنێ، بەهۆی ئەو بارانەیشەوە لە زەوی جۆرەها بەروبووم و بەرهەمتان بۆ ئەڕوێنێ و بۆ دەرئەکات، دەی ئێوە هیچ هاوەڵێك بۆ خوای گەورە، بڕیار مەدەن لە کاتێکدا کە ئێوە ئەزانن ئەو کەسانەی کردووتانن بە شەریك بۆ خوای گەورە ئەوان ئێوەیان دروست نەکردووە و زەوییان بۆ ڕانەخستوون و ئاسمانیان بۆ ڕانەگرتوون و بارانیان بۆ نەباراندوون و ڕووەك و بەروبوومیان لە زەوییەوە بۆ دەرنەکردوون و ئەزانن کە خوای گەورە شەریکی نییە﴿٢٢﴾

لەگەڵ ئەوەی داوای بەندایەتیان لێ دەکات لە ڕبوبیەت و ئولوهیەت، لە هەمان کاتدا داوایان لێ دەکات کە هاوبەش بڕیار نەدەن، خوای ئەوانەی کە مردووون و خوای ئەوانەش کە لە ژیاندان خوای نەوەکانی داهاتوو، هەریەک خوایە، ئینجا سەرنجی ئەقڵانی بوونیت ڕادەکێشێ بەلای ژینگە و گەردووندا.

بە عیبادەتێکی زۆر ئاسان پێت دەفەرموێت، بەڵام بۆ خەڵکی خاوەن هۆش و بیر و واتەیەکی پڕ زانستە، ئەو زەوییەی کە ڕایخستووە وەکو فەرش واتای ئەوە نییە بە تەنها بە سەریدا بڕژێت، بەڵکو ئەوە ڕاڤە سەرەتایەکەیەتی، بنەڕەت ئەوەیە هەر شتێک فەرشکرا واتا جێگای ئارامی و پشوودان لەگەڵیدا کەرەستەی ژیانی تێدایە، کە لە جێگاکانی تردا ئەو ئارامی و جێگای پشووە نابینیت لە سەر ئەستێرەکانی تردا، جێگای هەناسەدان و سەوزایی و... هتد هەموو شتێکی تێدا فەراهەم هێناوە.

لە دوای ئەوە دەفەرموێت: ئاسمان بووتە بونیاد، کە بونیاد لە ئاسمان هەبوو ژیانیش لەسەر زەوی ڕاخرا، ئەو دوانە پەیوەندییەکی زۆر گرنگ و تەندروستیان پێکەوە هەیە کە چنراوی یەک ئامانجە، جا چ پەیوەندی بە ڕۆشنایی، هێزی ڕاکێشان، گەرمی و ساردی، پەستانی نزم و بەرز و هەموو ئەمانە و زۆری تریش لە توخمە هەواو بەرگە هەواکاندا، هەمووی سەرنج ڕاکێشانی تۆی مرۆڤە لەگەڵ بەندایەتیدا، بەڵام بە گوتارێکی ئەقڵانی، بۆ ئەوەی توانا و هێزی خالق دەردەخات تا مەخلوق بیپەرستێت.

دوای ئەم دیمەنانە دیمەنی گەورەی ژیان دەخاتە پێش چاومان، ئەویش باران و ئاوی سازگار و بەروبوومی کووشتوکاڵییە، ئەو ئاوەی لە ئاسمانەوە دێت ئاوی ژیانە، خۆ ئەگەر هەروەکو دەریاکان سوێر بوایە ئەوا سوودی نەبوو نە بۆ مرۆڤ نە بۆ گژ و گیا و درەخت و گیاندارانی تر بە گشتی، لە ڕۆژێکدا دارێک ٤٠٠ لیتر ئاوی پێویستە، ئەگەر زەوی ئەو ئاوە کۆنەکاتەوە و نەیپارێزێت لە کوێ ڕووبار، کانیاو چەم و ئاوی سازگار سوودی لێ وەربگرین تەماشای خاک و ئاو بکە، ملیۆنەها جۆر لە سەوزە و میوە و دانەوێڵە لە یەک خاک و ئاو بەرهەم دێت.

هەموو ئەمانەی ئاماژەمان پێداوە ئایەتە کەونییەکانی قورئان هەزارەها نموونەی وای لە خۆگرتوە بۆ وەرزش پێکردنی ئەقڵ و بیر و هێزی مرۆڤایەتی، بێجگە ئەقڵانی بوونەکە خودی باسەکان ئیعجاز و موعجیزەن لە ناو کۆمەڵگەیەکی ئەو دوورگە عەرەبییە کە ساڵانی خۆیان ناوناوە بە جاهیلی، قورئانێک دێت گوتارەکەی (١٠٠٪) ئەقڵانییە، داوای بە ئەقڵانی بوونی کۆمەڵگەکەش دەکات لە ڕێگای قورئان و پێغەمبەر و ئایینەکە، خۆ عەرەب نەیدەزانی تیۆری بیگ بانگ چییە، بەڵام کاتێک کە قورئان باسی تیۆری بیگ بانگی دەکرد بۆ ئەعرابییەک وشە قورئانییەکە کاریگەری هەبوو تا خودی تیۆرەکەی بۆ من کە عەرەبی زانم و عەجەم باسی تیۆری (بیگ بانگ) گرنگە، خوای گەورە کە قورئانی دابەزاند ڕێک باسی ئەو تیۆرە زانستیە کە ساڵانی

٦٠ دۆزراوەتەوە یاخود بووە بەزانست، زاتی پاکی ١٤٤٠ ساڵ پێش ئێستا ئاماژەی پێدراوە بۆ پێغەمبەر و ئوممەتەکەی دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴿٣٠﴾﴾ الأنبياء

واتە: ئایا کافران نابینن و بیر ناکەنەوە کە ئاسمانەکان و زەوی لەسەرەتادا یەك پارچەیەك بوونە پاشان خوای گەورە لێکی جیا کردونەتەوە و وای لە ئاسمان کردووە باران ببارێنێت و وای لە زەوی کردووە ڕووەك بڕوێنێت کە پێشتر وا نەبوونە، لە ئاویش هەموو شتێکمان زیندووو کردووە و دروست کردووە وەکو ئاژەڵەکان و ڕووەکەکان، وە ئاو هۆکاری ژیانی هەموو زیندەوەرێکە ئەی ئیتر بۆ ئیمان ناهێنن بە خوای گەورە﴿٣٠﴾

یاخود دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴿٤٧﴾﴾ الذاريات

واتە: ئاسمانیشمان دروست کردووە بەهێزو توانا، (أَيْد) جیاوازە لە (يَدْ)، (يَدْ) واتە: دەست (أَيْد) واتە: بەهێز، ئێمە بەردەوام فراوانی ئەکەینەوە و توانای فراوان کردنەوەمان هەیە و بەرزمان کردۆتەوە و بەبێ کۆڵەکە ڕامانگرتووە﴿٤٧﴾

ئەم دوو نموونە زانستییە پوختە هەموو عەرەب بە هاوەڵانیشەوە نەیانکردۆتەوە تیۆرێکی زانستی گەردوونی، بەڵکو تێگەیشتنیان بۆ بابەتەکە ئەوەندە قووڵ بووە لە ڕووی زمانەوانیەوە خەلقی ئەم گەردوونەیان پێ ناسیوە، بەڵام بێ گومان زمانەکەی کاریگەرییەکەی بۆ دروست کردوون، بۆ زانایەک و کەسێکی ئەکادیمی لە زانکۆ لە ئێستادا بۆ ئەو خودی زمانەکە نییە کە چێژی لێ وەرناگری و سەرسام نابێت پێ، بەڵکو سەرسامە بە تیۆرە زانستییەکە کە هەمووی لە سەدەکانی ڕابردوودا دۆزراونەتەوە، کەواتە محمد ﷺ ئەمانەی چۆن زانی؟ وەڵامەکە ئاسانە لەبەر ئەوەی پێغەمبەرە.

## پێغەمبەر ئادەم (عليه السلام) پەیوەندی بە محمد ﷺ پێغەمبەرەوە

باسی ژیانی ئادەم و ڕووداوەکانی بۆ پێغەمبەری ئازیز و کۆمەڵگەکەی و پاشان ڕوونکردنەوەی نهێنییەکانی ناوی زۆر جیاوازترە لەوەی کە بانگەوازی کلاسیکی زۆر بە سادە و ساکاری باسی دەکەن، هیچی سەرچاوەکەی خودی ئیسلام نییە وەریانگرتووە، بەڵکو گوتاری تەوراتی و ئەهلی کیتابە کە بۆ ئوممەتی ئیسلامی باس دەکەن، هەڵبەت زۆرینەی بانگخوازەکان لە کۆن و نوێدا بەو شێوە و سەردە مێژوویە باسی دەکەن، کۆمەڵێکی زۆر کەمیش هەن کە بە گوێرەی واقعی ڕاست و دروستی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ڕووداوی دروست بوونی مرۆڤ و خودی پێغەمبەرایەتی ئادەم، پێش باسی ئەم مێژووە هۆکار باس ناکرێت کە

ئێمەی مرۆڤ کارمان چییە بەسەر دروست بوونی ئادەم و حەواء، بگرە زۆر خورافیاتی و بێ مانا باس کراوە کە وای لێ هاتووە کۆمەڵێک خەڵکی لاو و ڕۆشنفکر نەک بە ئەفسانەی دەزانن، بەڵکو زۆر بە سادە و ساکار تەماشای دەکەن، هیچ تام و بۆنی مەعریفی تێدا نابینن. هۆکارەکەی ئەوەیە لە بنەڕەتەوە باسەکە نەکراوە چیە و بۆچی ڕووداوی ژیانی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە بۆ محمد ﷺ کراوە، لە کۆمەڵگەیەکی جاهیلی کە زۆر جاهیل بوون، پاشان چ سوودێکی هەیە بۆ ژیانی ئەمڕۆی گەلان؟

باسکردنی ژیانی ئادەم بەو سادەیی و ساکارییەی کە مامۆستا و گەنجەکانی ئەمڕۆ لێی تێگەیشتوون، لە چەند کتێبێکی مێژووی کۆن تێپەڕیان نەکردووە، باسی ئادەم (عَلَيهِ السَّلَام) بە واتای دروست بوونی یەکەم بنەمای شارستانی لە ڕێگای هێزی زانست و دین بە واتای خوا پەرستی و مەنهەج و دامەزراندنی کۆمەڵ و کۆمەڵگە، ڕێکخستنی خێزان و خستنەوەی نەوە، بە واتای کۆمەڵگە ئەوەش سێ کوچکەی پێکهاتەی شارستانیەتە.

## بۆچی باسی ئادەم (عَلَيهِ السَّلَام) کراوە بۆ محمد ﷺ

ژیانی هەر پێغەمبەرێک پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە ژیانی پێغەمبەر محمد ﷺ و کۆمەڵگە و ئوممەتەکەی تا ڕۆژی قیامەت، هەروا ڕووداو و مێژوویەکی چیرۆکئامێز نییە، بەڵکو بۆ پەند وەرگرتنە. ئەگەرچی بەشێک لە ڕووداوەکانی پەند و وانەئامێزە، بەڵکو لە ڕاستیدا زۆر لەوە قووڵترە بونیادی لە سەر دەکرێت لەهەموو کات سەردەمێک دا، ئاواتی هەڵسانەوە و شۆڕش و ڕاپەڕینە.

عەرەبی جاهیلی لە نەسەبدا زیرەک بوون، هەموو عەرەب خۆی دەگەیاندەوە ئیبراهیم لە ڕێگای ئیسماعیلی کوڕیەوە سەلامی خوا لە هەردووکیان بێت، ئەمەش بۆ عەرەبە خوێندەوارەکان بوو کە نزیک بوون لە شارستانییەتەکانی عەجەم و ڕۆم، دەیانخوێندەوە بۆ ئەوەی خاوەنی کەرەستەی شیعری بن.

ناوی ئادەم و حەوا و کوڕانی لە قابیل و هابیل و ئیدریس و شیث، لەم ناوانە لە ناو عەرەبدا بوونی نەبوو، دوای هاتنی ئیسلام پێغەمبەری خوا ﷺ وشەی بەنی ئادەمی بەکارهێنا، لە ناوی عەرەبدا ناوی ئادەم یان ئیدریس یاخود شیث...هتد بوونی نەبووە، چونکە نەیاندەزانی کێن.

کە باسی ئادەم هات لە شاری مەکە عەرەب هیچی لە بارەوە نەدەزانی لە تەورات دا باسێکی حەزرەتی ئادەم هاتووە، کە زۆر جیاوازترە لە باسی ئادەمی قورئان کە بۆ پێغەمبەر هاتووە، دواتر لە باسەکەماندا زیاتر ڕوون دەبێتەوە کە جیاوازییەکە چییە.

گەڕانەوە بۆ ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی بزانین هۆکارە سەرەکییەکەی چییە کە ناوی ئادەم و خێزانی و منداڵەکانی لە قورئاندا هاتووە و عەرەبی جاهیلی چ سوودێکی لێ وەردەگرن؟!

باسەکە بە وردی و بە قووڵی و بە درێژی:

عەرەب خاوەنی هیچ کیانێک و سیستەمێک نەبووە، نە لە ڕووی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوورییەوە، تەنانەت پێش هاتنی ئیسلام خاوەنی زمانێکی عەرەبی یەکگرتوو نەبوون، بەڵکو زمانی زۆر جیاوازیان هەبوو، لە زاراوە و ناوچەش دەرچوو بوو، هەروەکو ئەمڕۆ هەرگیز عەرەبێکی عێراقی ناتوانێت لە عەرەبێکی جەزائیری و مەغریبی باش تێبگات. [46]

واتا لە نیوە دوورگەی عەرەبیدا زۆربەی ناوچەکان زمانیان جیاواز بوو، هەرچەندە ئەمە دیاردەیەکی ئاساییە لەگەڵ هەموو زمانەکانی دنیادا ڕوو ئەدات ئەگەر ناوچەکانیان بەربڵاو بێت، عەرەبیش ناوچەکانیان زۆر بەربڵاو بوو، قورئان هاتووە، بە زمانی قوڕەیش هاتووە هەر قورئانیش وای کرد لە زمانی قوڕەیش بەسەر هەموو زاراوەکانی تردا زاڵ بێت.

لە ڕاستیدا بوونی زمانەکانی تر یان زاراوە جیاوازییە عەرەبەکانی تر هیچی نەماوە، مەگەر لە تەفسیر یاخود یاداشتێک لە کتێبەکاندا نووسرابێتەوە، هەروەها عورف و دابونەریتی عەشیرەتێکی عەرەبی زۆر جیاوازتر بوو لە دابونەریت و کلتوری عەشیرەتێکی عەرەب، ئەو جیاوازییانەش جیاوازی دەخستە نێوانی عەرەب تا یەکبوون و تەبایی بوونیان، عەرەب خاوەنی هیچ ئاکار و ڕەوشتێکی کۆمەڵایەتی یەکگرتوو نەبوون، بۆ نموونە لە ڕووی هاوسەرگیریەوە، جۆرەها هاوسەرگیری جیاوازیان هەبوو کە لای هەندێک هۆز جۆرێکیان زۆر پەسەند بوو لای هۆزەکانی تر زۆر نەنگی و شەرم بوو، لای هەندێکیان وەکو پیرۆزی تەماشا دەکرا، لای هەندێکی تر بە چاوی سووک!

نموونەی هاوسەرگیری (الإستبضاع): پیاوێک ژنەکەی خۆی دەنارد بۆلای سەرۆک عەشیرەتێک یان بەگزادەیەک تا نەوەی باش و وەچەی باش بخاتەوە، بەڵکو منداڵێکی نەجیب و خانەدان بخاتەوە، خودی بیرۆکەکە لە جووت بوونی ئەسپەوە وەرگیرابوو!

یان هاوسەرگیری بەکۆمەڵ پیاوان دەچوونە لای ژنێک تا منداڵی دەبوو، منداڵەکەی لەدایک دەبوو لەکام پیاو بچوایە دەبووە ژنی هەمیشەیی و منداڵەکە لە نەسەبی ئەو هەژمار دەکرا!

---

[46]- دکتۆر جەواد عەلی لە کتێبی مێژووی عەرەب پێش ئیسلام بەرگی ٤ ل ٢٧٥، باسی دەکات کە عەرەب خاوەنی زمانێکی یەکگرتوو نەبوون.

هەروەها لە بواری میرات دا جۆرەها کلتوری ناپەسەند و ناتەندروستی هەبوو، نموونەی عەشیرەتی وا هەبوو هاوڕێی باش و دڵسۆز ئەبووە طەرەفی میراتگری، بەڵام هاوسەرەکەی میراتی نەدەگرت. جاری واش هەبوو لە هەموو منداڵەکانی زیاتری دەبرد، هەرچەندە زۆرجار تەنها ئافرەت لە هاوسەرەکەی میراتی دەگرت، وەکو ئافرەتانی بەناو بانگی عەرەب، وەکو خەدیجە کچی خوەیلید، لە زۆر جێگای تردا کچەکانیان زیندە بەچاڵ دەکرد، لە هەندێک جێگادا طەلاقدان واتای کوشتن بوو، واتا فەرمانی لەسێدارەدان بوو، لە ناو هەندێ عەشیرەتی تردا طەلاق جۆری تایبەتی هەبوو، ئەگەر پیاوێک ژنەکەی طەلاق بدات بۆ هاوسەرگیری تر، دەبێت هاوسەری یەکەمی ڕازیبێت! جۆری طەلاقی تر دوورکەوتنەوەی پیاو بوو لە هاوسەرەکەی بۆ ماوەی دوو ساڵ یان زیاتر!

سزاکان و یاسا و عورفەکان زۆر جیاواز بوون، زۆرجار یەک تاوان جۆرەها سزای هەبوو بە گوێرەی عەشیرەتەکان دەگۆڕا، لەسەر پەڕاندن بە شمشێر، لە خاچدان، ڕەجم بە بەرد و هەڵواسین تا خنکاندنی...هتد، ئەمانەش هەموو ئەوە ئاشکرا دەکەن کە دەسەڵاتی سیاسی یەکگرتوو نەبوو لە ناو عەرەبا، هیچ ناوەند و سەنتەرێکی یەکگرتووی بڕیاردان نەبوو هەموو جیاواز و پەرش و بڵاو بوون، جاروبار دەوڵەتی بچووک سەری هەڵئەدا وەکو دەوڵەتی (کیندە).[47]

ئەم دەوڵەتە بچووکانە زیاتر خۆی پاراستبوو لە ڕێگای عەشیرەتە گەورەکانەوە، بەڵام هاوپەیمانی دوو عەشیرەتی تری گەورە ئەویان لە ناو دەبرد، هەریەکە لەو عەشیرەت و هۆزە بە دوای فراوانی قەڵەم ڕەویاندا بوون. مەملەکەتە بچووکەکان خۆیان ناونابوو دەوڵەت و پادشای هەموو سەرۆک عەشیرەت بوون، تەنانەت شارستانیان نەبوو، تەنها خاوەنی جێگایەکی تایبەت بوون بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵی عەشیرەکە و ناوی دەخۆی نابوو پادشا، تەنها وەکو شەرەف و ئیمتیازێک بۆ عەشیرەتەکەی، سەرچاوەی باوەڕپێکراوی ئینسکلۆپیدیای جیهانی باسی لەوە کردووە کە جەنگی هۆزەکان ماوەی ساڵانێکی دوورودرێژی خایاندووە بگرە چۆتە سەدە جەنگەکانیان، جەنگەکانیشیان لەسەر پارچەیە شیعری هەجوو بووە یان لە سەر دزینی ئەسپێک بووە، یاخود لە نێوان خودی سەرۆک عەشیرەتەکاندا بووە.

ئەمە باری سیاسی و کۆمەڵایەتی عەرەب بوو، لە ڕووی ئاینەوە هەموویان بت پەرست بوون، لە ڕاستیدا دەبوو ئاینەکەیان هۆکاری کۆکردنەوە ویەک ڕیزییان بوایە، بەڵام ڕێک پێچەوانەکەی، بووە هۆکاری زیاتر پارچە پارچەی ئەو نەتەوە بوو بە گشتی.

عەرەب خاوەنی زۆرێک لە بتی جۆراو جۆر بوو کە خۆی ئەدا لە (٣٦٠) بت، ئەگەرچی هەموو لە ناو شاری مەککە و دەوروپشتی دا بوو، بەڵام مرۆڤی جاهیلی ئەو سەردەمە هەموو

[47] د. جواد عەلی لە کتێبی مێژووی عەرەب پێش ئیسلام بەرگی ٤ ، ل٥٩.

ئەو بتانەی دەپەرست، بەڵکو هەر هۆز و عەشیرەتە خاوەنی بتی تایبەتی خۆی بوو یان کۆمەڵێک لە بتەکان تایبەت بوون بە هۆزێک. عەرەب خاوەنی مەرجەعییەتی بتپەرستیش نەبوو، جیاواز بوون لە پەرستنی بتەکاندا، خۆریان دەپەرست بۆ ئەوەی لە قیامەت سوودیان پێ بگەیەنێت، عەرەب بە هیچ شێوەیەک بڕوای بە زیندووبوونەوە نەبوو، بەڵکو ئەم بتانە پیرۆز بوون، هەندێک لە عەرەب پێیان وابوو کە بتەکان ڕۆحی فریشتەیان چۆتە ناو، ئەیپەرستن تا لە خوایان نزیک بکاتەوە، پاشان بەخت و چانسێکی باشیان هەبێت لە دنیادا، جا چ لە ڕووی بازرگانی بێت یان ئاژەڵداری، یان پاراستنی ماڵ و خێزان و سەروەت و سامان. ئەو بتانە ( لات و مەنات و هوبەل) کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەبوو بە قورەیشەوە، پانتاییەکی زۆری گرتبوو لە ڕووی بیروباوەڕەوە لەناو عەرەبدا، واتا زۆر جار گەورەی هۆز و عەشیرەتەکان قورسایی زۆریان ئەدایە بتەکان بۆ پەرستن.

کەواتە هیچ هۆکار و کردارێکی وانەبوو کە خودی بتەکانیشیان کۆیان بکەنەوە، بەڵکو زیاتر جیاوازی و پارچە پارچەی خستبووە نێوانیان.

هەر بتێک لەو بتانە زیاتر و زیاتر گۆشەگیری ئەدایە عەشیرەت و هۆزەکان، عەرەب بڕوایان بە خوایەک هەبوو کە خالقە و ڕازقە لە ئاسمان، ئەمەش بەشێکی ئایینی حەنەفی بوو لە ناویدا مابوەوە، بەڵام قورئان دەفەرموێت. بۆیە بتەکانیان دەپەرست تا لە خوا نزیکیان بکاتەوە، کەواتە پارچە پارچەیی لە ناو عەرەبدا هاوبەش بووە لە ناو هەموو هۆزەکاندا و عەرەب هاودەنگ بوون لە سەر پارچە پارچەی.

مرۆڤی جاهیلی لەسەر ئەو ڕەوش و واقیعەی کە ئاماژەمان پێدا خەڵکێکی تەپوتۆز بوون بە گۆشت خوێن، خاوەنی هیچ ئامانجێک نەبوون و نەیاندەزانی بۆچیش دەمرن، خاوەنی دید و بۆچوونێکی ڕوون نەبوون بۆ ژیان، ئەم دابڕان و پارچە پارچەییە وای کردبوو تووشی سەر لێ شێواوی و نەهامەتی کوێری ژیانی کردبوون، خاوەنی بیروباوەڕێکی ڕوون نەبوون، نەشیاندەزانی بۆچی خوا دەپەرستن، تەنها کۆمەڵێک بیرکردنەوەی منداڵانە و سەرەتایی بووە لایان، لە چوارچێوەی دۆڵابی هۆزەکەیاندا بوون، لەو چوارچێوەیە دەرنەدەچوون، هەستیان بەوە نەدەکرد کە لەدەرەوەی ئەو دۆڵاب و سندووقە جیهانێکی زۆر فراوانتر هەیە تەماشای ژیان و گەردونیان لە هۆزەکەیانەوە دەکرد، کورت و پوخت زۆر تەمبەڵ بوون لە بیرکردنەوە، بگرە تاقەتی بیرکردنەوەیان نەبوو چونکە لە سندوقێکدا دەژیان هەموو وردو درشتی ئەو حاڵەتە دەروونییە بوو لە ڕووی سیاسی، ئایینی و ئابووری...هتد تێدا دەژیان، زۆر داماو بوون لە ڕووی ئامانج و دەستنیشانکردنی ئامانج، دەستەوسانی تەواو بوون. هەرگیز نەیاندەزانی بڕوا بەوە بکەن کە مەبەست و ئامانجێک هەیە لە ژیان و لە پشتی ژیانەوە، هەموو شتێک تەپوتۆز بوو لەو بیابانەدا کۆتایی دەهات، هەموو هۆکاری ئەوانە باسمان کرد، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هیچیان لە بارەی ڕووداوی دروست بوونی مرۆڤ و کاری مرۆڤ و ئامانجی مرۆڤ نەبوو.

## سەرەتا دەرکەوتنی ئامانجەکە لە ئادەم دا

هۆکاری سەرەکی جەهالەتی عەرەب دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی نەیاندەزانی سەرەتای دروست بوونی مرۆڤ و ناساندنی یەکەم مرۆڤی ناسراو لە سەرزەوی کە ئادەم-ە کاری چی بووە، بۆچی هاتووە، پێغەمبەر بووە بۆ کێ؟

سەید قطب دەڵێت: "قۆناغێک لە قۆناغەکانی سەردەم و کۆتایی هاتبێت"، بەڵکو لەگەڵ هەموو سەردەمێکدا وەکو هێڵی ڕاست دەڕوات، ئەگەر بڵێین هێڵی جاهیلی ڕێگا دەبڕێت لەگەڵ ڕێگای تەوحید و خواناسیدا بە تەرتیبی تا ڕۆژی قیامەت.

لەسەرەتای دروستبوونی هەندێک لە بتەکانیان لا وو، بە خورافی وتەی بە تاڵ، لەوە زیاتر هیچیان لە بارەی درستبوونی گەردوون و زەوی و مرۆڤیان بە هیچ شێوەیەک نەدەزانی.

بە دڵنیاییەوە نەزانی بوارەکانی دروست بوونی گەردوون و زەوی بە واتا ژیان و دروستبوونی مرۆڤ ئەو بیروباوەڕە جاهیلیە و نەزانییە پێچەوانە دەکاتەوە، هەمیشە ڕووداوی بەدیهاتن (خلق) لەگەڵ هەموو ئایینێکی ئاسمانی یاخود بتپەرستی ڕێدەکات، ڕووداو و گێڕانەوەی مێژووی بەدیهاتن هەروا باسێکی ساکار و سادە نییە، بەڵکو دید و تێڕوانین هەموو ئایینەکان و دنیابینییان دەردەخات، جا هەریەکە دید و تێڕوانینی ئەرێنی و نەرێنی لە گۆڕانکراوی ناو ئایینەکان.

نەبوونی زانیاری لەسەر بەدیهاتنی گەردوون، ژیان و مرۆڤ لە جاهیلەیەتە، ئەوەی پێچەوانە کردەوە، کە مرۆڤ هیچ تێڕوانینیکی نییە بە نەفسی مرۆڤ و جیهانی چوار دەوری.

کەواتە لە نەبوونی زانیاری و زانست لەسەر بە دیهاتنی و بێ ئامانج و مەبەست لە ژیاندا دروست دەبێت، بگرە بیرو باوەڕی جاهیلی دروست دەبێت و هیچ هیوای بە ژیان نابێت، ئەویش لە نەبوونی ئامانجدا ڕووئەدات.

ئەتوانین بڵێین: هەموو شارستانییەتێک کە بونیاد نراوە، ئەگەر جیهانبینی بەدیهاتنی لەگەڵ نەبووبێت لە گەردوون و ژیان و مرۆڤ ئەوا نەیتوانیوە ببێتە ژیار و شارستانیەت، جا لە شارستانیەتی بابل-ەوە بیگرە پێش (٨٠٠٠) ساڵ بەر لە ئێستادا، شارستانیەتی ڕۆژئاوای ئەمڕۆ کە سەرمایەداری هەروا بە ئاسانی و بێ مەبەست و ئامانج نییە، تیۆری داروینی، فرۆیدی و نیتچەیی بە بەرز و زیندووو لە ڕۆژئاوادا ڕاگیراوە، چونکە بونیادی ژیان و شارستانی خۆیانیان لەسەر بیناکردووە، لە ڕابردوودا شارستانییەتی ئیسلامی و ڕابردووتریش ڕۆم و فیرعەونەکان و فارسەکان، بنەڕەتی جیهانبینی بەدیهاتنیان هەبوو.

گەڕانەوە بۆ قوڵایی باسەکەمان، مرۆڤی جاهیلی لە بارەی بەدیهاتنەوە نەزانیوە، هەر بۆیە پەنای بردووە بۆ پەرستنی بت و داروبەردی ڕەق و بێگیان.

مرۆڤی جاهیلی بیابانێکی خۆڵ بووە لە خۆڵەوە بۆتەوە بە خۆڵ، نەبووە بە مرۆڤێکی قوڕ تا ببێتە باخوباخات و دنیا ئاوەدان بکاتەوە، بەڵکو هەر خۆڵ بووە لە سەحرا و بیاباندا ون بووە.

مانای وا نیە سەحرا خراپە، نا؛ بەڵکو لە خودی سەحرا و بیابیانی دوورودرێژ دەیان وزەی بە هێزی کارەبای و تەوەری لێ وەردەگیرێت، بەڵام مەبەستمان لە خەڵکی جاهیلییە کە وەکو خۆڵ وان و با بە ئارەزووی خۆی لە کوێ بیەوێت بە خۆڵی سەحرا گرد دروست دەکات، بەڵام ئەم بیابان و سەحرایە ئەگەر لە (زەڕە)دا وەکو خانەیەک قسەمان لە سەری کرد و چاکسازیمان تێدا، دەبێت بە باشترین خۆڵ و قوڕ کە وزە و توانا و هێزی زۆر سەرسورهێنەری لێدروست دەبێت. ئەمەی باسمان کرد چیرۆکی مرۆڤی جاهیلە بەرەو مرۆڤی ئیسلام و قورئان کە پێغەمبەر محمد ﷺ-یان بۆ هات لە خۆڵ و لمەوە بوونە وزەی نەوەوی و پاشەڕۆژی نەوەویەکە نەک ئاسن، بەڵکو پۆڵا دەردەچێت!

## بیروباوەڕی یەکتاپەرستی

پاشان بیروباوەڕی یەکتاپەرستی هات لە لایەن محمد ﷺ-ەوە، هەموو ئەو پارچە پارچە و پەرش و بڵاوییەی نەهێشت، وای کرد کە هەموو شتێک لە ژیانی مرۆڤی ئیمانداردا یان لە مرۆڤی نوێدا بەیەک ڕێگادا بڕوات، یەک ئاراستە بگرن، گەردەنکەچ بن بۆ یەک سیستەم. پێش هەموو ئەمانەش یەک خوا بپەرستن کە گرنگترین هۆکاری یەکبوون و یەکگرتنە، ئەو خوایەی سەرچاوەی تەشریع و یاسا و ڕێسایە سەرچاوەی هەموو شتێکە خوای بەخشندەیە و پێویستی بە هیچ نییە، سەرچاوەی هەموو حەڵاڵ و حەرامێکە و ئەوەی ڕاستە لە زاتی بەرزییەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەوە هەڵەیە زاتی بەرزی ڕێگری لێ کردووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم خوایەی پێ ناساندن لەجیاتی ٣٦٠ بتەکە، هەرچی کلتوری خراپ و عورف و دابونەریتی خورافی خراپە وەلانراوە، خوای تاک و تەنها خرایە جێگای بۆ پەرستن کە پێویستی بە زەمەن و سەردەم و کات و شوێن نییە، تا مرۆڤ بپەرستێت هەمیشە ئاگادارە و ئەو زاتە و ناخەوێت، لە ناو قوڵای بیابان ئەم تەوحیدە کۆڵەکەی پشتی مرۆڤی نوێ بوو. واتا ئیماندار دوور لە مرۆڤی جاهیلی کە دید و تێڕوانینێکی یەک ئاڕاستە بووە، خوای پەروەردگار وەریگرت، چونکە شەریک و هاوبەشدانان هەمیشە جێگای وێرانکاری بووە لە مێژووی مرۆڤایەتییەوە.

ئەگەر تەماشای قورئان بکەیت لە مێژووی دابەزینی بۆ پێغەمبەر ﷺ دژی شیرک و هاوبەشدانان بووە، کە هاوبەشدانان هۆکاری سەرەکی لەناو چوونی گەلان و شارستانیەتییەکان بووە.

هەموو خاڵی هاوبەشی گەلە لەناوچووەکان کە قورئان باسی کردووە، هەموو نەبوونی یەکتاپەرستی و هاوبەش و شەریک دانان بۆ خوا بووە.

شەریک بۆ خوا دانان تەنها لە بت پەرستیدا نییە، بەڵکو لە دانانی یاسا و شەریعەت دانانی مرۆڤەکاندایە کە لە جیاتی حوکمی خوا بەکاری دەهێنن، بڕوابوون بە طاغوتەکان و زیندووکردنەوەی ئایینی تر وەکو ئایینی ئیسلام بە ناوی ئەوەی کە هاوشێوەی ئایینی ئیسلامە، هەموو ئەم شەریک دانانە وەکو گێژەڵوکەیەک یان کونە ڕەشەکانی ئاسمان وایە کە وردە وردە گەورە دەبێت و لە پڕ هەرچی دەستکەوت قوتی ئەدات، لەناو چوونی گەلانی ڕابردوو هەمان شێوەی کونە ڕەشەکانە (Blakhole) (ثقب).

ئەگەر تەماشای سورەتی ( العنکبوت) بکەین زۆرێک لەو ئەزموونانەی تێدا بەرجەستە دەبێت:

١. گەلی (نوح): خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾﴾ العنکبوت

واتە: بە دڵنیایی ئێمە (نوح عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) -مان بۆ لای قەومەکەی نارد، هەزار ساڵ پەنجا کەم، واتە: نۆ سەد و پەنجا ساڵ لەناویان مایەوە و دەعوە و بانگەوازی ئەکرد بە شەو و ڕۆژ و بە نهێنی و ئاشکرا و بە تاك و کۆمەڵ، تەنها پێغەمبەرایەتیەکەی نۆ سەدو پەنجا ساڵ بووە نەك هەموو تەمەنی، دوای ئەوەی کە باوەڕیان نەهێنا زریانەکە هات و خوای گەورە بردیانیەوە و لەناوی بردن، ئەوان ستەمیان لە خۆیان کرد بەوەی کە ئیمانیان نەهێنا﴿١٤﴾[48]

٢. گەلی ئیبراهیم: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ ۖ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ ۖ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١٧﴾﴾ العنکبوت

[48] -لەباسی ڕووداوەکانی ژیانی حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) دا ئاماژەمان داوە بە ژیانی و شێوازی حسابکردنەکەی بە ڕۆژژمێری ئەو زەمەنە.

واتە: ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-یش کاتێك کە بە قەومەکەی خۆی فەرمووو: بەتاك و تەنها خوا بپەرستن و شەریکی بۆ دامەنێن و تەقوای خوای گەورە بکەن. ئەمە خێری دونیاو قیامەتی ئێوەی تێدایەو باشترە لەوەی کە شەریك بۆ خوا بڕیار بدەن ئەگەر ئێوە زانیاریتان هەیە﴿١٦﴾ ئێوە جگە لە خوای گەورە تەنها کۆمەڵێك بت و پەیکەر ئەپەرستن کە خۆتان هەڵتان کۆڵیوە و تاشیوتانە و دروستتان کردووە و ناوتان لێناون، ئەمانە هیچیان خوا نین و درۆیەو درۆتان هەڵبەستووە، بە دڵنیایی ئەوانەی کە ئێوە جگە لە خوای گەورە ئەیانپەرستن مولکی ڕزقی ئێوەیان بەدەست نیە و ناتوانن ڕزق و ڕۆزیتان بدەن، ئێوە بەتاك و تەنها داوای ڕزق و ڕۆزی لە خوای گەورە بکەن چونکە بە تاك و تەنها ڕزق و ڕۆزی بەدەست خوای گەورەیە، بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن شوکرانە بژێری خوای گەورە بکەن گەڕانەوەشتان لە ڕۆژی قیامەتدا هەر بۆ لای خوای گەورەیە﴿١٧﴾

٣. گەلی لوط: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴿٢٨﴾﴾ العنكبوت

واتە: لوط (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-یش کاتێك کە بە قەومەکەی خۆی وت: ئێوە بەدڕەوشتی ئەکەن، بە شێوازێك کە هیچ کەسێك لە جیهاندا پێش ئێوە ئەو کردەوە خراپەی نەکردووە کە نێربازییە، سەرەڕای ئەوەی کە کافر بوون بە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەیان بە درۆ زانی، نێربازیشیان دەکرد﴿٢٨﴾

٤. گەلی مەدیەن: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٣٦﴾﴾ العنكبوت

واتە: بۆ لای خەڵکی (مەدیەن)یش شوعەیب پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-مان نارد کە لە هۆزو عەشیرەتی خۆیان بوو وتی: ئەی قەومی خۆم عیبادەتی خوای گەورە بکەن بەتاك و تەنها، باوەڕتان بە ڕۆژی دوایی هەبێت و لە ترسناکی ئەو ڕۆژە بترسن لەسەر زەویدا ئاشووب مەگێڕن، سەرەڕای کوفر کردنیان بە خوای گەورە و بەدرۆزانینی پێغەمبەرەکەیان لە کێشانە و پێوانەدا فێڵیان دەکرد، چەتەیی و ڕێگرییان دەکرد﴿٣٦﴾

٥. گەلی عاد و ثەمود: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ ۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾﴾ العنكبوت

واتە: قەومی عادو ئەمودیش خوای گەورە لەناوی بردن، قەومی (عاد) لە (ئەحقاف) نیشتەجێ بوون لە نزیك (حەزرەمەوت) لە (یەمەن)، قەومی (ئەمود)یش لە (حیجر) لە نزیك (وادی القری) نیشتەجێ بوون، کە عەرەب شوێنیان دەزانی و ئاشنا بوون پێی، بە دڵنیایی بۆتان دەرکەوت لە شوێن و ماڵەکانیاندا کە چۆن خوای گەورە لەناوی بردوون. شەیتان کردەوە خراپەکانی بۆ ڕازاندنەوە لە کوفر و شەریکدانان و خراپەکاری ڕێگریان بوو لە ڕێگای ڕاست و موسڵمان بوونیان، شتەکانیشیان ئەبینی بەڵام سوودی پێ نەگەیاندن(٣٨)

٧. دار و دەستەی فرعەون: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ٣٩﴾ العنكبوت

واتە: (قارون) بەو هەموو سەروەت و سامانە زۆرەیەوە و فیرعەون بەو هەموو دەسەڵات و سەربازە زۆرەیەوە و (هامان)یش کە وەزیرو ڕاوێژکاری فیرعەون بوو خوای گەورە هەمووی لەناوبردن، بەدڵنیایی (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکراو موعجیزەوە هات بۆ ناویان، بەڵام ئەوان خۆیان بەگەورە زانی لەسەر زەویدا و عیبادەتی خوایان نەکرد، ئەمانیش پێش ئێمە نەکەوتن و ڕزگاریان نەبوو لە سزای خوای گەورە(٣٩)

هەموو باسی یەکتاپەرستییەکەش لە گفتوگۆی نێوان ئیبراهیم و گەلەکەیدا ڕوون دەبێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا مَّوَدَّةَ بَيۡنِكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم بِبَعۡضٖ وَيَلۡعَنُ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا وَمَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ٢٥﴾ العنكبوت

واتە: ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) سەرزەنشتی قەومەکەی خۆی کرد و فەرمووی: ئێوە ئەو بتانەتان جگە لە خوای گەورە داناوە و ئەیانپەرستن تەنها بۆ ئەوەتانە لە دونیا کۆببنەوە لەسەر پەرستنی و خۆشەویستی بخاتە نێوانتانەوە، بەڵام لە ڕۆژی قیامەت هەندێکتان کوفر بە هەندێکی ترتان ئەکەن و بەرائەت لە یەکتری ئەکەن هەندێکتان نەفرەت لە هەندێکی ترتان ئەکەن، شوێنی مانەوەی هەمیشەیی ئێوە ئاگری دۆزەخە، هیچ کەسێکیش نییە کە سەرتان بخات و ڕزگارتان بکات لەو ئاگرە(٢٥)

ئەگەر ڕووداوی بەدیهاتن هۆکارێکی سەرەکی بێت بۆ یەکبوونی خەڵکی، ئەوا تەوحید بەردی بناغەی ئەو یەکبوونەیە و بێ تەوحید هیچ بونیادێک بینا ناکرێت، بەم شێوەیە کۆمەڵگەیەکی نوێ هاتە ئاراوە، خواناس و خوا پەرست، لە کۆمەڵگەی جاهیلی ناچێت و جیاوازی هۆزگەرایی نییە، یەکگرتووی تەواون، بگرە یەک جەستەن، بەڵام یەکبوونی یاخود هێزی

یەکتاپەرستی لە تاکە کەسییەوە بڕوات بۆ کۆمەڵگە، کۆمەڵگەی لەسەر بونیاد بنرێت ئەوا بەرەو ئاسۆیەکی گرنگ تر هەنگاو دەنێت ئەویش ئوممەتە.

ئەم بەردی بناغەیە وتمان یەکتاپەرستییە، بەڵام هۆکاری سەرەکی و خۆسەپێنە و سەرەکی ڕووداو هەواڵەکانی بەدیهێنانی گەردوون و ژیان و مرۆڤە.

## وەحی بۆ محمد پێغەمبەر ﷺ لە سەر دروستبونی مرۆڤ

لە قورئاندا کە ڕووداوی دروستبوونی مرۆڤ باس دەکات بۆ پێغەمبەر ﷺ هاوشێوەی نییە لە ئایینەکانی تردا قورئان بە قۆناغ باسی دروستبوونی مرۆڤ ئەکات جا چ لە سەرەتاوە بێت کە خانەیەک بووە پاشان بۆ بونیادنانی لە ( ئینسان، بەشە، بەنی ئادەم) کە لە سەرەتای ئەم کتێبەدا بە دوورودرێژی ڕوون کراوەتەوە.

باسەکە تەنها لە دەوری دروستکردن ناسوڕێتەوە و خالقی پەروەردگاری تێدا دەرکەوت، هەرچەندە هەموو ئایینەکانی تر هاوشێوەی یەکن لەم بوارەدا، بەڵام قورئان جیاوازتر لە هەمووی بە دوای ڕۆڵی مرۆڤ دا دەگەڕێن و ڕۆڵی بۆ دیاری دەکات یان گوتاری قورئانی بۆ پێغەمبەر محمد ﷺ، ڕۆڵی مرۆڤ ئەدۆزێتەوە کە لە هیچ ئایینێکی تردا نیە!

ڕۆژهەڵاتناسەکان بە مولحید و یەهود نەساراوە دەیانەوێت ئەو بە ( تۆبزی) و بە زۆر بسەپێنێت کە قورئان هەژمونی ئایینی ئیبراهیمە و لە وەحی دەری بکەن.

نووسەر: لە ڕاستیدا کە لێکۆڵینەوەم کرد لە کتێبی پیرۆز، قورئان ڕێک دژی ئەو دەقانەیە کە ئێستا لە کیتابی پیرۆزدا هەیە، لەوێ ڕۆڵی مرۆڤ زۆر سادە و خانەنشینکردنیەتی بە ئایین، بەڵام ئیسلام و قورئان ڕۆڵی سەرەکی گرنگ و سەرکردەی پێ دەبەخشێت، کەواتە قورئان پێچەوانەیە لەوان ناچێت.

ئاستی مرۆڤ زۆر بەزر دەکاتەوە لە ڕادەیەک کە مرۆڤ خۆی تووشی شۆک دەبێت، بۆ زانیاری خوێنەر کە بەراوردم کرد لە نێوانی: مرۆڤی تەورات و ئینجیل، مرۆڤی جاهیلی، مرۆڤی بتپەرست، مرۆڤی قورئان زۆر ئاستبەرز و گەورە و ڕۆڵی ستراتیژی بێ وێنەی هەیە. دروستبوونی مرۆڤ لە قورئاندا واتا بەرز کردنەوەی ئاستی خودی دید و تێڕوانینی مرۆڤ خۆیەتی بە توانا و هێزو ئیمکانیەتەکانی کە لە هیچ پەیڕە و پرۆگرام و ئایینێکی تردا نابینرێت، ئەویش بە موعجیزەیەک کە باسی ژیانی پێغەمبەر ئادەمە لە دروست بوونی تاکو وەفاتی.

## ئەو ڕۆژەی فریشتە سوجدەی برد بۆ مرۆڤ

پێش قورئان کە بۆ کۆتا پێغەمبەر هاتووە محمد ﷺ هیچ دەقێکی ئایینی نییە کە فریشە سوجدەی بردبێت بۆ مرۆڤ، تەنانەت دەقێک نییە لەم دەقە قورئانیەوە نزیک بێت، ئیتر چۆن قورئان هەژمونی ئایینەکانی تری پێوە دیارە؟!

لە هەموو بیرو باوەڕەکاندا فریشتەکان پیرۆزن بگرە پەرستویانن، خۆ ئەگەر پەرستنشیان بۆ نەکرابێت دید و تێڕوانینی هەموو ئایینەکانی تر فریشتەیان زۆر بە پیرۆز و گەورە تەماشا کردووە،کە هیچ مەخلوقاتێک جێگای فریشتە ناگرێتەوە.

بە ئێستایشە و لایان وابووە کە فریشتە زۆر پیرۆزتر و گەورەترە لە مرۆڤ، زۆرێک لە ئایینەکان فریشتە زۆر لە سەر و مرۆڤ مەخلوقاتەکانی تر تەماشا دەکەن.

قورئان هات بۆ محمد ﷺ هەموویانی تووشی شۆک کرد، دید و تێڕوانینی نوێی بەخشی بە مرۆڤایەتی، ئەو ئاست نزمییەی مرۆڤی بەرزکردەوە بۆ ئاستێک کە خودی مرۆڤ چاوەڕێی نەدەکرد لە ڕێگای وەحییەوە.

مرۆڤ کە نوێنەرەکەی ئادەمە، بەو پێیەی یەکەم پێغەمبەرە و یەکەم مرۆڤی ناسراوە لە مێژوودا، خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو سوجدەی بۆ بەرن، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿١١﴾﴾ الأعراف

واتە: ئەی ئادەمیزاد بە دڵنیایی ئێوەمان دروست کردووە پاشان وێنەمان کێشاون، پاشان بە فریشتەکانمان وت کە کڕنووشی ڕێز بۆ ئادەم بەرن، هەر هەموویان کڕنوشیان بۆ ئادەم برد و فەرمانی خوای گەورەیان جێبەجێ کرد تەنها ئیبلیس نەبێ﴿١١﴾

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا﴿٦١﴾﴾ الإسراء

واتە: کاتێك بە فریشتەکانمان وت کڕنوشی ڕێزو ئیحتیرام بۆ ئادەم بەرن، هەموویان کڕنوشیان برد تەنها ئیبلیس نەبێت وتی: ئەی پەروەردگار من کڕنوش بەرم بۆ کەسێك کە تۆ لە قوڕ دروستت کردووە﴿٦١﴾

لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾﴾ طه

واتە: هەموویان کڕنوشیان بۆ برد، تەنها ئیبلیس نەبێ کە ڕەتی کردەوە کڕنوش بۆ ئادەم بەرێت﴿١١٦﴾

سوجدە بردن، بۆ ئادەم تەنها شەرەفێک یان فەزڵێکی زیادە نەبوو بۆ ئادەم لە باسی بەدیهاتنی قورئانیدا، بەڵکو سوجدەی فریشتە واتایەکی زیاتر و گۆڕانکاری دایە خودی پرسەکە، دیدو تێڕوانینێکی نوێی دایە مرۆڤ لە ڕۆڵی ئایین و بیروبۆچوونەکاندا، ناڕاستەوخۆ هەموو فەلسەفە نوێکانی جیهان و بە تایبەت ڕۆژئاوا لە ساڵەکانی (١٠٠٠)ز بە دواوە هەمووی لە ئیسلام و خودی قورئانی وەردەگرت.

سوجدە بردن بۆ مرۆڤ واتایەکی گرنگی خستە سەر جێگا و پلەی مرۆڤی نوێ، یان مرۆڤی قورئان، مرۆڤی فێرکرد کەوا خاوەنی بەرپرسیارێتییە، ئەو هەست و شعورە خراپەی لەسەر لابرد کە بێ ئامانج، بێ مەبەست و بێ هودەیە، لەسەرو هەموویەوە دیدو تێڕوانینی یەهود و تەوراتی و فەلسەفەی یەهودی هەڵوەشاندەوە کە کۆمەڵێک کەس هەڵبژاردەن و زۆرینەی خەڵکی تر خزمەتکار و بۆ خاتری گەلی ئیسرائیل دروست بوون، دید و تێڕوانینی نەسرانی و ئینجیلی هەڵوەشاند کە گوایە مرۆڤ تاوانبارە و (عیسا) هاتووە بۆ سڕینەوەی تاوانەکانی، نەهێشتنی هەستکردن بە تاوانباری بەردەوام وەکو لای نەسرانیەکان باوە یان وەکو فەلسەفەی ئیغریق یان یۆنانی کۆن کە دەڵێن: (مرۆڤ هاتووە و هۆکارەکەی نەزانراوە)!

هەموو ئەو زیادەبەخشینە بە مرۆڤ کە مەخلوقێکی زۆر بەڕێز و پیرۆزە لە هەموو مەخلوقەکانی دیکە، گومانیشمان نییە کە قورئان هەموو بەرنامە و پەیڕە و پرۆگرام و ئایین لە پاش خۆی و داهاتووی خۆی (نەسخ) کردۆتەوە، واتا بەرنامە نییە لە بەرنامەی خوا باشتر. هەڵبژاردە و دڵنیایە لە موشریەکەکانی جا لیبراڵییە، دیموکراتییە یان سۆسیالیستی و...هتد.

ئەو ئیمتیازەی مرۆڤ وەریگرت کەسێکی تر و بەرنامەیەکی لە دەقەکانیدا باسیان نەکردووە، ئیسلام کە هات لە ناو کۆمەڵگەی قورەیش، هیچ زانیارییان نەبوو هەموو لە ناو ئەم هەموو زانیارییە چڕوپڕانەی قورئان، موشریەکەکان پەنایان دەبرد بۆ فارس و یەهود و ڕۆم.

## پێغەمبەر محمد ﷺ پیشەی مرۆڤی دیاری کرد بە قورئان

پیشە نوێیەکەی مرۆڤ بە خەلیفە بوونە، خوای گەورە دەفەرموێت: وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ البقرة

واتە: پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرموو من ئەمەوێ لەسەر ڕووی زەویدا کەسانێك دانێم کە ببن بە جێنشینی یەکتری، فریشتەکان وتیان: ئەی پەروەردگار ئایا تۆ کەسانێکی تیا دائەنێی کە ئاشووب بگێڕن لەسەر زەوی و خوێن بڕێژن و تاوان بکەن لە کاتێکدا ئێمە تۆ بەگەورە و بە پاك ڕائەگرین لە هەموو کەموکوڕییەك، لە هەموو شتێك کە شایەنی تۆ نەبێ، لەوەی کە خەڵکی ئەیداتە پاڵ تۆ لە شەریك دانان بۆ خوای گەورە، پەروەردگار فەرمووی: ئەوەی کە من ئەیزانم ئێوە نایزانن، کە لەناو ئەو کەسانەی کە من دروستیان ئەکەم پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و زانایان و خواپەرستان و پیاوچاکانیشیان تیادا ئەبێت﴿٣٠﴾

لە ڕاستی دا لە سوجدەکە گەورەتر بۆ مرۆڤ کە بوو خاوەن ئامانج و مەبەست و لەسەر زەویدا پیشەیەکی هەیە کە خەلیفە یە، هاتنی ژیانی هەر پێغەمبەرێک بۆ پێغەمبەر محمد واتایەکی وا ئەداتە ئوممەتەکەی کە ئەزموونی هەزاران ساڵ دەخاتە سەر ئەزموونی ئوممەتی ئیسلام.

هەرچەندە باسەکەمان پێوانە کردن نییە لە تەورات و ئینجیل، دەقە قورئانییەکان بەڵام بە هیچ شێوەیەک هاوشێوەی خەلیفە بوون دەستنیشانکردنی پیشە بۆ مرۆڤ لە ڕابردوودا نەبووە.

هەندێک دەق هەیە لە سفری تەکویندا باس لەوە دەکات کە مرۆڤ زاڵ دەبێت بە سەر ماسی و ئاژەڵدا، بەڵام دوور و نزیک پەیوەندی بە پرس و باسەکانی خەلیفە بوونەوە نییە.

بەڵکو مەبەست بە واتای دەستبەسەرگرتنی زەوی نییە کە دەقە تەوراتییەکان ئاماژەی بۆ دەکەن لە ناو ئاوەدانکردنەوە دەسەڵاتی مرۆڤ دا، پرسێکی تر لە ئاودا بارگاوی کردووە کە بەندایەتییە، نەک بە واتای بیرۆکەی میکافیلی بۆ مەبەست، هۆکاری نا پەسەندیش بگریتە بەر، وەکو ئەوەی یەهود و شوێنکەوتوانی دەیکەن لە دنیای ئەمڕۆدا، بەڵکو خەلیفەبوون ئاوەدان کردنەوەیە بەو فەرمان و ڕێگایەی خوای موتەعال دەیەوێت، نەک بە کاولکردنی هێرۆشیما و ناکازاکی و دروست کردنی بۆمبی ئەتۆمی، لە ئێستادا ئەمەریکا کە خۆی بە دەسەڵاتداری سەر زەوی دەزانێت بۆمبی وای هەیە کە لە چاو ئەو بۆمبەی کێشای بە دوو جێگایەدا، لە چاویدا ئەوانەی ڕابردوو یاری منداڵان بوو.

خەلیفەبوونی قورئانی بە واتای مەقام و هەڵسانەوە، بە واتای جێنشینکردنی مرۆڤ بۆ پیادەکردنی فەرمانی خوای موتەعال، بۆ ئاوەدانکردنەوەی پڕ ڕەوشت و ئاکار، دووربوون لە دەمارگیری بە هەموو جۆرەکانیەوە، بە واتای بەرزکردنەوەی ئاستی مرۆڤ بۆ پلەی مرۆڤبوونی کە بەڕێزترە لە هەموو مەخلوقات.

لە هاتنی قورئان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوو قۆناغی سەرەکی جیا دەکرێتەوە (مەککی و مەدەنی)، مەککی واتا لە شاری مەککە دابەزیوە و سەرەتای بونیادنانی کۆمەڵە موسڵمانێکە بۆ بونیادنانی دەسەڵات و دەوڵەت و حکومەت و ئوممەت، ئەو ئایەتانەی کە باسی خەلیفەیە هەندێکیان مەدەنین، بۆ پراکتیزەکردن و جێبەجێ کردنە، بەڵام ئایەتە مەککیەکان کە هات سەرەتا بۆ بە پرنسیپ کردن و داڕشتنی بیروباوەڕی موسوڵمان بوو.

(١١) ئایەت هاتووە لە سەر (خەلیفە و ئیخلاف، خولەفا، خلائف) کە هەموو پەیوەندی بە داڕشتنەوەی بیرو باوەڕی ئیسلامی هەیە لەو بوارەدا.

(١٠) لەو ئایەتانە بە وەسفێکی کۆباسی خیلافەت و خەلیفە بوون دەکات.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ مِن بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾﴾ یونس

واتە: پاشان ئێوەمان کردە جێنشینی یەکتری لەسەر ڕووی زەوی لە پاش ئەوان تا تەماشا بکەین و بزانین ئێوەش چ کردەوەیەك ئەنجام ئەدەن چاك یان خراپ﴿١٤﴾

﴿فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ فِي الْفُلْكِ وَجَعَلْنَاهُمْ خَلَائِفَ وَأَغْرَقْنَا الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ۖ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾﴾ یونس

ئەوان (نوح) پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-یان بەدرۆ زانی، ئێمەیش (نوح) و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیدا بوون هەموومان ڕزگار کردن لەناو کەشتییەکەدا، ئەوانمان کرد بە جێنشینی خەڵکی و ئەوانی ترمان هەموو لەناوبرد. ئەو کافرانەی ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانی هەموومان لەناو ئاوەکەدا غەرق کرد، بزانە سەرەنجامی ئەو کەسانە چی بوو کە ئاگادار کرانەوە و شوێنی پێغەمبەری خوای گەورە نەکەوتن، ئەمە هەڕەشەیە لە کافرانی قورەیش کە ئەگەر ئێوەیش ئیمان نەهێنن سزاتان دەدەین و لەناوتان دەبەین﴿٧٣﴾

﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًاۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا﴿٣٩﴾﴾ فاطر

واتە: خوای گەورە ئێوەی کردووە بە جێنشین لەسەر زەویدا و ئەبن بە جێنشینی یەکتری، جا هەر کەسێك کوفر بکات ئەوە زیانی کوفرەکەی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە، کافرانیش بەهۆی کوفر کردنیانەوە لای خوای گەورە هیچ شتێکیان زیاد ناکات تەنها تووڕە بوون و ڕق لێبوونی خوای گەورە نەبێت، هیچ شتێکی تریشیان زیاد ناکات تەنها زەرەرمەندی و بە هیلاکچوونی خۆیان نەبێ﴿٣٩﴾

﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْۚ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ (نوح) وَزَادَكُمْ فِي ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةًۖ فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾﴾ الأعراف

واتە: ئایا پێتان سەیرە یان بەدووری ئەزانن کە وەحی لەلایەن پەروەردگارتانەوە دابەزێ بۆ سەر کەسێك لە خۆتان کە من لە خۆتانم و ئەمناسن بۆ ئەوەی ئاگادارتان بکاتەوە، یادی ئەو نیعمەتەی خوای گەورە بکەنەوە کە خوای گەورە ئێوەی کرد بە جێنشین لەسەر ڕووی زەویدا لە دوای قەومی (نوح) کە ئەوانی لەناوبرد چونکە سەرپێچییان کرد و ئیمانیان پێ نەهێنا، ئێوەی هێنا لەناو خەڵکیشدا ئێوەی زیاتر بەهێز کردووە کە باڵاتان درێژ و بەرزە و لاشەتان زۆر گەورەیە، ئێوە یادی نیعمەتەکانی خوای گەورە بکەنەوە لەسەرتان بەڵکو سەرفراز بن بەهۆی بیرکردنەوە لەو نیعمەتانە بتانگەیەنێت بە ئیمان هێنان بە خوای گەورە﴿٦٩﴾

﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًاۖ فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴿٧٤﴾﴾ الأعراف

واتە: یادی ئەو نیعمەتەی خوای گەورە بکەنەوە بەسەرتان کە لە دوای ئەوەی قەومی عادی لەناوبرد ئێوەی کرد بە جێنشین لەسەر ڕووی زەوی، لەسەر زەویشدا جێگیری کردن و شوێنی بۆ کردنەوە لە زەوی لە خۆڵەکەی خشت ئەبڕن و کۆشك دروست ئەکەن لەبەر بەهێزیتان شاخەکان هەڵئەکۆڵن و ئەیکەن بە ماڵ بۆ خۆتان و لەناو شاخەکاندا ماڵ دروست ئەکەن، ئێوە یادی نیعمەتەکانی خوای گەورە بکەنەوە بەسەرتانەوە لەسەر زەویدا ئاشووب و ئاژاوە مەنێنەوە و خراپەکاری مەکەن﴿٧٤﴾

﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٞ وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَأۡخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا وَإِن يَأۡتِهِمۡ عَرَضٞ مِّثۡلُهُۥ يَأۡخُذُوهُۚ أَلَمۡ يُؤۡخَذۡ عَلَيۡهِم مِّيثَٰقُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّ وَدَرَسُواْ مَا فِيهِۗ وَٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ١٦٩﴾ الأعراف

واتە: لە دوای ئەمانە نەوەکانیان، کەسانێکی خراپ جێی ئەمانیان گرتەوە کە هیچ خێریان تیا نەبوو، بوونە میراتگری تەورات لە باوك و باپیرانیان کە ئەیانخوێندەوە و کاریان پێ نەئەکرد و دونیایان پێ ئەکڕی بەڕەشوە و حەرام، گۆڕانکارییان ئەکرد لە ئایەتەکانی خوای گەورەدا ئەیانووت: ئاساییە دواتر خوای گەورە لێمان خۆش ئەبێ بەوە دڵی خۆیان ئەدایەوە تاوانیان دەکرد و داوای لێخۆشبوونیان دەکرد کە دووبارە تاوانەکەیان بۆ بگونجایە ئەنجامیان دەدایەوە، یان ئەگەر دووبارە دونیایان دەست بکەوتایەتەوە پێی، ئەوە بەتەورات ئەیانگۆڕییەوە تەوراتەکەیان بەکار ئەهێنا بۆ دەستخستنی دونیا جار لە دوای جار، ئایا لە تەوراتدا عەهدو بەڵێنیان لێ وەرنەگیرابوو کە جگە لە حەق هیچ بەناوی خوای گەورەوە نەڵێن و دەستکاری کتابی خوای گەورە نەکەن، ئەم شتەیان خوێندەوە و زانیشیان ئینجا وازیان لێ هێنا بۆیە سزایان سەختترە، بەڵام لەم دونیایەی کە ئەوان دەستی ئەخەن ئەگەر قیامەتیان پێ دەست بخستایە ئەوە باشتر بوو بۆ کەسانێك کە تەقوای خوای گەورە بکەن و خۆیان بپارێزن ئەوە بۆ عاقڵ نابن و فام ناکەن و تێناگەن١٦٩

أَمَّن يُجِيبُ ٱلۡمُضۡطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكۡشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجۡعَلُكُمۡ خُلَفَآءَ ٱلۡأَرۡضِۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ٦٢ النمل

واتە: کێ هەیە وەڵامی لێقەوماو بداتەوە کاتێك کە دەپاڕێتەوە و هانا بۆ خوای گەورە ئەبات، جگە لە خوای گەورە؟ کێ هەیە خراپەتان لەسەر هەڵگرێ و لایدات؟ کێ هەیە ئێوە بکات بە جێنشین لەسەر زەویدا هەر ئەوەندە جیلێکی لەناوبرد جیلێکی تر جێیان بگرێتەوە؟ واتە: کەس نییە ئایا لەگەڵ (الله) دا پەرستراو و خوایەکی تر هەیە کە شایانی پەرستن بێت و ئێوە بیپەرستن و بیکەن بە شەریك بۆ خوای گەورە؟ بەڵام زۆر بە کەمی بیر ئەکەنەوەو ئەگەڕێنەوە بۆ حەق٦٢

﴿وَرَبُّكَ ٱلۡغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۚ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفۡ مِنۢ بَعۡدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوۡمٍ ءَاخَرِينَ ١٣٣﴾ الأنعام

واتە: پەروەردگارت دەوڵەمەند و بێ پێویستە لە دروستکراوەکانی و زۆر بەڕەحم و بەزەییە، ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بێت ئەی ستەمکاران ئێوە لەناو ئەبات و ڕیشەکێشتان دەکات لە دوای ئێوە کەسانێکی تر ئەهێنێ کە خۆی ویستی لێ بێت و گوێڕایەڵی و عیبادەتی بکەن،

هەروەکو چۆن ئێوەی دروست کرد لەنەوەی کەسانێکی تر ئەوانەی لەناو کەشتییەکەی (نوح) دا بوون مرۆڤایەتی لەوان دروست بووەوە﴿١٣٣﴾

﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٥﴾﴾ الأنعام

واتە: خوای گەورە ئەو خوایەیە کە ئێوەی کردووە بە جێنشینی ئوممەتەکانی پێشتر لەسەر زەویدا پلە و پایەی هەندێکتانی بەرز کردۆتەوە بەسەر هەندێکی ترتاندا لە هێز و توانا و فەزڵ و زانست و زانیاری و دروست کردن و شێوە و ڕەنگ و ڕزق دا تا خوای گەورە تاقیتان بکاتەوە بەو شتانەی کە پێتانی بەخشیوە ئایا بەکاری دێنن لە گوێڕایەڵی و عیبادەتی خوا یان نا بەڕاستی سزای پەروەردگارت زۆر خێرایە بۆ کەسێك سەرپێچی بکات پەروەردگارت بەڕاستی زۆر لێخۆشبوو و بەبەزەییە بۆ کەسێك کە بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوە و شوێن خوای گەورە بکەوێ، والله أعلم﴿١٦٥﴾

یەک ئایەتیان کە باسی حەزرەتی (داوود عَلَيْهِ السَّلَامُ)-ە باسی خەلیفە بوون دەکات کە شوێن هەواو ئارەزوو و نەفسی خۆت نەکەویت: ﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِي ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾﴾ ص

واتە: ئەی (داوود) پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئێمە تۆمان کردووە بە جێنشین لەسەر زەویدا تۆ بڕیار لە نێوان خەڵکیدا بدە بە دادپەروەری شوێن هەوا و ئارەزوو نەکەوی لە بڕیاردان لە نێوان خەڵکیدا، چونکە گومڕات ئەکەن و لە ڕێگای ڕاستی خوای گەورە لات ئەدەن یان لە ڕێگای بەهەشت لات ئەدەن، ئەو کەسانەی لە ڕێگای ڕاستی خوای گەورە لائەدەن بە دڵنیایی ئەوانە سزایەکی زۆر بە ئێش و ئازاریان بۆ هەیە لەبەر ئەوەی ڕۆژی لێپرسینەوەیان لەبیر کردووە﴿٢٦﴾

(٧) ئایەت باس لە خیلافەتی سەر زەوی دەکات و ئەوانی تر باسی هێز و تواناکانی مرۆڤ دەکات بۆ خەلیفە بوون.

کەواتە ئیمان بە خیلافەت بوون وەکو بیروباوەڕی تەوحید و دەبێت مرۆڤەکان هەوڵی بۆ بدەن وەکو بەندایەتی لە بانگەواز و دادپەروەری و حوکمرانی و گەڕانەوەی ئەمانەتی گەلی بە گشتی لەخۆ گرتووە.

هەموو ئەم باسانەی خیلافەت ئامادەکارییە بۆ قۆناغی مەدینە کە لە داهاتوودا موسوڵمانان دەوڵەت دادەمەزرێنێت، چونکە بەدیهاتن و ڕووداوەکانی بە گشتی کە دید و جیهان بینی نوێ دەبەخشێتە ڕێکخستنە سەرەکییەکانی سەرەتایی، هەر ئەمەش وای کرد ئەو قۆناغانەی کە موهاجیرەکان پێدا تێپەڕ بوو بوون، ئەنسار پیادەیان نەکرد بوو، هەر ئەمەشە وای کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر پۆست بەسەر موهاجیرەکاندا دابەش بکات تاکو ئەنسارەکان.[49]

ڕاستە خیلافەت سیستەمی ئیسلامییە و ئەو ناوەی بۆ دانراوە، بەڵام کە حەزرەتی ئادەم بووە خەلیفە وەکو پیشە بوو کارەکەی، واتا لە ڕووی تاکە کەسیەوە پیشەی مرۆڤی موسوڵمان بە خەلیفە بوون، ئەمەش فەرمانی قورئانە کە کۆتا پەرتوکی ئاسمانییە.

هەروەها فەرموودەی پێغەمبەرمان هەیە کە هەمان واتا و مانای ئەوان بە دەستەوە کە دەفەرموێت: (هەمووتان شوانن، بەرپرسیارن لە ڕانەکەتان یاخود میگەلەکەتان)[50]

ئەم بەرپرسیارەتییە لە تاکەوە دەست پێ دەکات، بە کۆمەڵێک سیستەمەوە کە خیلافەتی لەسەر دادەمەزرێت.

بەرپرسیارێتی تەنها بریتی نییە لە چاودێر و ئاگاداری، بەڵکو زۆر لەوە گەورەترە وشەکە کە (راع)ی بۆ بەکارهاتووە، بە واتای بەرپرسی لە نەشو نما و گەشە پێدان و پەرە پێدان و کۆکردنەوەی بەرهەمیش، کە هەموو کەس کەوتە خانەی بەرپرسیارێتی ئەم ئاڵوگۆڕە دەکات لەگەڵ بەرپرسەکانی تردا، ئەمەش لە عورفی ڕۆژئاوادا ناونراوە بە ( گرێبەندی کۆمەڵایەتی) کە فەیلەسوفی فەڕەنسی (جان جاک ڕۆسۆ) دامەزراوە، لێرەدا مرۆڤ باس دەکەین واتا بەهەردوو ڕەگەزەکەی ( نێر و مێ) پیاو وژن لە مرۆڤ بووندا ئەم دوانە جیاناکرێتەوە لە گوتاری قورئانیدا، بەڵام لە گوتاری جاهیلی، مرۆڤ مەبەست تەنها پیاوە!

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فێری ئوممەتەکەی کرد کە مرۆڤی خەلیفە، خاوەنی حەقە و بە دوای حەقدایە و حەقیش دەڵێت، واتا حوکمرانی تاکە کەس لە خەلیفە بوونیدا شوێن حەق و ڕاستی دەکەوێت و بە ئاشکراش دەیڵێت سیستەمەکە کە دەسەڵاتە هەمان کاری هەیە، بەڵام بەرفراوانتر و بە دەزگا کردنی سێکتەرە کۆمەڵایەتییەکان یان سیستەمە کۆمەڵایەتییان بە گشتی، ڕووداوی حەزرەتی ئادەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و پاشان بۆ کۆمەڵگەی قوڕەیش بازدانێکی جۆری بوو لە گۆڕانکاری لە بیابانەوە بۆ سەوزایی، لە نائەقڵانییەوە بۆ ئەقڵانی بوون، لە ئاست نزمییەوە بۆ بەرزترین ئاستی مرۆڤ بوون، باسی ئادەم و پاشان خێزانی بە واتای مرۆڤ بوونی ئافرەتانە لە ئایینی نوێدا بە واتای ڕۆڵی تەواوی ئافرەتە لە کایەکانی ژیاندا، بە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[49]- ئەنسار بەو خەڵکە دەوترێت کە لە شاری مەدینە بوون، داڵدەی کۆچ کردووەکانی مەککەیان دا کەناسراون بە موجاهید.

[50]- كلُّكم راعٍ وكلُّكم مسؤولٌ عن رعيته / البخاري، مسلم، الترمذي، النسائي و أحمد.

واتای خەلیفە بوونە بە واتای بەڕێز بوون، بە واتای زانستی بوونی هەموو پرسەکانەوە لە ژیاندا، چونکە حەزرەتی ئادەم بە زانست فێرکراو پێغەمبەری خواش یەکەم ئایەت بۆی هات ( إقرأ) بوو، ئەگەر قورئان ئەم وشەیە بوایە بە تەنها واتا (بخوێنە) دەرگای کردنەوەی هەموو زانستەکانە، بە خوێندنەوە توانیمان شارەزا بین لە ژیانی پێغەمبەران. خوێندنەوە و قەڵەم کە دوو ئامرازی سەرەکی زانستن قورئان لە پێشی داناون و خستویەتیە پێشی، هەموو پرسەکانی ئایین لە دروشم و شەریعەت و فیقە و...هتد، چونکە ئەگەر خوێندنەوە و قەڵەم نەبێت، ئەوا ئەوانە کە ئاماژەمان پێدا نەدەبوونە زانست.

ئادەم پرسێکی گەورەتری لە دوای ئەو دوو پرسەوە هێنایە ئاراوە، ئەویش ململانێیەکی زۆر سەخت بوو لە نێوان شەیتان و مرۆڤدا.

## ئادەم و شەیتان لە ئیسلام دا

حەزرەتی ئادەم تا ڕادەیەک ڕوونکرایەوە، کە چ ڕۆڵێکی هەبووە و بۆچی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکراوە لە قورئاندا، بەڵام زانیارییەکی تر دێتە ئاراوە لە ناو قورئاندا و پاشان پەروەردە و کردنەوەی جیهانبینیەکی نوێیە لە مرۆڤی دوای قورئان لە پێشتر هاوشێوەی نەبووە وەکو باسکردنی قورئان.

پێش ئەوەی باسی جۆریەتی و لە کامە مەخلوقی شەیتان باسبکەین، پێویستە خوێنەر ئەوە بزانێت کە ژیان بریتییە لە ململانێ، دەیان زاناو فەیلەسوف لە دوای قورئان بە زانست دایانڕشتووە، نموونە ( کارل مارکس) کە پێیوایە ململانێی چینایەتی لە نێوان مرۆڤەکاندا هەیە، بە گشتی دابەشی کردووە بەسەر دوو چیندا، دەوڵەمەند و هەژار یان ( پرۆلیتار و بۆرژواز)، یاخود (چارڵس داروین) ململانێکەی دابەش کردووە لە نێوان ( بەهێز و لاوازدا)، یان( فرۆید) دابەشی کردووە بەسەر هێزی شەهوەت، یان (سێکس)...هتد، لەم دواییانەدا لەسەر دەستی زاناکانی ئەمەریکا دابەش بووە بەسەر ململانێی سیاسی، ئەوانەشی کە پشتگیری ئەم بوارەن (فرانسیسکۆ فۆکۆیاما) هەیە دەڵێن ململانێی شارستانیەتەکانە وەکو ( هامتنتۆنگ).

پێش ئەم ئایینە بەو شێوەیە باس نەکراوە، ئیسلام دەستنیشانی ململانێکەی کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بنەمای ڕووداوەکانی نێوان حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) و شەیتان لەعنەتی خوای لێبێت، کە ململانێی ڕاستی نێوان کوفر و ئیماندایە، ئەگەر مرۆڤیش بە چاوی ورد و لێکۆڵینەوە تەماشای ململانێکان بکات ڕێک دەرئەنجامی ململانێی کوفر و ئیمان تێدا بەر جەستە دەبێت لەگەڵ ئەوەی کە زانایان باسیان کردووە و هەریەکە بنەمای تیۆری زانستی بۆ دارشتووە، بەڵام هەموو ئەوانیش دەچنە ناو بنەڕەتی سەرەکی کوفر و ئیمان.

هەر لە سەرەتای بانگەوازی مەککەوە حەزرەتی محمد ﷺ بنەمای ململانێکەی دیاریکرد کە هاوەڵان بزانن بنەمای سەرەکی یەکتاپەرستییە و خوا ناسییە و ئیمانە، ئەچنە بواری لابەلا و بە بواری نەتەوەگەرایی و ئابووری ڕەوشتی خۆیان سەرقاڵ بکەن، بەڵکو کوفر سەرچاوەی، هەموو خراپەکراییەکە و ئیمانیش سەرچاوەی چاکسازی و خواناسی و هەموو بنەما ئایینەکانی تر.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیتوانی سەرەتای هاتنی وەحی باسی دامەزراندنی دەوڵەت و حکومەتی عەرەب بکات، بانگەشەی بە ئوممەت بوونی عەرەبی باسکردبایە و هەر زوو ئەبو جەهل و وەلیدی کوڕی موغیرە و سەرکردەکانی قوڕەیش هاوکاری دەبوون، جەنابی حەزرەتی محمد ﷺ هەموو ئەمانەی تێپەڕاند و داوای خواناس و ئیمانداری کرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیتوانی شۆڕشێکی ئابووری بکات لە ئەنجامی (ئیخلاس)، قوڕەیش کە هەموو ژیانیان لەسەر بنەمای بازرگانی بوو، هەر زوو زوو ئەهاتن بە دەمیەوە. هەموو قوڕەیش هاوکاری بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بنەڕەتی هەڵبژارد کە ئیمان و خواناس و یەکتاپەرستییە دژی کوفر و خوانەناسی چونکە هەموو باسەکان دەچنە خانەی ململانێی کوفر و ئیمان.

جەنابی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیتوانی ئاڵای ڕەوشت و ئاکاربەرزی ناو کۆمەڵگە بەرز بکاتەوە، چونکە کۆمەڵگەیەکی داڕوخاو بوو لە ڕووی ڕەوشتییەوە، هەر زوو پیاو مەعقوڵانی ناو قوڕەیش دەچوون بەدەم بانگەوازەکەوە، بەڵام حەزرەتی محمد ﷺ هەموو ئەمانەی تێپەڕاند، چونکە ئاراستەکرا بوو بەدەمی کە لە ژیانی ئادەم و حەواء خێزانی و ململانێ لەگەڵ شەیتاندایە، کە حەزرەتی ئادەم و حەواش بەشی ئیمان و خێر و چاکەیە، بەشی شەیتان کوفر و خراپەکارییە.

لەناو عەرەبدا وشەی (شەیتان) بەکار دەهات، بەڵام بەو مانا و واتایەی کە ئیسلام بەکاری هێنا زۆر جیاواز بوو، زۆرێک لە عەرەب جنۆکەی دەپەرست بە هۆکاری کاهین و پیاوانی جادوو بازیان، جنۆکە خۆشەویست بوو لای عەرەب، بێجگە ئەوەی فریشتەیان پەرستوە، جنۆکەیان بەسەرچاوەی وەحی شیعری زانیوە و هەموو شاعیرەکانی عەرەب لە کاتی وتنی هۆنراوەکانیاندا جنۆکە وەحیان بۆ دەهێنێت.

ئیسلام هات پێیوتن بنەڕەتی جنۆکە شوێنکەوتووی مرۆڤن، زۆر لاواز و بێ دەسەڵاتن تەنانەت شوێن پێغەمبەری مرۆڤەکان دەکەون، پاشان خودی (ئیبلس) ناونرا بە شەیتان. وشەی شەیتان لە ڕابردوودا لە ناوی عەرەب بەکار دەکات، بەڵام بۆ هەر شتێک کە بتخاتە ترس و فیتنەوە نموونەی (مار، سەگی ڕەش، هەموو ئاژەڵێکی دڕندە) پاشان (ئافرەت وتراوە شەیتان) بە بەندەی زۆر ڕەش وتراوە شەیتان) بەم شێوەیە وشەی شەیتان بەکار هاتووە لە ناو عەرەبدا،

هەرگیز بۆ ئیبلیس بەکار نەهاتووە لە لایەکی ترەوە عەرەب هەر نەیزانیوە (عەزازیل) کە (ئیبلیس)ە کێیە.

## چۆنیەتی سەرەتای ململانێکە

خوای گەورە بۆ پێغەمبەری ئازیز سەرەتای هەموو سەرەتاکانی مەخلوقی بۆ باس دەکات لە یەک ئایەتدا و دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّـٰكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَـٰيِشَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿١٠﴾﴾ الأعراف

واتە: ئێمە ئێوەمان جێگیر کردووە لەسەر زەویدا و هۆکارەکانی ژیانمان بۆ ئامادەکردوون و تیایدا ژیان و بژێویمان بۆ داناون، بەڵام کەمێك لە ئێوە هەیە کە شوکرانە بژێری ئەو ناز و نیعمەتانەی خوای گەورە بکات﴿١٠﴾

لێرەوە ڕووداو و باسەکان دەست پێ دەکات کە باسی سەرەتای (تەمکین) (جێنشین) کردنی مرۆڤ دەکات لەسەر زەوی، ئەمەش بە واتا فەراهەم هێنان و لە بارهێنانی زەوییە بە هەموو کەرەستە و مەخلوقەکانی بۆ خزمەتی مرۆڤ، تا ئەم مەخلوقە نوێیە تێیدا نیشتەجێ بێت، ئەم تەمکینە خواییە بۆ توخم و ڕەگەزی مرۆڤەکانە لە سەر زەوی، ڕاستییەکی ڕەهایە پێش دەستپێکی دروست بوونی مرۆڤ، هەموو کەرەستەکانی ژیانی ڕزق و ڕۆزی مرۆڤی تێدا بەرجەستە کرد لە سەر زەویدا، تا مرۆڤ ژیانی بەردەوام بێت، هەموو جۆرە هاوکاری مرۆڤی تێدا دروست کرد لە کانزاوە تا خۆراک و ئاژەڵ کە هەمووی بۆ خاتری مرۆڤە، هەر بۆیە لە کۆتایی ئایەتەکەدا باسی کەمێک دەکات کە سوپاسگوزارن، زۆرینەکەی کافرە، کەمینەکە ئیمانداره، سەرەتایەکی کەمی ململانێکە دەرکەوت.

لێرەدا ئایەتەدا بەڵگەی تەواو نیە پێش دروست بوونی مرۆڤ، خوای گەورە مرۆڤی بۆ سەر زەوی دروست کردووە کە زەوی بێتە بارەگای بۆ گەشە و نەشوما و دروست بوونی ڕەوەندەکانی، ئیتر باسەکانی تر لە جۆر و مانگ و جۆریەتی دەورانی ئاژەڵەکان و ڕووەک و گژوگیا...هتد، بۆ مرۆڤە و لەبەر خاتری مرۆڤ دروست بووە، هەموو یاساکانی گەردوونیش بۆ پێداویستی مرۆڤ دروست بووە، بە کورتی وشەی (تەمکین) هەموو ئەو مانا و واتایانە ئەدات بەدەستەوە، ڕێک پێچەوانەی فەلسەفەی ئیغریق و ڕۆمە کە پێیوایە یاسای گەردوون دژی مرۆڤە!

تەنها دید و تێڕوانینی ئیسلامییە کە پەیوەندی هەموو یاساکانی گەردوون دەکاتەوە بە مرۆڤەوە کە مرۆڤ هاوڕێی ژینگەیە و بەشێکە لەو ژینگە خۆی، هەموو نەوامیس و یاساکانی ڕێکخراون کە مرۆڤ سوودی لێ وەربگرێت، خودی مرۆڤ کوڕی ئەم خاکەیە و ئەم خاکە دروست بووە دەچێتەوە ناو خاک و سەر لە نوێ لە خاکیشەوە زیندووو دەبێتەوە مرۆڤ بەشێکە

لەم گەردوونە، ژیان و ڕزق و ڕۆزی لەسەر زەوی بۆ دانراوە لە لایەن پەروەردگاریەوە، پاشان بە وەحی ئەقڵ کلیلی بەشێکی زۆری نهێنییەکانی دراوەتە دەست.

پاشان کە خەڵکی سوپاسگوزارنین هاوکارەکەی جاهیلین، جاهیلیش بەشێکی گەورەیە لە کوفر- پێچەوانەکەشی ئیمان و خواناسیە.

لە دوای تەمکینی زەوی بۆ مرۆڤ، قورئان زۆر ورد و دەقیق باسی ڕووداوەکان دەکات، وشەی زۆر کەمیش، بەڵام فێر مەعریفەتت دەکات و دوای ئەو تەمکین، ئینجا باسی بە دیهێنانی مرۆڤ دەکات کە بەدیهێنانێکی تایبەتە و پاشان باسی دروست بوونی هەیکەل ڕوخسار و وەستانی مرۆڤ دەکات وەکو لە سەرەتاوە باسمان کرد (ثم) کەوتوتە نێوانی قۆناغەکان کە سەرنجراکێشانێکی زۆر وردی قورئانە بۆ خەڵکی دوای جاهیلی کە خەڵکە نوێیەکە بە ئیمان و قورئان پەروەردە دەبن بە ڕابەرایەتی حەزرەتی محمد ﷺ خوای گەورە بۆ شیکاری ململانێتەکە بەو پێغەمبەرە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَـٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَـٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴿١١﴾﴾ الأعراف

واتە: ئەی ئادەمیزاد بە دڵنیایی ئێوەمان دروست کردووە پاشان وێنەمان کێشاون، مەبەست لە ئادەمە، پاشان بە فریشتەکانمان وت کە کڕنوشی ڕێز بۆ ئادەم بەرن، هەر هەموویان کڕنوشیان بۆ ئادەم برد و فەرمانی خوای گەورەیان جێبەجێ کرد تەنها ئیبلیس نەبێ، کە جنی بوو مەلائیکەت نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر عیبادەتی خوای ئەکرد لە ڕیزی مەلائیکەتان باسکراوە، ئەو لە کڕنوشبەران نەبوو و کڕنوشی بۆ ئادەم نەبرد﴿١١﴾

ئایەتەکە قۆناغی سەرەتای خانە و تێگەیشتنی بە چاودێری خوای کە زەمەن و سەردەمانێکی زۆر تولانی خایاندوە تا مرۆڤ بۆتە مرۆڤ کە ئەرکی بانگەواز و ناسینی خوای پێبسپێرێت. نوێنەری ئەو مرۆڤانەش کەسێکە بە ناوی ئادەم، چونکە یەکەم مرۆڤ ناسراوە کە دەبێتە خەلیفە و سوجدەی بۆ دەبرێت لە لایەن فریشتەوە، بەهەمان شێوە سەرداری سەر زەوییە، لە ناو ئەو لە دایک بووە ئەو ئاهەنگی بە خەلیفە بوونە، مەخلوقێکی تر دەردەکەوێت کە سەرپێچی دەکات، ئەو مەخلوقەش ( ئیبلیسە) کە زۆر پڕکین و ڕقە، بەخیلە و ئیرەیی دەبات بەم مەخلوقەی تر کە مرۆڤە، دەزانین لە خانەی بوونیەوە کە مادە خاوەیەکەتی لە قوڕ دروست بووە، جێگای پێگەیشتنی ناو خاک و ئاو بووە تا بۆتە مرۆڤ، بە ئاڕاستەی خوای پەروەردگار نەک مەبەست تیۆری داروینزم بێت، واتا لە بنەڕەتێکی ئاژەڵی ترەوە یاخود مەخلوقی ترەوە هاتبێت، ئەمە پێچەوانەی بیر و بۆچوونی ئێمەی مسوڵمانە، بەڵکو قۆناغی خانەی زیندوووی مرۆڤ هەر مرۆڤ بووە تاکو بۆتە ( بەشەر) کە لاشە و ئەندام و هەموو پێکهاتەکانی خوای گەورە بۆی سازاندووە.

شەیتان لە جنسی جنۆکەیە، تەنها ئیسلام ئەم ڕاستییەی خستۆتە ڕوو، هەموو ئایینەکانی تر بە فریشتەی دەزانن، تەنانەت هەندێک لە ئایینەکانی تری ئاسیا ( میترای) وەکو نموونەی زەردەشتی و یەرسانی و هتد بە خوا دەزانن ئەوان دابەشیان کردووە بەسەر دوو خوادا، بە ناوی (ئەهریمەن) کە خراپەکارە و شەیتانیانە، پاشان (ئاهورامازدا) کە خوای چاکەیە.

ئیسلام پێوانە و قەبارە خۆی داوەتێ کە مەخلوقێکی لاوازە و لە جۆری جنۆکەیە.

لێرەوە ململانێ سەرەتایەکە دەستی پێ کرد لە نێوان چاکەخوازی ئیمان و خراپەکاری کوفردا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴿١٢﴾﴾ الأعراف

واتە: خوای گەورە بۆ سەرزەنشت کردن و جێگیرکردنی بەڵگە بەسەریدا فەرمووی: ئەی ئیبلیس چی ڕێگری لێ کردیت کە سوجدە بۆ ئادەم بەریت کاتێك کە من فەرمانم پێ کردیت وتی: ئەی خوایە من لەو باشترم منت لە ئاگر دروست کردووە ئەوت لە قوڕ دروست کردووە، ئاگریش لە قوڕ باشترە بەگومانی خۆی﴿١٢﴾

لێرەدا بە تەواوەتی دەردەکەوێت کە ئەم ئیبلیسە خاوەنی ئازادی و هەڵبژاردنە، بەڵام فریشتە هەڵبژاردن و ئازادییان نییە، وەکو مرۆڤ و جنۆکە چونکە ئەوان بەهەشت و دۆزەخیان نییە، لێپرسینەوە ناکرێن چونکە بێ فەرمانی هەرگیز ناکەن.

هەڵەش ناکەن، چونکە خوای گەورە وا دروستی کردوون بەڵام ئەم مەخلوقەی تر جنۆکەیە و خوای گەورە لە سورەتی (الکهف) دا ئاماژەی پێ داوە کە جنۆکەیە.

گفتوگۆکە لە ڕابردوودا ئاماژەمان پێداوە لێرەدا پێویست ناکات دووبارەی بکەینەوە.

لە کۆتاییدا سوێند دەخوات کە سەرلێشواوی دروست بکات بۆ مرۆڤەکان، لێرەدا لەم ڕوودانەدا چەند ئاماژەیەکی لاوازی مرۆڤ دەردەکەوێت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە بە وەحی خوای گەورە ئاگاداری کردۆتەوە.

لاوازی مرۆڤ لە بیرچوونەوەیە بە هۆکاری شەهوەت، شەیتان هەڵیخەڵەتاندن بە هۆکاری شەهوەتی ژیان بوو، کە دەبنە خاوەنی موڵک بۆ هەتا هەتایی.

لە کاتی بیرچوونەوە و شەهوەت دا ئەم مەخلوقە کە مرۆڤە هەڵەی زۆر دەکات، بەڵام بە گەڕانەوە و داوای لێ بووردن خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، بەو مەرجەی هەست بە پەشیمان بوونەوە بکا، لە تاوانەکەی داوای ڕەحمەت بکا یەقینیشی هەبێت کە خوا لێی خۆش دەبێت.

## ڕووتبوونەوەی ئادەم و حەوا

لە زۆربەی باسەکانی ئادەم دا باسی هاوسەرەکەی کراوە لەگەڵیدا، ئەمەش ڕاستەوخۆ بۆ پێغەمبەری ئازیز ﷺ بوو کە بە کۆمەڵگەی قوڕەیش و هەموو مرۆڤایەتی بڵێین: ئافرەت و پیاو وەکو یەکن و هەردووکیان مرۆڤن، یەکسانن لەپاداشتیاندا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ①﴾ النساء

واتە: ئەی خەڵکینە تەقوای ئەو خوایە بکەن کە ئێوەی دروست کردووە لە یەك نەفس، خێزانی بۆ دروست کردوون، پیاوان و ئافرەتانێکی یەکجار زۆری لەسەر ڕووی زەویدا بڵاو کردۆتەوە، تەقوای ئەو خوایە بکەن کە هەندێکتان داوا لە هەندێکتان ئەکەن بەخوای گەورە، واتە دەڵێن: لەبەر خوای گەورە ئەو شتەمان پێ بدەن، سیلەی ڕەحم و پەیوەندی خزمایەتیتان بگەیەنن و مەیپچڕێنن، بەڕاستی خوای گەورە چاودێرە بەسەرتانەوە و ئاگای لێتانە①

هەروەها خوای گەورە بۆ یەکسانی پاداشتی ژن و پیاو دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَـٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ وَٱلْقَـٰنِتِينَ وَٱلْقَـٰنِتَـٰتِ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلصَّـٰدِقَـٰتِ وَٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰبِرَٰتِ وَٱلْخَـٰشِعِينَ وَٱلْخَـٰشِعَـٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَـٰتِ وَٱلصَّـٰٓئِمِينَ وَٱلصَّـٰٓئِمَـٰتِ وَٱلْحَـٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَـٰفِظَـٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ٣٥﴾ الأحزاب

واتە: پیاوانی موسڵمان و ئافرەتانی موسڵمان، پیاوانی باوەڕدار و ئافرەتانی باوەڕدار، پیاوانی خواپەرست و گوێڕایەڵ و ئافرەتانی خواپەرست و گوێڕایەڵ، پیاوانی ڕاستگۆ و ئافرەتانی ڕاستگۆ، پیاوانی ئارامگرو ئافرەتانی ئارامگر، پیاوانی خۆبەکەمزان و ئافرەتانی خۆبەکەمزان، یان لە عیبادەتدا ملکەچ بۆ خوای گەورە، پیاوانی خێرخواز و ئافرەتانی خێرخواز، پیاوانی ڕۆژوووەوان و ئافرەتانی ڕۆژوووەوان، ئەو پیاوانەی کە داوێنی خۆیان لە حەرام ئەپارێزن و ئەو ئافرەتانەیشی کە داوێنی خۆیان لە حەرام ئەپارێزن، ئەو پیاوانەی کە زۆر زیکر و یادی خوای گەورە ئەکەن و ئەو ئافرەتانەی کە زۆر زیکر و یادی خوای گەورە ئەکەن، لە هەموو حاڵەتێکیاندا ئا ئەمانە بە ژن و پیاوەوە خوای گەورە لێخۆشبوون و ئەجرو پاداشتێکی زۆر گەورەی بۆ ئامادەکردوون٣٥

خوای پەروەردگار سەرەنجی قوڕەیش بەوە ڕادەکێشێت، کە ئادەم و حەوا ڕوون بوونەوە بە هۆکاری تاوانیان لەو باخ و باخاتەی کە تێدا دەژیان بە زمانی عەرەبی بە واتا ( الجنة) لێرەدا باسەکە زۆر پەیوەستە بە قوڕەیشەوە بە ژیانی پێغەمبەری خواوە ﷺ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِى سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَـٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ قُلْ أَمَرَ رَبِّى بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا۟ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۚ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَـٰلَةُ ۗ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلشَّيَـٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٠﴾ * يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَـٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣٢﴾ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّىَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَـٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٤﴾﴾ الأعراف

واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم ئەوە ئێمە پۆشاکێکمان بۆ دابەزاندوون بۆ ئەوەی کە عەورەتتان داپۆشێت، پۆشاکێکیش بۆ جوانی کە خۆتانی پێ برازێننەوە و عەورەتی خۆتانی پێ داپۆشن، بەڵام پۆشاکی تەقواو ئیمان و کردەوەی چاك و لە خوا ترسان ئەمە باشترین پۆشاکێکە کە خەڵکی خۆی پێ برازێنێتەوە، ئەمانە نیشانەی خوای گەورەن بەڵکو ئێوە یاد بکەنەوە﴿٢٦﴾ ئەی نەوەکانی ئادەم شەیتان فێڵتان لێ نەکات و نەتانخەڵەتێنێت هەروەکو فێڵی لە دایك و باوکتان کرد و لە باخوباخاتەکە دەری کردن بەوەی کە تووشی ئەو سەرپێچی و تاوانەی کردن کە بەهۆی ئەو تاوانەوە پۆشاکیان لەبەر نەما و عەورەتیان دەرکەوت، خۆتان بپارێزن و عەورەتتان داپۆشن لەبەر ئەوەی ئەوان واتە: جنی و شەیتانەکان ئێوە ئەبینن بە شێوازێك کە ئێوە لە دونیادا ئەوان نابینن، بەڵام کە پۆشاکتان دانا بسم الله بکەن ئەوا ئەوان ناتوانن عەورەتتان ببینن، ئێمە شەیتانەکانمان داناوە کە دۆست و یارمەتیدەری ئەو کەسانە بن کە ئیمانیان نییە و بێ ئیمانن﴿٢٧﴾ کاتێك کە کافران و موشریکان تاوانێك ئەکەن ئەڵێن: ئێمە باوك و باپیرانی خۆمان لەسەر ئەم تاوانە بینیوە و لەوانەوە بۆمان ماوەتەوە، خوای گەورە فەرمانی بەئێمە کردووە بەم تاوانە، ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەمەی ئێوە دەیکەن خراپەکارییە و بەڕاستی خوای گەورە فەرمان بە خراپەکاری ناکات، ئایا ئێوە قسەیەکی ناشرین ئەدەنە پاڵ خوای گەورە کە هیچ زانیاریەکتان پێ نییە، چۆن خوای گەورە فەرمان بە شتی وا ئەکات﴿٢٨﴾ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ:

پەروەردگارم فەرمانی کردووە بە دادپەروەری و دامەزراوی، نوێژ بۆ خوای گەورە بکەن و ڕوو بکەنە قیبلە لە هەموو مزگەوتێکدا عیبادەتی خوای گەورە بکەن بە ئیخلاص و بەدڵسۆزییەوە و نیەتتان تەنها بۆ خوا بێت، چۆن سەرەتا ئێوەی دروست کردووە ئاواش ئەتانگەڕێنێتەوە بەڕوتی﴿٢٩﴾ خەڵك بوونە دوو بەش کۆمەڵێك هیدایەتیان وەرگرت و کۆمەڵێکیش گومڕا بوون کە کافران بوون، ئەوان شەیتانیان کردە دۆست و پشتیوان و یارمەتیدەری خۆیان لە غەیری خوای گەورە و گوێڕایەڵی شەیتانیان کرد وایان ئەزانی کە ئەوان لەسەر ڕێگای هیدایەتن، ئەی ئادەمیزاد ئێوە لە هەموو مزگەوتێکدا خۆتان بڕازێننەوە و عەورەتی خۆتان داپۆشن﴿٣١﴾ بخۆن و بخۆنەوە بەڵام ئیسراف و زیادەڕەوی مەکەن، واتە: هیچ شتێك لە خۆتان حەرام مەکەن لەوەی کە خوای گەورە بۆی حەڵاڵ کردوون، وەکو خەڵکی سەردەمی نەزانی کۆمەڵێك شتیان لە خۆیان حەرام ئەکرد وەکو باسمان کرد، یان حەرام مەخۆن حەرام خواردن ئیسراف و زیادڕەویە، بە دڵنیایی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێ کە ئیسراف و زیادڕەوی ئەکەن، یان ئەوانەی کە حەڵاڵ حەرام دەکەن و حەرام حەڵاڵ دەکەن﴿٣١﴾ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەو جوانییەی کە خوای گەورە دەریخستووە بۆ بەندەکانی خۆی و ئەو هەموو ڕزقە حەڵاڵ و پاك و بەتام و چێژە کێ حەرامی کردووە، تا ئەوان لەسەر خۆیانی حەرام بکەن، ئەی محمد ﷺ بڵێ: ئەمە لە دونیادا خوای گەورە تایبەت بۆ باوەڕدارانی دروست کردووە بەڵام کافریش لە دونیادا تیایدا بەشدارە، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا تایبەت ئەبێ بە ئیماندار و کافر بەشداری ناکات لەو تام و چێژ و لەزەت و نیعمەتانەی خوای گەورە کە لە بەهەشتدا بە باوەڕدارانی ئەبەخشێت و بەهەشت حەرامە لە کافران بەم شێوازە ئایەتەکانی خۆمان درێژە پێ ئەدەین و ڕوونی ئەکەینەوە بۆ کەسانێك کە زانیاریان هەبێت﴿٣٢﴾ ئەی محمد ﷺ بڵێ: تەنها پەروەردگارم فاحیشەو بەدڕەوشتی و تاوانی حەرام کردووە ئەوەی بە ئاشکرا ئەکرێ، و ئەوەی کە بەنهێنی ئەکرێ هەموو تاوانێك و زوڵم و ستەمکردن لە خەڵکی بەناحەق، هەمووی حەرام کردووە شەریك دانێن بۆ خوای گەورە لە کاتێکدا خوای گەورە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر ئەوە دانەبەزاندووە، ئەوەیشی لەسەرتان حەرام کردووە لە خۆتانەوە بەبێ زانیاری بەناو خوای گەورەوە قسە بکەن و قسە بدەنە پاڵ خوای گەورە﴿٣٣﴾ هەموو ئوممەتێك کاتی دیاریکراوی خۆیان هەیە کە تیایدا ئەجەلیان دێت، کاتێك کە ئەجەلیان دێت تەنها یەك چرکە و کاتێك نە ئەجەلیان دوا ئەکەوێ نە پێش ئەکەوێت﴿٣٤﴾

شیکارییەک لە سیرەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دا بۆ ئەم چەند ئایەتەی سورەتی ئەعراف؛ لە دیمەنەکانی ئەم سورەتەدا باسی دروست بوونی مرۆڤ و نوێنەری مرۆڤ بوو کە حەزرەتی ئادەمە، پاشان ئاراستەی مرۆڤی دوای قورئانە بۆ ئاستێکی زۆر بەرز و پاشان دەست نیشان

کردنی پیشەی مرۆڤ لە سەر زەویدا و بارگاوی کردنی بە بەندایەتی کردن و چۆنیەتی ململانێ نێوان شەیتان و مرۆڤ تا ڕۆژی قیامەت، یان ململانێی کوفر و ئیمان.

هەرچەندە ئەم ئایەتانە هەموو باسی شێوە و میتۆدی هەڵخەڵەتاندنی شەیتانە لە هەمبەر مرۆڤدا، بەڵام زیاتر پەیوەستە بە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچەندە هەمان مانا و واتا لەگەڵماندا ڕێگا دەبڕێت لە سەردەمەکانی ڕابردوو ئێستا و داهاتووشماندا، چۆن؟!

مەنهەجی قورئانی باسی چیرۆک و گێڕانەوەی مێژوو نییە بە تەنها، بەڵکو باسی واقعی ژیانە لە هەرسێ توخمەکەی کات دا کە بریتیە لە ( ڕابردوو، داهاتوو، ئێستا)دا.

باسی بیدعە و داهێنانێکی قوڕەیشە کە لە بەرانبەر هەموو موشریکێکی عەرەب داهێنابوو، کە دەهاتن بۆ ماڵی خوا و حەجیان دەکرد، بەڵام لەناو کەعبەدا ئەو هەموو بتەیان تیا دانابوو، خۆیان شەریعەت و کاهین و جۆرەها خورافات یاسای جاهیلەتیان داڕشتبوو.

هەمووی دەزگای شەیتانی بوو کە عەرەب لەو سەردەمەدا دایهێنابوو، بەردەوام ئەم دەزگا شەیتانیانە لە شارستانیەتەکاندا کار دەکەن بۆ وەسوەسە بوونی مرۆڤەکان.

قوڕەیش یاسایەکی دامەزراندبوو بە ناوی ( الحمس) ئەم یاسایە تەنها پەیوەست بوو بە قوڕەیش، هیچ کام لە عەرەب ئەو مافەی نەبوو کە بە کاری بهێنێت، هاوشێوەی ( خلاص)ی نەسرانیەکان بوو، قوڕەیش نەیدەهشێت، لە کاتی تەواف و حەجدا جلوبەرگی خۆیان بپۆشن دەبوو جل و بەرگی قوڕەیش بپۆشن، یان بە قەرز وەریبگرن، یان بە کرێ یاخود لە قوڕەیش بکرن، ئەم یاسایە دەیوت ئەگەر جلت دەست نەکەوت بە ڕووت و قوتی طەواف بکە، پیاوان بە ڕۆژدا تەوافیان دەکرد ژنانیش بە شەودا، دەبوو گەڵا یان هەر شتێکی تر بە عەورەتی خۆیانەوە بئالێنن! واتا هەموو بە ڕووت و قوتی.

ئبن کەثیر لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: بێجگە قوڕەیش هەموو عەرەب دەبوو بەرگێک بپۆشن کە تاوانی پێوە نەکرابێت تەنها قوڕەیش نەبێت کە خاوەنی یاسای (الحمس) بوو بە جلوبەرگی ڕۆژانەی خۆیان تەوافیان دەکرد، دەبوو جل و بەرگی قوڕەیش بکڕن یان بە کرێ بهێنن یاخود وەری بگرن، ئافرەتان لە شەودا تەوافیان دەکرد، بەم شێوەیە ئەم شەریعەتەیان بۆ خۆیان داڕشتبوو، بەڵام شەریعەتێکی سەخیف و فاحیشە کە ئارەزوو هەوا و هەوەسی دەسەڵاتدارانی قوڕەیشی تێر دەکرد لە دوو ڕووەوە، یەکەم بازرگانی کە دەبێت جل و بەرگی قوڕەیش بپۆشن و بکڕن، دووەم شەهوەتیان کە تەماشای عەورەتی ئافرەتیان دەکرد یا خوای پەروەردگار ئەو کارەی بە زۆر خراپ و فاسد باسکرد، ئەوانیش واتا قوڕەیش دەیانووت ئەوە شەرعی خوایە، بەڵام کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ پرسی ئەم شەرعی خوایەتان لە کوێ هێناوە؟ نەیانتوانی

سەرچاوەی دروست بهێنن وتیان: باو و باپیرانمان ئەم کارەیان کردووە، ئێمەش لاساییان دەکەینەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ وەحی بۆ هات، خوای موتەعال فەرمووی: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ خوا فەرمان بە فاحیشە و کاری خراپەکاری ناکات، بەڵکو فەرمان بە دادپەروەری و ڕاوەستاوی ئیمان و حەیا و حورمەت شەرمنی و داپۆشراوی دەکات، ئینجا خوای گەورە بەو ئایەتانەی کە باسی ڕووداوی شەیتان و ئادەم بوو، باسەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە، کە ئەمان لە دەزگاکانی شەیتان و کار دەکەن و هاوکاری شەیتانن، ئیتر چۆن کارە گەندەڵ و خراپەکەیان ئەدایە پەنای خوای پەروەردگار، واتا هەموو باسەکە بۆ قورەیش بوو، بەڵام هەمان دەزگای شەیتانی لە ئەمڕۆدا کار دەکات بە ناوی ژیان و شارستانیەت و مۆدێل و جۆرەها فێستیڤاڵ و کاری تر تا خەڵکی ڕووت بکەنەوە هەمان کاری شەیتان و جاهیلی قورەیش ئەنجام بدەن!.

پاشان خوای گەورە لە شێوەی بانگدان و بانگەوازی دەنگ بەرزکردنەوەدا هەموو مرۆڤایەتی و نەوەکانی ئادەم ئاگادار دەکاتەوە لە ڕووت بوونەوەی لاشە، لە ڕووتبوونەوەی فیکر، لە ڕووتبوونەوەی ڕەوشت، لە ڕووتبوونەوەی بەها و ئاکارە بەرزەکانی ئیسلام بە گشتی.

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: داپۆشینی عەورەت چ پیاو چ ژن مەبەست داپۆشراوییە بەگشتی نەک تەنها پاش و پێش، ئەوە جلوبەرگی تەقوایە.

سەید قوطب دەڵێت: خوای گەورە بیریان دەخاتەوە بە ڕووداوی ئادەم کە نیعمەتی تەشریعی داپۆشین لەبیر نەکەن، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ وشەی چاکسازی بکەن لەناو خۆیاندا واتا صیانەی خۆیان بکەنەوە بۆ ئەوە لە مرۆڤ بوون نەچنە ئاستی ئاژەڵ بوون، چونکە ڕووت و قووتە!

هەرچەندە باسەکە زۆر زیاتر هەڵدەگرێت لەژیانی پێغەمبەردا، بەڵام دەبێت باسێکی تر بکەینەوە لەسەر ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێغەمبەرانی دیکە سەلامی خوا لە هەموویان بێت.

## الاسراء، یونس، هود و یوسف

لەوانەیە ناونیشانەکەت لا سەیر بێت، بەڵام ئەم ناونیشانە پەیوەندی بە خودی پێغەمبەرانەوە نییە، بەڵکو مەبەست چوار سورەتە کە بەدوایدا دابەزیون سورەتی ( الإسراء، (یونس)، هود، یوسف)، ئەم چوار سورەتە لە حاڵەتێکی زۆر سەخت و دژوار دابەزیوە، باسی زۆرێک لە پێغەمبەرانی سەرەتای کردووە بۆ پێغەمبەری خوا محمد ﷺ، مەبەست لە پێغەمبەرانی سەرەتای ((نوح) و هود و صالح و لوط و شعیب)ە سەلامی خوا لە هەموویان

بێت، هەروەها ئەو چوار سورەتە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەیەوە دەفەرموێت: پیری کردم هود و براکانی، لێرەدا براکانی هود ئەم چوار سورەتەن، بەڵام سورەتی الأسراء کۆتایی هەموویان بووە.

(شیبتني هود و أخواتها) گومانی تێدا نییە سورەتەکان هەموویان لە شاری مەککە دابەزیون، پێغەمبەری خوا ﷺ باسێکی زۆری قیامەت و باسی پێغەمبەرانی بۆ دابەزیوە لە شاری مەککەدا، هەموو باسەکانی هەڵساندنی ئیمان بوو کە خەوی غەفڵەت، پەروەردەکردنی هاوەڵان لەسەر بیروباوەڕی ئیسلامی هەموو ئایینەکان لەگەڵ جوانی بەلاغەیدا، توندبوون ترسێنەر بوون قوڕەیش چەندە دژایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ -ی دەکرد، لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا بێ دەنگ دەبوون، سەرسام دەبوون، هەموو باسەکانی بۆ قوڕەیش نوێ بوو یان ئەگەر نوێ نەبوایە لایان ڕاستەوخۆ باسی واقعی ژیانی ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێیان لێ دەگرت بە شەودا کە قورئانی لە ناو نوێژدا دەخوێند گوێیان لێ دەگرت، تەنانەت کە بەیەکتریان دەزانی سەرزەنشتی خۆیان دەکرد، بەڵام خۆیان پێ نەدەگیرا بۆ ڕۆژی دواتر دەهاتنەوە، ئەوە حاڵی قوڕەیش بوو لە هەمبەر قورئاندا.

قوڕەیش دەیزانی ئایینی ئیسلام ڕاستە، دەشیانزانی محمد پێغەمبەر ﷺ هەر سەردەکەوێت، بەڵام قوڕەیش پڕۆژەکانی کەوتبوونە ژێر مەترسی، تەنها لەبەر سەروەت و سامان دژایەتی پێغەمبەریان دەکرد، دەیانوت ئەگەر بتەکان لابەرین کێ دێت بۆ شاری مەککە؟!

ترس داگیرتبوون و دەیانووت هەموو عەرەب جەنگیان دەکات، شەهوەتباز بوون شەهوەت و حەزەکانیان لە دەست دەرچوو زۆریتر کە ڕێگر بوون لە هەمبەر هیدایەتیاندا، ماوەی سیانزە ساڵ بانگەوازی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ زۆربەی ئەو سورەتانەی بۆ دادەبەزی کە هاندانی بوو بۆ بەردەوام بوون لە بانگەواز، وەکو سورەتی (نوح) کە هەمووی باسی ژیانی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزەیە، خوای گەورە باسی (٩٥٠) ساڵی بانگەوازی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد کە (نوح) کردوویەتی (هەڵبەت بە گوێرەی ڕۆژمێری ئەو سەردەمە، ئەو ژمارە زۆرە بە ڕۆژژمێری سەردەمی (نوح) کە سێ هەفتە ساڵێک بووە)، سەبووری دڵ ئارامییەک بووە بۆ پێغەمبەر خوا ﷺ قوڕەیش داوای زۆر شتی نامەعوقڵیان دەکرد، داوایان دەکرد خوا لە ئاسمان بێتە خوارەوە بۆ لایان و لەگەڵ فریشتەکاندا سەرانی قوڕەیش ئاخافتنیان لەگەڵ بکەن، داوایان دەکرد فریشتە ببێتە پێغەمبەر یاخود داوای باخوباخات و گەنجینەیان دەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ. خوای گەورەش فەرمووی: محمد ﷺ پێیان بڵێن من وەکو ئێوە مرۆڤم، ئەو توانایە لە مندا نییە و تەنها پەیامێکم هێناوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوۡ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٞ مِّن نَّخِيلٖ وَعِنَبٖ فَتُفَجِّرَ ٱلۡأَنۡهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفۡجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوۡ

يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا﴿٩٣﴾﴾ الإسراء

واتە: کافرە ناودار و گەورەگانی مەککە وتیان: ئەی محمد ﷺ ئیمانت پێ ناهێنین تا لەم زەویەوە کانیمان بۆ هەڵنەقوڵێنیت و ئاوەکەی بەبەرچاومانەوە نەڕوات﴿٩٠﴾ یاخود باخت نەبێت لە دار خورما و ترێ لەناو ئەوانیشدا کانی هەڵبقوڵێنی و بەخێرایی ئاو لە ناوەڕاستیاندا هەڵبقوڵێت و دەرپەڕێت﴿٩١﴾ یاخود ئاسمان پارچە پارچە بکەیت و بەری بدەیتەوە بان سەرمان، چۆن دەڵێیت لە قیامەتدا وای لێدێت یان خوای گەورە و مەلائیکەتەکان کۆمەڵ کۆمەڵ بێنی تا بەچاو خۆمان بیانبینین﴿٩٢﴾ یان ئەبێ ماڵێکت هەبێ لە زێڕ و ڕازاوە بێت، یاخود بەرز بیتەوە بۆ ئاسمان کە بەرزیش بوویتەوە بۆ ئاسمان و هەڵفڕیت ئەوا ئیمان بە بەرز بوونەوەکەت ناهێنین تا لەو سەرەوە گەڕایتەوە کتێبێکمان بۆ نەهێنی لە لایەن خوای گەورەوە بەڵگە بێ لەسەر پێغەمبەرایەتیت و خۆمان کتێبە بخوێنینەوە، ئەبێ ئەوەندە شتە بکەی ئەو کاتە ئیمانت پێ دێنین ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: پاك و مونەززەهی بۆ خوای گەورە کە توانای هەموو شتێکی هەیە بەڵام من هیچ شتێك نیم تەنها مرۆڤێکم و پێغەمبەری خوام و توانای هیچ شتێك لەمانەم نییە و مەلائیکەت نیم تا بەرز ببمەوە بۆ ئاسمان﴿٩٣﴾

ئەوانە چەندە داوای نائەقڵانی بوون دەکەن، قورئان بەو پەڕی ئەقڵانییەتەوە وەڵامیان ئەداتەوە!

داوای ئەوە دەکەن کە فریشتە پێغەمبەر بێت، خوای گەورە زۆر بە ئەقڵانی وەڵامیان ئەداتەوە لە ڕێگای وەحییەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و دەفەرموێت، ئەگەر فریشتە لەسەر زەویدا بوایە و ئەوان خەلیفەی خوا بونایە، بە دڵنیاییوە فریشتەیان بۆ دەهات، بەڵام ئێوە مرۆڤن دەبێت لە خۆتان بێت ئەو پێغەمبەرە تا بتوانن لاسایی بکەنەوە، ﴿وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِي ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا﴿٩٥﴾﴾ الإسراء

واتە: چی ڕێگری لە خەڵکی ئەکات کە ئیمان بێنن کاتێك کە هیدایەتیان بۆ هات تەنها ئەوە نەبێ کە ئەیانووت: ئایا خوای گەورە مرۆڤێکی کردووە بە پێغەمبەر؟! ئەیانووت چۆن ئەبێ پێغەمبەر مرۆڤ بێ﴿٩٤﴾ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر لەسەر زەویدا فریشتە بژیایە و بەهێمنی و ئارامی بەسەر زەویدا بڕۆیشتنایە ئەوە ئێمەش لە ئاسمانەوە مەلائیکەتێکمان بۆ

دەناردن و ئەمانكرد بە پێغەمبەر، بەڵام ئەوان ئیمان بە مرۆڤەكە ناهێنن، چۆن ئیمانیان بە مەلائیكەت ئەهێنا﴿٩٥﴾

ئەم داوایانەی كردیان زۆر نەشیاو و نەگونجاو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە لەو داوایانەی قورەیش زیاتری بەخشیە پێغەمبەری خوا ﷺ.

كە بردی بۆ ئیسراء واتا ( شەو ڕێ: شەوگەشت) كە هەموو پێغەمبەرانی لە وێدا بۆ كۆ كردەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ بووە ئیمامیان، پاشان كۆنگرەیەكی پێغەمبەرانی بۆ پێغەمبەری ئازیز ﷺ ڕێكخست.

لەوەش گەورەتر نوێنەری مرۆڤایەتی هێنا لەگەڵ فریشتە دا بۆ نیشاندانی هەموو مەلەكوت كە كۆی هەموو مەملەكەتەكانی خوای پەروەردگارە، جا چ ئاسمانەكان بێت یان جیهانی هەموو پێغەمبەران بێت، یاخود بە هەشت و دۆزەخ بێت، گەیشتە جێگایەك كە ناوی (سیدرە)یە كۆتایی جێگایە لە نزیكی لە خوای پەروەردگار كە حەزرەتی جوبرەئیلیش ناتوانێت بڕواتە ئەو شوێن و جێگایە، ئەوەش دیسان پلە و پایەی مرۆڤ و ئاستی مرۆڤ دەردەخات كە خوای گەورە مرۆڤی بردە جێگایەك بێجگە محمد ﷺ كە مرۆڤ هیچ مەخلوقاتێك ئەو جێگایەی نەدیوە.

داواكە زۆر لەوە گەورەتر و فراوانتر بوو كە قورەیش داوای دەكرد لە پێغەمبەر لەسەر زەویدا، هەستیان بەوە نەكرد قورەیش كە هەموو ئەمانەی وتیان لە ڕابردوودا دەشێت ببێت، بەڵام ئەو مرۆڤەی كە پاكە و ڕاستگۆیە و ڕەوشتی لەسەرو بەرزەكانەوەیە، محمد ﷺ-مە و لە قورەیشە.

ئەم گەشتە موبارەكە لە هەناویدا كۆنگرەی پێغەمبەران بە گشتی و نیشاندانی مەلەكوتی پەروەردگاری تێدا بینی پێغەمبەری خوا ﷺ، هاوشێوەی مانگاكەی گەلی ئیسرائیل بوو، داواكە خۆیان قورسیان كرد، قورەیش خۆیان لێ بێبەری بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ-ی پێ شەرەفمەند بوو.

هاوشێوەی (موسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) كە دەچووە سەر كێوی طور لە بیابانی سیناء لەگەڵ خوای پەروەردگار موناجاتی دەكرد، پێغەمبەری خوا ﷺ -ش هەمان موناجاتی كرد لەگەڵ پەروەردگاری، بەڵام لە جێگایەك كە هیچ مەخلوقێك نەچۆتە ناوی ئەویش (سدرة المنتهى)یە، خۆ (موسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) كە دەچوو لەگەڵ خوادا موناجات بكات كە نەیدەزانی جێگایەكە لە شاخەكەدا كوێیە و گوێیان لە دەنگی خوای موتەعال نەبوو، تەنها تایبەت بوو بە (موسا) (عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ).

قورەیش و بەشێک لە موسوڵمانان بۆیان جێگای بڕوا نەبوو، هەندێک لە ئیمانداران تووشی فیتنە بوون پەشیمان بوونەوە لە ئایینەکەیان، فیتنەیەکی زۆر گەورە بوو، چونکە ئەقڵیان ئەوەندە بچووک بوو بڕوایان نەدەکرد.

بە پێچەوانەی ئەوانەوە ئەبوبەکر سدیق ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت تا ئەوکاتە بە کوڕی ئەبو قوحافە ناسرابوو کە باسی ئیسرا و میعراج کرا زۆر بە ئەقڵانی وەڵامی داوە و فەرمووی: من بڕوا بکەم لە ئاسمانەوە وەحی بۆ بێت بۆ بڕوا ناکەم کە چوبێتە ئیسرا و میعراج! کەسێک کە توانای هەبێت بەو شێوەیە ئەقڵانی بێت و ڕووداوەکان هەڵاوێر بکات و خێرا شیکاری بۆ بکات، لایەقیەتی نازناوی (صدیق) وەربگرێت لەوکاتەوە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قوحافە بووە ئەبوبەکری صدیق.

خوای پەروەردگار لە سەر جیهانی مرۆڤەکان، جیهانی پێغەمبەرانی بە سەدان هەزار کەس کۆکردەوە بۆ پێغەمبەر لە مزگەوتی (ئەقصا)، کات و شوێن ئێمەین کە دەست نیشانی دەکەین بە پێوەری مادی، بەڵام لای خوای موتەعال کات و شوێن، مەخلوقە و چۆنی بوێت لە (کن فیکون) ێکدا گۆڕانکاری جا چ باش پێش بێت، یان ڕاوەستانی بێت دەیکات بۆ کاری موعجیزە هەروەک نموونە ( یارانی ئەشکەوت، حەزرەتی عوزێر، ڕاوەستانی خۆر بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بۆ پێغەمبەر یەشەعی کوڕی نون) نمونەی تریش زۆرە.

کەواتە زۆرجار ئەگەر مرۆڤ خاوەنی ئەقڵ و شیکاری ئەقڵی نەبێت هەر زوو بە خێرایی ڕێگای هیدایەت ون دەکات ئەمەش لە ڕووداوی ئیسرا و میعراج دا ڕوویداوە، لەوانەیە لێرەدا خوێنەر بپرسێت جا ئەم باسە چ پەیوەندی بە ژیانی پێغەمبەرانەوە بوو لە سەر ژیانی حەزرەتی محمد ﷺ، بە ڕاستی پەیوەندی زۆری هەیە لە ئاسماندا، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پرس و ڕاوێژی پێغەمبەرانی تر وەکو حەزرەتی (موسا) و حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوایان لێ بێت زۆر ئەزموون بۆ ئێمە زیاد بوو، لەوانە پێنج فەرزەی نوێژ و زیکر و چۆنیەتی کارکردن بۆ بەهەشت.

نووسەر: لە ڕاستی دا خاڵە گەوهەرییەکە ئەوەیە کە ئەوانەی ڕابردوو هیچی باسی سەرەکی نەبوو، بەڵکو بۆ کتێبەکە باسی لاوەکی بوو، بەڵام بۆمان دەبێتە کەرەستە لە داهاتوودا.

چۆن؟!

دێینەوە ناو باسی پیرکردنی پێغەمبەر ﷺ لە باسی (یونس)- هود- یوسف دا سەلامی خوا لەهەموویان بێت، لە ڕاستی دا سورەتی ئیسراء ساڵێک پێش کۆچ کردن دابەزیوە و ڕووداوەکەش ڕوویداوە، بۆچی لە کۆتاییەکەوە دەستمان پێکرد، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئاڵۆزی باری دەروونی پێغەمبەری خوا ﷺ سێ بۆ چوار ساڵ پێش کۆچی موبارەکی، کە

دەڵێین ئاڵۆزی باری دەروونی محمد ﷺ پەیوەندی هەیە بە ترسی خوایی و وەحییەوە، هەر ئەو ئاڵۆزییە دەرونییەی پێغەمبەر ﷺ وای لێکرد بفەرموێت: (پیری کردم هود و براکانی)، داخۆ چی بێت ئەم ئاڵۆزییە؟!

لە کۆتایی ساڵانی پێش هیجرەت کەس موسوڵمان نەبووە لە ماوەی پێنج ساڵدا سێ بۆ چوار کەس موسوڵمان بووە، دوو کەسیان مردن دوو کەسیان مانەوە، ئەوانیش طوفەیلی دەوس-ی بوو کۆتاییەکەی (عەداس)ی مەسیحی بوو.

سورەتی (یونس) دابەزی سەرەتاکەی زۆر ئارام بوو، خوای موتەعال باسی هێز و دەسەڵاتی زاتی موبارەکی دەکات و دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۖ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾﴾ یونس

واتە: بە دڵنیایی پەروەردگاری ئێوە ئەو (الله) یەیە کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد لە شەش ڕۆژدا، پاشان بەرز بۆتەوە بۆ سەر عەرشی پیرۆزی خۆی، بەرزبوونەوەیەك کە شایەن و گونجاو و لایەقە بە گەورەیی خوای گەورە و لە بەرزبوونەوە هیچ لە دروستکراوەکان ناچێت، تەنها خوای گەورە خۆی کاروباری ئاسمانەکان و زەوی و بوونەوەر هەڵئەسووڕێنێ هیچ تکاکارێك نییە لای خوای گەورە ئیلا لە پاش ڕێگە پێدانی خوای گەورە نەبێت، ئەم (الله) یە پەروەردگاری ئێوەیە، ئێوە بەتاك و تەنها ئەو بپەرستن ئایا بۆ بیر ناکەنەوە﴿٣﴾

پاشان وردە وردە وشەی قورس و هەڕەشە ئامێز لە ئایەتەکاندا بەدی دەکرێت، ئایەتێک لە ناوەرۆکی ئایەتەکاندا دەردەکەوێت زۆر ترسناکە دەفەرموێت: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ ۖ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ قُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ۚ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾﴾ یونس

واتە: بۆ هەموو ئوممەتێك پێغەمبەری تایبەتی خۆیان هەبووە کە خوای گەورە بۆی ناردوون، کاتێك کە پێغەمبەرەکەیان دێت و ئامادە دەبێت لە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە بڕیار لە نێوان پێغەمبەرەکە و ئوممەتەکەی دەدات بە دادپەروەری، تا دەرکەوێت کێ وەڵامی پێغەمبەرانی داوەتەوە و کێ وەڵامی نەداوەتەوە، هەرچەندە ئەم ئوممەتە دوا ئوممەتە، بەڵام لەبەر گەورەیی و ڕێزی پێغەمبەرەکەمان ﷺ ئێمە پێش هەموو ئوممەتان دەکەوین و یەکەم

ئوممەت دەبین کە خوای گەورە بڕیار لە نێوانماندا دەدات، ئەوان (خەڵکی) زوڵم و ستەمیان لێ ناکرێت﴿١٧﴾

ئەم ئایەتە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-ی زۆر ترساند ڕاستە باسی گەلانی ڕابردووە، بەڵام لە هەمانکاتدا ئاماژەیە بۆ هیوا و گفتوگۆکانی قورەیش.

دوای ئەم باسە ڕاستەوخۆ دەڕوات بۆ باسی نغرۆبوونی گەلی (نوح) و دەفەرموێت: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَعَلْنَٰهُمْ خَلَٰٓئِفَ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾﴾ یونس

واتە: ئەوان (نوح) پێغەمبەر (عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ)-یان بەدرۆ زانی، ئێمەیش (نوح) و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیدا بوون هەموومان ڕزگار کردن لەناو کەشتیەکەدا ئەمانمان کرد بە جێنشینی خەڵکی و ئەوانی ترمان هەموو لەناوبرد، ئەو کافرانەی ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانی هەموومان لەناو ئاوەکەدا غەرق کرد، بزانە سەرەنجامی ئەو کەسانە چی بوو کە ئاگادار کرانەوە و شوێنی پێغەمبەری خوای گەورە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەکەوتن، ئەمە هەڕەشەیە لە کافرانی قورەیش کە ئەگەر ئێوەیش ئیمان نەهێنن سزاتان دەدەین و لەناوتان دەبەین﴿٧٣﴾

پاشان دەربارەی نغرۆبوونی فرعەون سەربازەکانی و گەلەکەی دەفەرموێت: ﴿۞ وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴿٩٠﴾﴾ یونس

واتە: بەنی ئیسرائیلمان لە دەریاکە پەڕاندەوە بۆ وشکانی، فیرعەون و سەربازەکانی شوێنیان کەوتن وەکو زوڵم و ستەم و دژایەتی کردن و دەستدرێژی کردنە سەریان تا فیرعەونیش چووە ناو ئاوەکە، کە پێشتر لە سوورەتی (بەقەرە)و سوورەتەکانی تر باسمان کرد، کە خوای گەورە دوانزە ڕێگای وشکانی بۆ (موسا)و موسڵمانان کردەوە و پەڕینە ئەوبەرەوە کاتێك کە فیرعەون و سەربازەکانی بەو ڕێگا وشکانیانە ڕۆیشتن خوای گەورە فەرمانی کرد ئاوەکە یەکیگرتەوەو هەموویانی لەناو ئاوەکە غەرق و نوقم کرد کە لە ڕۆژی عاشورادا بوو، لەو کاتەدا فیرعەون زانی تەواو غەرق ئەبێ وتی: ئیمانم هێنا بەو خوایەی کە بەنی ئیسرائیل ئیمانیان پێ هێنا، کە هیچ پەرستراوێك بەحەق نییە شایەنی پەرستن بێ تەنها ئەو خوایە نەبێ کە بەنی ئیسرائیل ئیمانیان پێی هێناوە و من تەسلیمی فەرمانی خوای گەورە بووم و منیش یەکێکم لە موسڵمانان﴿٩٠﴾

ئەو دوو ئایەتە زیاتر پێغەمبەر -صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ-ی خستە دڵە ڕاوکێ و باری دەروونی زیاتر تێک چوو، چونکە وای دەزانی لە کۆتایشدا یەکتاپەرستی دادی گەلی قورەیش نادات.

پاشان دابەزاندنی وەحییەکی زۆر توند کە گوتارەکە ڕاستەوخۆ بۆ خودی پێغەمبەر محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾﴾ یونس

واتە: ئەگەر خوای گەورە ویستی لێ بوایە (ویستی کەونی) ئەوا هەمووی خەڵکی سەر ڕووی زەوی ئیمانی ئەهێنا، بەڵام خوای گەورە خەڵکی تاقی ئەکاتەوە ئەی محمد ئایا تۆ ئەتەوێ بەزۆر خەڵکی موسڵمان بکەی ئەمە لە توانای تۆ نییە و ئیشی تۆ نییە﴿٩٩﴾

چونکە پێغەمبەری خوا چالاکی چڕ کردەوە، دەیویست بە زۆر خەڵکی بکات بە موسوڵمان تاکو لە ناو نەچن، ئەزموونی گەلی (نوح) و ئەزموونی گەلی فرعەون خرایە بەچاوی، دەترسا قوڕەیش لە ناو بچێت کە خوای گەورە فەرمووی بە زۆر خەڵکی ئیماندار ناکرێن. ئاماژە بوو بۆ لەناوچوون، لە هەمووی ترسناک تر کۆتایی ئایەتەکە زۆر هەڕەشە ئامێزە، بەڵام چەند ئایەتێک پێشکۆتایی دەفەرموێت: ﴿فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ قُلْ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ﴿١٠٢﴾﴾ یونس

واتە: ئایا ئەم کافرانەی سەردەمی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چاوەڕێی چ شتێکیانە تەنها وەك ئەو سزایانە نەبێ کە خوای گەورە سزای ئوممەتانی پێشتری داوە لە دونیادا، ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێیان بڵێ: چاوەڕێی بەڵێنی خوای گەورە بن منیش لەگەڵ ئێوە چاوەڕێ ئەکەم﴿١٠٢﴾

ئەو چاوەڕوانییە زیاتر دەروونی پێغەمبەری ئاڵۆز کرد، لەو ئایەتە زۆر سەخت تر کۆتاییەکەیەتی دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ﴿١٠٩﴾﴾ یونس

واتە: ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تۆ شوێنی ئەو وەحییە بکەوە کە خوای گەورە بۆی ناردوویت، ئارام بگرە تا خوای گەورە خۆی بڕیار ئەدات لە نێوان تۆ و کافراندا لە دونیا و قیامەت خوای گەورە باشترین و دادپەروەرترین حاکم و دادوەرە، والله أعلم﴿١٠٩﴾

کەواتە بڕیار و حوکمی خوای گەورە دێت، ئارام بگرە تا حوکمەکە بڕیار نەدا خوای موتەعال، جا حوکمی خوای گەورە ئیستئینافی نییە (تێهەڵچوونەوەی نییە)، چونکە خوای گەورە هەڵە ناکا داخۆ چی بێت، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بیری دەکردەوە چی بێت، لافاو بێت زەمینلەرزە بێت، یان طۆفان و باو بۆران، ئەمە بیر و بۆچونی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو لە گوتاری قورئانی، بە قۆناغێکی زۆر دژواردا تێدەپەری، قوڕەیش پێ دەکەنین و گاڵتەیان بە پێغەمبەر

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەکرد، کەس موسوڵمان نەدەبوو ژیانی زۆرێک لە پێغەمبەران دابەزی کە گەلەکانیان سەرپێچییان کرد هەموو لەناوچوون.

جا سورەتی (یونس) زۆر ئاسانتر بوو زمانی هەڕەشەکەی، یان بڵێین شێوەی گوتارەکەی لە چاو سورەتی دوای خۆی کەوا دابەزین، تەواوکەری سورەتی (یونس)-ە ئەویش سورەتی هود-ە، هەر ئەمەشە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: پیری کردم، زۆر خەفەتی لە سەر خواردووە و دەروونی ئەو نازدارەی ئاڵۆزکردووە.

لە سەرەتای سورەتەکەدا ڕێک باسی ئاڵۆزی دڵ و دەروونی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەکات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدۡرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٞۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٌ ١٢﴾ هود

واتە: لەوانەیە ئەی محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەندێك لەو شتەی کە بە وەحی بۆت دائەبەزێ وازی لێ بێنی لەبەر قسە و هەوا و ئارەزووی کافران یان دڵت پێی تەنگ بێ لە ترسی ئەواندا، نەوەکو گلەییت لێ بکەن و ئیمان نەهێنن کاتێك کە ئەوان بە تۆ ئەڵێن: ئەگەر تۆ پێغەمبەری خوای بۆچی کەنز و زێڕو زیوت لە ئاسمانەوە بۆ دانابەزێت یان بۆچی فریشتەیەك لەگەڵتدا نایەت ڕاستێتی تۆمان پێ بڵێ ئەی محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تۆ تەنها ترسێنەر و ئاگادارکەرەوەی، ئاگاداریان بکەوە و گوێ بە قسەی ئەوان مەدە، خوای گەورە ئاگای لە هەموو شتێك هەیەو کارەکانی خۆت تەنها بەخوای گەورە بسپێرە﴿١٢﴾

خوای موتەعال تایبەتمەندی مرۆڤ بوونی پێغەمبەر دەردەخات کە مرۆڤە، بەڵام پێغەمبەرە. ئەمە تایبەتمەندیەکەیتی، لە بەرانبەردا تایبەتمەندیەتی پێغەمبەر نوح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەخاتە بەرچاوی کە هاوشێوەی ژیانی پێغەمبەر و بانگەوازەکەیەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرٗا مِّثۡلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلِۭ بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ ٢٧﴾ هود

واتە: دەسەڵاتدارە کافر و بێباوەڕەکان لە قەومی نوح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) وتیان: ئەی (نوح) تۆش تەنها مرۆڤێکی وەکو ئێمەیت و نابینین هیچ جیاواز بیت لە ئێمە، نابینین هیچ کەسێك شوێن تۆ کەوتبێ لە دەسەڵاتداران و پیاوماقوڵان و گەورەکان تەنها فەقیر و هەژاران نەبێ، کە تەنها بۆچوونێکی سادەیان هەیە و یەکسەر شوێنت کەوتوون بە بێ بیرکردنەوە، نابینین ئێوە هیچ فەزڵێکتان بەسەر ئێمەوە هەبێ لە شتی دونیاییدا، بەڵکو گومان ئەبەین کە ئێوە درۆزن بن﴿٢٧﴾

گەلی نوح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) تەماشای (نوح)یان دەکرد کە مرۆڤێکی ئاساییە، ئەوانیش وەکو قورەیش چاوەڕێ بوون کە فریشتەیەک ببێتە پێغەمبەر، ئینجا کەوتنە هەڕەشەی کوشتن و دەربەدەرکردنی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴿٣٢﴾﴾ هود

واتە: وتیان: ئەی (نوح) تۆ زۆر دەمەقاڵێ و مشتومڕت لەگەڵ کردین و زۆریشت وت، ئەو هەڕەشانەی کە لە ئێمەی ئەکەی کە ئەگەر ئیمان نەهێنین خوا سزامان ئەدات با سزای خوای گەورە بێت ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی﴿٣٢﴾

پاشان قورەیش کەوتنە گاڵتە پێ کردنی پێغەمبەر، لە ژیانی نوح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دا هەمان کرداری چەپەڵی گەلەکەی ڕوویداوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُواْ مِنْهُ قَالَ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾﴾ هود

واتە: نوح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەستی کرد بە دروست کردنی کەشتییەکە، هەر کۆمەڵێك لە قەومەکەی بەلایدا تێئەپەڕین گاڵتەیان پێ ئەکرد و ئەیانووت: (نوح) تۆ پێشتر پێغەمبەر بووی ئێستا بووی بە دارتاش؟! یاخود ئەیانووت: لە وشکانیدا کەشتی دروست ئەکەی، ئایا کەشتی لە وشکانیدا ئەڕوات؟گاڵتەیان پێ ئەکرد (نوح)یش فەرمووی: ئەگەر ئەمڕۆ ئێوە گاڵتەمان پێ بکەن ئەوە ئێمەش سبەینێ و لە داهاتوو گاڵتە بە ئێوە ئەکەین کاتێك کە نوقم ئەبن لەناو ئاوەکەدا﴿٣٨﴾

پاشان نغرۆی ئاوی کردن خوای موتەعال و دەفەرموێت: ﴿قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ﴿٤٣﴾ وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴿٤٤﴾﴾ هود

واتە: وتی: ئەی باوکە ئەڕۆمە سەر یەکێك لەو شاخانە ئەمپارێزێ لە لافاوەکە و ئاوم پێ ناگات، نوح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) فەرمووی :ئەی کوڕی خۆم ئەمڕۆ هیچ پارێزەرێك نییە لە فەرمان و سزای خوا، ئەمە سزای خوای گەورەیە، مەگەر کەسێك خوای گەورە خۆی ڕەحمی پێ بکات، شەپۆلی دەریاکە بووە ڕێگر لە نێوان هەردووکیاندا و لێکی جیا کردنەوە، کوڕەکەی (نوح)یش یەکێك بوو لەوانەی کە لەناو ئاوەکەدا غەرق بوون﴿٤٣﴾ پاشان خوای گەورە کە کافران و بێباوەڕانی لەناوبرد فەرمانی کرد بە زەوییەکە، ئەی زەوی ئاوی خۆت قوت بدە، ئەی ئاسمان بەسە باران مەبارێنە و با ببڕێتەوە، ئاوەکە وردە وردە کەمی کرد تا سەر زەوی وشك بوو. فەرمانی خوای گەورە

جێبەجێ بوو کە کافرانی هەموو لەناو بردو دوای بڕین. کەشتییەکەش لەنگەری گرت لەسەر شاخی (جودی)، وترا: کەسانی زاڵم و کافر و بێباوەڕ هەر دووربن لە پاراستن و ڕەحمەتی خوای گەورە﴿٤٤﴾

پاشان وێنەکە زۆر تراژیدی تر دەبێت بۆ پێغەمبەر، حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) کوڕی نغرۆی ئاو دەبێت، بە شێوەیەکی زۆر ترسناک و خەمباری، باوکی هەرچی داوای لێ دەکات کە کوڕەکەی لەگەڵیاندا سەرکەوێت، بەڵام لە کۆتاییدا بەقسەی ناکات و نقومی ئاوەکە دەبێت. پێدەچێت لەو کاتەدا حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەو دوعایەی پەشیمان بێتەوە کە لە کاتی توشبوونی نائومێدی لەگەڵ گەلەکەی تووش بوو، وا کوڕەکەی خۆشی

گرتەوە، خوای گەورە لە باسی ڕووداوی ژیانی (نوح عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا﴿٢٦﴾﴾ نوح

واتە: دوای ئەوەی نوح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بێئومێد بوو، خوای گەورە وەحی بۆ نارد کە چیدی خەڵکی ئیمان ناهێنن هەر ئەو چەند کەسەیە کە ئیمانیان هێناوە، ئەمیش دوعای کرد و وتی: ئەی پەروەردگار لەسەر ڕووی زەویدا هیچ کافرێك مەهێڵە[51]﴿٢٦﴾

حەزرەتی (نوح عَلَيْهِ السَّلَامُ) دوعاکەی گیرا بوو و خوای گەورە بۆی هێنایە دی.

لەوکاتەدا پێغەمبەریش هەمان حاڵەتی حەزرەتی (نوح)ی هەیە مامی چەندە هاوکاری بوو پشت و سەنەدی بوو، حەزرەتی (نوح) زۆر خەفەتبار بوو بە کوڕەکەی، خوای گەورە ئەم باسەی بۆ کرد کە بزانێت کوڕەکەی (نوح عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە بەر چاوی باوکیدا نقوم بوو خنکا، پێغەمبەری خواش مامی مرد لەسەر جێگاکەی لە سەرەمەرگدا داوای لێدەکرد یەک وشەی یەکتاپەرستی و خواناسی بداتێ تا بێتە بەڵگەیەک بە دەستیەوە، بەڵام چارە نەبوو ئەبو طالیب وتی لەسەر دینی باووباپیرم، لە لایەکی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە لای وەستابوو لەلاکەی تری هەموو شەیتانی قوڕەیش لە ئەبو جەهل و وەلیدی کوڕی موغیرە و ...هتد لایدا وەستا بوون.

بە داخەوە ئەبو طالیب مرد شایەتومانی نەهێنا و دڵی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پڕ خەفەت و ئازار کرد مامی مرد، بەڵام یەشتا یەک عەشیرەت لە کوڕە مام و کەسی تری ماوە کە بانگیان بکات، لێرەدا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەترسێت دوعا بکات هەموو قوڕەیش لە ناو بچێت، بەڵام وەکو (نوح عَلَيْهِ السَّلَامُ) نەبوو، (نوح) ئازاری زۆرتر بوو کوڕەکە مرد و بە کافری خنکا، ئەبو

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

51- (دَیّاراً) واتە: ئەوانەی کە لەناو ماڵدا جێگیرن کەسیان مەهێڵە، یاخود (دَیّار) واتە: یەك کەس، تەنها کەسێکیان لێ مەهێڵە و هەر هەموویان لەناو بدە، خوای گەورە دوعاکەی قبوڵ کرد هەرچی لەسەر ڕووی زەوی بوو لە کافران هەمووی لەناو بردن تەنانەت خێزان و کوڕەکەی نوحیش کە موسڵمان نەبوون.

طالیب بە کافری مرد، بەڵام لە سەر جێگا. گەلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماوە، بەڵام گەلی (نوح عَلَيْهِ السَّلَامُ) هەموو لەناو چوون.

فشارێکی زۆر لەسەر پێغەمبەر ﷺ-ە وا خەدیجەی خۆشەویستی و هاوسەری وەفاتی کرد کە سەنەدی عاطیفی و ماددی بوو، مەبەستم ئابوورییە، پاشان وا مامیشی لای لێ چۆڵکرد و مرد کە سەنەدی هێز و ئەمن و ئاسایش بوو.

خوای گەورەش ئایەت لە سەر ئایەت بۆی دادەبەزێنێت لەسەر ژیانی پێغەمبەران لە عاد و ثەمود، کە چۆن لە ناو چوون کاتێک سەرپێچییان کردووە.

دیمەنی گەلی عاد!

﴿قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ وَمَا نَحۡنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ٥٣﴾ هود

واتە: وتیان: ئەی هود بەڕاستی تۆ هیچ بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرات بۆ ئێمە نەهێناوە لەسەر ئەوەی کە تۆ پێغەمبەری خوایت، لەبەر قسەی تۆ ئێمە واز لە خوایەکانی خۆمان ناهێنین، ئێمە ئیمان بە تۆ ناهێنین٥٣

پاشان خوای گەورە ئاماژە ئەداتە پێغەمبەر ﷺ کە چۆن ئیمانداران لەگەڵ هود ڕزگاریان بوو دەشێت تۆ و هاوەڵانت ڕزگارتان بێت لە ناو گەلی قورەیش لە ناو بچن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا هُودٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَنَجَّيۡنَٰهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ ٥٨﴾ هود

واتە: کاتێك کە فەرمان و سزای ئێمە هات هود و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیدا بوون هەموومان بەڕەحمەتی خۆمان ڕزگار کرد، ئەوانمان پاراست لە سزایەکی زۆر توند کە ئەو بایە بوو کە خۆیان و ماڵیانی هەمووی وێران کردو کەسیان نەما٥٨

پێغەمبەری خوا سیفاتی ڕەئوف و ڕەحیمی هەیە، وا پیری کردووە ئەم ئایەتە ,پاشان خوای گەورە واقیعی ڕەوشتی هۆزی عادی نیشانی پێغەمبەر ﷺ ئەدات کە چەندە سەرپێچی کار و سەرکەش بوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتِلۡكَ عَادٞۖ جَحَدُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٖ ٥٩ وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ عَادٗا كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّعَادٖ قَوۡمِ هُودٖ ٦٠﴾ هود

واتە: ئا ئەمە قەومی عاد بوون کە نکوڵیان لە ئایەتەکانی خوای گەورە کرد و ئیمانیان پێی نەهێنا، سەرپێچی سەرجەم پێغەمبەرانیان کرد، هەر چەندە ئەوان تەنها سەرپێچی هودیان کردبوو بەڵام هەر کەسێك باوەڕ بە پێغەمبەرێك نەکات ئەوا باوەڕی بە سەرجەم پێغەمبەران نەبووە، شوێن هەموو کەسێکی موتەکەبیر و عیناد کەوتن ئەوانەی کە سەرکەشی ئەکەن و مل نادەن بۆ حەق﴿٥٩﴾ خوای گەورە لە دونیا و قیامەت نەفرەتی لێ کردن و لە ڕەحمەتی خوا دوور ئەخرێنەوە، بزانن کە عاد کوفریان کرد بە پەروەردگاریان، دەی قەومی عاد کە قەومی هود پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بوون بەردەوام دووربن لە ڕەحمەتی خوای گەورە﴿٦٠﴾

پێغەمبەری خوا دانی بە خۆدا گرتووە لەگەڵ ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەدا هەر بانگەواز دەکات، بەڵام قوڕەیش زۆر ڕەقتر بوو لە جاران، زیاتر ئازاری پێغەمبەر و هاوەڵانیان ئەدا، پاشان دیمەنێکی تری لە ناو چوون هاتە ئاراوە، ئەزموونی گەلی ثەمود و پێغەمبەرەکەیان حەزرەتی صاڵح سەلامی خوا لە هەموویان بێت، دیمەنەکان نیشان ئەدات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾﴾ هود

واتە: بۆ لای قەومی ثەمود صاڵح پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-مان نارد کە لە خۆیان بوو، قەومی ثەمود لە دوای قەومی عاد بوون، پێی وتن: ئەی قەومی خۆم ئێوە بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن لەبەر ئەوەی جگە لە زاتی پیرۆزی الله هیچ پەرستراوێکی تری حەقتان نییە کە شایەنی پەرستن بێت، هەر ئەو خوایەیە کە ئێوەی لە زەوی دروست کردووە وای لێکردوون کە سەر زەوی ئاوەدان بکەنەوە، ئێوە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن لە تاوانەکانی پێشترتان، پاشان بۆ لای خوای گەورە بگەڕێنەوە و تەوبە بکەن و لە داهاتوودا تاوان مەکەن بە دڵنیایی پەروەردگارم وەڵامدانەوەی بۆ دوعا و پاڕانەوە زۆر نزیکە و وەڵامتان دەداتەوە﴿٦١﴾

پاشان کە گوێڕایەڵ نین سەرپێچی کارن، خوای گەورە سێ ڕۆژی بۆ دانان دەفەرموێت: ﴿فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُوا۟ فِى دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍۖ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴿٦٥﴾﴾ هود

واتە: ئەوان حوشترەکەیان سەربڕی کە خوای گەورە وەکو موعجیزە ناردبووی، صاڵح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) فەرمووی: تەنها سێ ڕۆژ لە شوێنی خۆتاندا بمێننەوە و بژین، لە دوای ئەو سێ ڕۆژە خوای گەورە سزاتان ئەدات و ئەمە بەڵێنێکەو درۆ نییە﴿٦٥﴾

دیسان سیگناڵ و ئاماژەیەکی تر بە دەرچوونی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و ئیمانداران لەم ڕووداوەی حەزرەتی صاڵح دا دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَٰلِحًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ

مِّنَّا وَمِنْ خِزْيِ يَوْمِئِذٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِيُّ ٱلْعَزِيزُ۝٦٦ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ۝٦٧﴾ هود

واتە: كاتێك كە سزای خوای گەورە هات صاڵح و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیدا بوون بە ڕەحمەتی خۆمان ڕزگارمان كردن لەسەرشۆڕی و سزای ئەو ڕۆژە، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر بەهێز و باڵادەست و بە عیززەتە۝٦٦ ئەوانەیشی كە ستەمیان كرد دەنگێكی گەورە لە ئاسمانەوە هات و دڵی بڕین و هەموویانی كوشت لەناو شوێن و ماڵی خۆیاندا نووسان بە زەویەكە لەسەر ئەژنۆ و دەم و چاویان و جووڵەیان نەما و هەموویان مردن۝٦٧

هەمان كۆتای گەلی عاد، دەفەرموێت: ﴿كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمْۗ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ۝٦٨﴾ هود

واتە: وەكو ئەوەی كە هەر نیشتەجێ نەبووبێتن لەو شوێنانەدا و ئاوەدانیان نەكردبێتەوە، بزانن كە قەومی ثەمود كوفریان كرد بە پەروەردگاریان، دەی قەومی ثەمود هەر دووربن لە ڕەحمەتی خوای گەورە۝٦٨

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەوە دەترسا لە پڕ فەرمان بێت و شاری مەككە وێران بێت، دانی بەخۆدا گرت و قوڕەیش زیاتر فشاری بۆ پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هێنا، سەرەڕای ئەوە ڕازی نەبوو دوعایان لێ بكات، بەڵكو بە ڕەحم و بە بەزەیی بوو، دیمەنی چوارەم دوای (نوح)، هود، صاڵح ، ئینجا حەزرەتی شوعەیب سەلامی خوایان لێ بێت، خوای گەورە باسی دیمەنەكانی ژیانی ئەو پێغەمبەرە دەكات بۆ پێغەمبەر كە ئەویش هەمان كاری پێغەمبەرانی تری ئەنجام داوە كە هۆزەكەی بانگەواز كردووە، بەڵام بە دەمیەوە نەهاتوون و خوای گەورە لە ناوی بردوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ وَلَا تَنقُصُواْ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَۖ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ۝٨٤﴾ هود

واتە: بۆ لای قەومی مەدیەن كە لە نێوان حیجاز و شام نیشتەجێ بوون، شوعەیب پێغەمبەرمان نارد كە ئەمیش لە خۆیان بووە ئەمیش وتی: *ئەی قەومی خۆم بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بكەن و خوا بپەرستن و شەریك بۆ خوا دامەنێن لەبەر ئەوەی جگە لە* زاتی پیرۆزی (الله) هیچ پەرستراوێكی تری حەقتان نییە شایەنی پەرستن بێت پێوانە و كێشانەتان كەم مەكەن بەجوانی و تەواوی بەخەڵكی بدەن، من ئەبینم كە ئێوە خوای گەورە ڕزق و ڕۆزییەكی فراوان و زۆری پێ بەخشیون من لەوە ئەترسێم ئەگەر ئێوە لەسەر ئەم كارانە

بەردەوام بن، خوای گەورە سزایەکتان بدات لە ڕۆژێکدا کە سزای خوای گەورە دەورتان بدات و شوێنی ڕاکردن و پەناتان نەبێ بۆی ڕا بکەن﴿٨٩﴾

پاشان هەمان چارەنووسی گەلانی ڕابردوو، ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآۗ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾﴾ هود

واتە: کاتێك کە سزای ئێمە دابەزی بۆیان شوعەیب پێغەمبەر و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵیدا بوون ڕزگارمان کردن بە ڕەحمەتی خۆمان، بەڵام ستەمکاران ئەوانەی کە کوفریان ئەکرد صەیحە و دەنگێك هات و ڕوحی لە لاشەیان دەرکرد لەنا و شوێن وماڵی خۆیاندا نووسان بە زەویەکە لەسەر ئەژنۆ و دەم و چاویان و جووڵەیان نەماو هەموویان مردن﴿٩٤﴾ وەك ئەوەی کە پێشتر لەو شوێنە هەر نەژیابێتن دەی قەومی مەدیەنیش دوور کەونەوە لە ڕەحمەتی خوا و تیاچن هەروەکو چۆن قەویم ثەمودیش دوور کەوتنەوە لە ڕەحمەتی خوا و تیاچوون﴿٩٥﴾

ئەمانە هەموو ئەزموونە بۆ محمد ﷺ لە سورەتی هوددا، یەک لە دوای یەک لە باسی پێغەمبەران و گەلەکانیان کراوە کە چۆن لە ناو چوون، هەموو حیوار و گفتوکۆکان لە ناو قورەیشدا دووبارە بۆتەوە، گاڵتە و بەدرۆ خستنەوەو ئازار و ئەشکەنجە و هەمووی هەر هەمان ئەزموونە.

ئەو پشکۆیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی هەڵیگرتووە کە ماندوو دەبێت دەیخاتە سەر سنگی موبارەکی، پاشان دەیخاتەوە سەر دەستی، لەوە گومانی نەبوو کە دەشێت ڕوو بدات. دەترسا بۆ ئەوەی ئەوە ڕووئەدات ئەم گەلانە هەروا بە ئاسانی لە قورئاندا باس نەکراون، خوای گەورە لە لوط، (نوح)، هود،صالح و شوعەیب، یەکێک بە شەو لەناو چوون (فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ)، گەلێکی لە بە بەیانی دا (مَوْعِدَهُمُ الصُبْحُ)، یان (أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ) ئەم ئایەتانە هەموو وەکو نەیزەک وابوون کە دادەبەزی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ. پێغەمبەری خوا ﷺ پیر بوو لە ترسان تووشی دڵەڕاوکێ بوو لە ترسی ئەوەی ئازار تووشی شاری مەککە نەبێت، چونکە وا دە بۆ شانزە ساڵە بانگەواز دەکات، ئەنجامێکی وا باشی نەبووە هەموو موسوڵمانان ناگەنە (٢٠٠) کەس، دیمەنی کۆتایی و نەیزەکەکانی سورەتی هود، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾﴾ هود

واتە: ئەمە هەواڵی شار و دێیەکانە ئەی محمد ﷺ کە بۆ تۆی ئەگێڕینەوە، کە هێشتا لەو شار و دێیانە هەیە ماوە، هەیشیانە وێران بووە و ڕووخاوە﴿١٠٠﴾

﴿وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾ هود

واتە: ئێمە ستەممان لێ نەکردوون، بەڵام ئەوان خۆیان زوڵم و ستەمیان لە نەفسی خۆیان کرد بە کوفرو تاوان ئەو خوایانەی کە لێیان ئەپاڕانەوە و هاواریان پێیان ئەکرد و ئەیانپەرستن لە غەیری خوای گەورە هیچ سوودێکیان پێ نەگەیاندن کاتێك کە سزای خوای گەورە هات هیچ شتێکیان بۆ زیاد نەکردن تەنها بەهیلاك چوون و زەرەرمەندی نەبێت﴿١٠١﴾ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای گەورە مۆڵەت بە ستەمکار دەدات، بەڵام کە بیباتەوە و سزای بدات ڕزگاری نابێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: بردنەوەی خوای گەورە بەم شێوازەیە کاتێك کە دێیەك بباتەوە یان سزایان بدات کە ستەمکار و هاوبەشبڕیاردەر بن، بەڕاستی بردنەوەی خوای گەورە زۆر بەئێش و ئازار و سەختە﴿١٠٢﴾

﴿وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾﴾ هود

واتە: ئەو ڕۆژە دوا ناخەین مەگەر بۆ کاتی دیاریکراوی خۆی﴿١٠٤﴾

﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾﴾ هود

واتە: پەروەردگارت هیچ شارو دێیەك لەناو نادات و زوڵم و ستەمیان لێ ناکات لە کاتێك کە خەڵکەکەی چاکەکار بن و ئیصلاح و چاکسازی بکەن﴿١١٧﴾

ئینجا هەلی کۆتایی دەبەخشێت بە خەڵکی مەککە خوای گەورە دەفەرموێت: خۆ ئەگەر چاک نەبوو ئەوە لە چاوەڕوانیدا بن پێش کۆتای دەفەرموێت: ﴿وَٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾ هود

واتە: ئێوە چاوەڕێ بن ئێمەش چاوەڕێی سەرەنجامی کارەکەی ئێوەین، بزانین خوای گەورە کەی سزاتان ئەدات و سزای خوای گەورە چۆن ئەبێت﴿١٢٢﴾

پێغەمبەری خوا ﷺ بیری دەکردەوە داخۆ چی بێت لەم چاوەڕوانیەدا تۆفان و باو بۆران یان زەمین لەرزە، یان باراندنی بەرد بەسەریاندا یاخود کە فەرمانیان پێ بکات دەربچن لەو شارە؟!

هەڵسا شاری مەککەی جێهێشت بەرە و طائیف کەوتەڕێ، بەو هیوایەی خەڵکی طائیف هاوکار و پشت و پەناو داڵدەی بدەن، کەچی قورەیش چی کردبوو بە پێغەمبەر ﷺ لە ماوەی یانزە بۆ دوانزە ساڵدا خەڵکی طائیف لە سێ شەو و ڕۆژدا بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ و زەیدی کوڕی حارسی کرد، بەرد بارانیان کرد لە لایەن خەڵکی خراپەکار و منداڵ و کۆیلەکانیانەوە، قاچی موبارەکی خوێنی پێدا دەهاتە خوار، ڕای کرد لە شارەکەدا بۆ ئەوەی بە بەرد نەیکوژن!.

لەو هەموو ئازار و ناڕەحەتیەدا فریشتە هاتە لای کە هاوکاری بکات، کاتی لە ناوبردنی مەککە و طائیفە، فریشتەکە وتی: ئەو دوو شارە دەخەینە نێوانی دوو شاخ و لە ناوی دەبەین، پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی بە هێرۆشیما و ناکانزاکی نییە، بەڵکو دوعای هیدایەتی بۆ کردن و خۆشەویستی دەربڕی، پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕاوە شاری مەککە بە دڵی پڕ ئازار و ناڕەحەتییەوە، بەڵام خوای گەورە گەورەترین دیاری پێشکەش کرد لەسەر ئەو ئارامگرتن هێز و توانا و پڕ ڕەوشتییە.

داخۆ چی بێت ئەو دیارییە؟!

سورەتی یوسف بێجگە سێ ئایەتی یەکەمی لە شاری مەدینە دابەزیوە، لە ئایەتی چواری سورەتی یوسف تا کۆتای بە یەکەمجار و لە شاری مەککە دابەزیوە.

لە سەرەتای ئایەتەکە دا خەونێکی جوانی منداڵی دێتە خوارەوە بۆ سەر دڵی پێغەمبەر، کە خەونێکی زۆر شەفافە، بەو خەونە شەفاف و ڕوون ئاشکرایە دەست پێ دەکات و بە تراژیدیا و خەمە ناسۆرێکی زۆر تا دەگاتە ئاستی تەماعێکی زۆر گەورە لە دەسەڵات و کۆکردنەوەی گشتی خێزانەکە.

بە دیمەنێکی زۆر نایابی باوک و کوڕێک خۆشەویستی یەکی زۆر شیرین و ڕۆڵە و باوکانە، بەڵام ئەوانە کە پشتی دەشکێت و فێڵ و کاری خراپی لەگەڵ دەکەن، ئەوانەی کە زۆر نزیکی پشتی یوسف دەیخەنە ناو بیری ئاو، هەر ئەوانیش بە پارەیەکی کەم دەیفرۆشن، پاشان دەبێتە خزمەتکار و کۆیلە و تووشی وروژاندنی جەستەیی ئافرەت دەبێت و دەخرێتە زیندان بە زوڵم و زۆرداری، بەم شێوەیە بە یوسف گەورە دەبێت، بەڵام خەونەکەی منداڵی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە و بۆ هەرکوێ دەڕوات لە قوڵایی ناخیدا پاراستویەتی.

لەگەڵ ئەو هەموو کارەساتەدا تەنها بووە لە بیرەکەدا هەر خۆی بوو، منداڵ بوو پاشان نامۆ غەریب بوو کە بردیان بۆ سجن، لەگەڵ ئەو تەنهایی و ناڕەحەتیانەیدا لە ناخی خۆیدا خەونەکەی نەکوشت بەڵکو هیوا و ئومێدێک بوو لەگەڵیدا دەهات و دەچوو، وەکو تەمەنی لەگەڵیدا گەورە دەبوو. کاری کرد و هەوڵیدا تا کۆتای پاشان لە کۆتایی سورەتەکە حەزرەتی

یوسف سەر لە نوێ تەفسیری خەونەکەی بۆ باوکی دەکات کە چۆتە ڕاقی ترین پلە و پایەی دەوڵەت، لە زیندانەوە ڕاستەوخۆ بۆ سەرۆک وەزیران، لە گەورەترین دەوڵەت لەو سەردەمەدا و خەڵکی ئەو جێگایەش نییە!

## یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ) سەر لە نوێ هیوا و ئومێد بوو بۆ محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئاوێنەی ئەم وتارە قورئانیە بوو، ڕاستەوخۆ دوای دابەزینی سورەتی هود بوو، بانگەوازی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زۆر لاواز بوو، خەڵکی نەدەهاتن بۆ ناو ئایینی ئیسلام. جەنابی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چاوەڕوانی زۆر کارەساتی دەکرد لە سەر ئەو ئایەتەی پێش کۆتای سورەتی هود، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ١٢٢﴾ هود

واتە: ئێوە چاوەڕێ بن ئێمەش چاوەڕێی سەرەنجامی کارەکەی ئێوەین، بزانین خوای گەورە کەی سزاتان ئەدات و سزای خوای گەورە چۆن ئەبێت(١٢٢)

بەڵام چاوەڕوانییەکە ئەو چاوەڕوانییە نەبوو کە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پیری کرد تووشی دڵە ڕاوکێی کرد، بەڵکو بە سورەتی یوسف، بە باسی ژیانی ئەم پێغەمبەرە نازدارە، گۆڕانکاری تەواو ڕوویدا لە ڕەوشەکە و پاشان پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە تەواوەتی ئاوێتەی ئەم گوتارە قورئانییە بوو.

چۆن ئاوێتە بوو؟!

باری دەروونی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە دوای دە ساڵ زۆر سەخت بوو، خێزانی بەڕێزی وەفاتی کرد، مامی بەڕێزی بە هەمان شێوە، ئەو مامەی کە زۆر ڕێزی لێدەگرت و خۆشی دەویست ناسۆر و ئازاری زۆر بوو بۆ پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە بە کافری مرد.

قورەیش فشاری زۆری هێنابوو بۆ پێغەمبەر چ لە ڕووی دەروونی یان لە ڕووی ئازاری لاشەوە، ماوەی مەککە موسوڵمانان لە (١٥٠) کەسدا بوو نە دەگەیشتە (٢٠٠) کەس بەوانەی دەوروبەری شاری مەککە، کە ئەم ژمارە لە ڕاستیدا دڵخۆشکەر نییە بۆ ئەو ماوە زۆرە.

پاشان خەم و ئازار و دڵە ڕاوکێ سورەتی یوسف و هود کە هەموو باسی لە ناوبردنی گەلانی ڕابردوو بوو لە هەڕەشەی خوای پەروەردگار دەترسا، دەیفەرموو چاوەڕێ بن، ﴿وَٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ١٢٢﴾ هود

واتە: ئێوە چاوەڕێ بن ئێمەش چاوەڕێی سەرەنجامی کارەکەی ئێوەین بزانین خوای گەورە کەی سزاتان ئەدات و سزای خوای گەورە چۆن ئەبێت﴿١٢٢﴾

هەموو ئەمانە و لە پڕ سورەتی یوسف دابەزی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوشەکەی بۆ گۆڕا بەم گوتارە قورئانییە.

گۆڕانکارییەکان گۆڕا بە چەند خاسێت و بڕگەیەکی تر کە بریتی بوو لە:

یەکەم: گۆڕانکاری لە ڕەوشەکەدا لە سزای لەپڕ لە سورەتی هودەوە بۆ ئەگەری سەرکەوتن، لەوەش گرنگتر سەرکەوتنی چاوەڕانەکراو هەموو ڕووداوی ژیانی پێغەمبەران مەرج نییە کۆتاییەکەی سزا و عەزاب و ناڕەحەتی بێت، بەڵکو پێدەچێت سەرکەوتن تەمکین و هێز و توانا و فەرمانڕەوایی بێت لەسەر زەویدا.

دووەم: لە سەرەتاوە یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ) تەنها بوو، تەنها خۆی و ئیمانەکەی بوو نە برای لەگەڵ بوو نە باوک، نە مام، نە ئامۆزا، نە پورزا...هتد، بەڵکو لە بیرێکەوە دەستی پێ کرد هیچ سەنەدێکی عەشایەریشی نەبوو، خاوەنی هیچ مەقام و ڕێزێک نەبوو لە ناو کۆمەڵگەدا، بگرە بە پارەیەکی زۆر کەم فرۆشرا. پاشان بووە خزمەتکار ئینجا بۆ زیندان، بەڵام ئەمانە هیچی ڕێگر نەبوو بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەی و گەیشتن بەو مەبەستە.

لێرەدا خاڵێکی زۆر گرنگە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ئاوێتەی بووە، چونکە پێویست ناکات ئەوەندە خەفەت بخوات بۆ مامی و خێزانی خەدیجە کە دوو سەنەد و پشت و پەنای پێغەمبەر ﷺ بوون، یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ) هیچیانی نەبوو سەرکەوت لە ئامانجەکەیدا.

سێیەم: پاشان ژیانی حەزرەتی یوسف بیرۆکەی نوێی دایە پێغەمبەر، دەشێت لە شاری مەککە ئاستی سەرکەوتن زۆر لاواز و کەم بێت، بەڵام دەشێت لە جێگایەکی تر ئاستی سەرکەوتن زۆر زۆر بە هێز بێت، یوسف نەیتوانی خەونەکەی بهێنێتە دی تەنها لە میسردا نەبێت، خۆ ئەگەر لە ناو گەلە کۆچەرییە دەشتەکییەکەیدا بوایە پێ نەدەچوو ئامانج و خەونەکەی بهێنێتە دی، کەواتە ڕێژەی سەرکەوتن لە میسر زیاتر بوو تا ناوچەی خۆیان.

هەر ئەمەش وای کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوکراوەتر بێت، تەنها شاری مەککە مەرج نییە گۆڕەپانی بانگەوازەکەی بێت، جێگای تر زۆرە و پاشان نیسبە سەرکەوتن زۆرترە لە جێگای تردا.

چوارەم: خاکی ئاژەڵداری و ڕاوکردن بە کەڵکی دامەزراندنی هێز و دەسەڵاتی نایەت، سورەتی یوسف ئاماژە بوو بۆ پێغەمبەر خاکێکی کشتوکاڵی بدۆزێتەوە، بۆ ئامۆژگارییەکەی یوسف کە بۆ پادشای کرد کە لە کاتی وشکە ساڵی و ساڵانی گرانیدا خەمباری بکات.

پێنجەم: ژیانی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئارامی دڵی دایەوە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە پێشتر لە سورەتی هوددا پیری کرد، دیمەنەکانی پڕ بوو لە کارەساتی مردنی کوڕ لەبەر چاوی باوکیدا و دووجار جارێک بە خنکان و جارێکی تر بە کافری مرد، بەڵام یوسف و باوکی بەیەک دەگەنەوە، سەرەتایەکی خەماوی و کۆتاییەکی پڕ ئارامی و دڵخۆشی، کەواتە هەموو منداڵێک کافر نابێ، عاقیبەتەکان هەموو وەک یەک نین.

تەنانەت براکانی کە تاوانباری سەرەکی بوون هاتن و داوای لێبوردنیان کرد و داوای ئەوەیان کرد، پەشیمان بوون لەو کارەی کردیان.

هەموو ئەمانە نوێ بوون بۆ پێغەمبەر محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەموو ئەوەی ڕوویدا لە ژیانی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-دا بە سەر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دا هاتەوە، کۆتاییەکەی ئازادکردنی خەڵکی شاری مەککە بوو.

ئەگەر بە چاوێکی خێرا تەماشای ڕووداوەکان بکەین هەمان دەرئەنجامی ژیانی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-ە لە ژیانی پێغەمبەر محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دا.

یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ) براکانی خستیانە بیر و فرۆشتیان، قوڕەیش هیچی کەمتر نەبوو لە براکانی یوسف، خۆ هەموو قوڕەیش یەک بەرەباب بوون. یوسف خسترایە بیر و لەوێ سەرەتا زۆر سەخت بوو، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هیجرەتی سەخت بوو، پاشان جولەکەی بەنو قەینوقاع و بەنو نەزیر و بەنو قوڕەیزە و دوای ئەوانیش مونافیقەکان، شەهیدکردنی حەمزەی مامی و هەمووی ناسۆر بوو، بێجگە جەنگی ئوحود و خەندەق و عەراب و هۆزەکانی دەوروبەری، لە دوای ئەوەش کە سەرکەوت وڵاتی ئاوەدان کردەوە، فەتحی شاری مەککەی کرد وەکو چۆن یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە براکانی خۆش بوو، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ -یش لە خەڵکی شاری مەککە و طائیف و هۆزی هەوازی خۆش بوو، بەڵکو هەموو دیل و منداڵ و ئافرەتەکانی بە دیاری بۆ گەڕاندەوە.

## باوکی پێغەمبەران و محمد پێغەمبەر کوڕی

ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم لە ناو ژیانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دا زۆر گرنگی پێدراوە، ئەگەرچی لە تەورات و ئینجیل دا ناوی حەزرەتی ئیبراهیم هاتووە، بەڵام بە دڵنیاییەوە لای نەسارا تەنها پیاوێکە و بە باوکی پێغەمبەران هەژمار دەکرێت، لای یەهود وەک پەراوێزێک بۆ باوکی یەعقوب کە ئیسرائیل باس کراوە، گرنگی باسکردنی تەنها بۆ گەیشتنە بە حەزرەتی یەعقوب، بەڵام لەئیسلامدا باسەکان جۆرێکی ترە. گرنگی و میحوەری حەزرەتی ئیبراهیم لە چەند ڕەهەندێکەوەیە.

ڕەهەندی یەکەم: لە ئێستادا هەموو عەرەب نەسەبی خۆی دەگەڕێنێتەوە سەر حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم، بێگومان لە ڕێگای نەسەبی ئیسماعیلەوە، چونکە عەرەب دەڵێت هەر کەسێک خاوەنی نەسەب نەبێت لە عەرەب نییە، چونکە عەرەب نەسەبی زۆر لا گرنگە، هەر لەبەر ئەوەیە قورئان گوتاری قورئانی لەسەر حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دابەزاندووە چ لە ڕووی بیرباوەڕ یان لە ڕووی نەفسی خودی مرۆڤ یان لە ڕووی گەردوونەوە کە لە داهاتوودا بە درێژی باسی دەکەین...بە پشتیوانی خوا.

ڕەهەندی دووەم: حەزرەتی ئیبراهیم لای هەموو ئایینەکان ئەگەرچی نەسارا بە پێغەمبەری نازانێت، بەڵام خاوەنی ڕێز و مەکانەتی تایبەتە بە هەمان شێوە لە ناو عەرەب و حەبەشەدا واتا خەڵکی، جێگای تایبەتی خۆی هەیە و زۆر خۆشەویستە، لە ناو عەرەبدا زۆر خۆشەویستە خاوەنی ڕێزێکی پێ پایانە، بەو پێیەی بنیادنەری کەعبەیە، قوڕەیش زۆر لایان گەورەبوو ئەگەرچی بت پەرست بوون، بەڵام پاشایەکی زۆر لە ژیان و بیروباوەڕی جاهیلی عەرەب داگیر کردبوو حەزرەتی ئیبراهیم.

بە گشتی حەزرەتی ئیبراهیم لە ناو عەرەب، ڕۆم، نەسارا، یەهود، حەبەشە و عێراق وەکو وڵاتی نێوان دوو ڕووبارەکە، هەموو ئەمانە ئیبراهیم بە باوکی ڕۆحی و ڕاستی هەموو ئایینە ئاسمانییەکان دەزانن.

ڕەهەندی سێیەم: ئەگەر وێنا و جێگا و مەکانەتی ئیسلام و گوتاری قورئانی بەخشیوەتە حەزرەتی ئیبراهیم، نە لە تەورات نە لە ئینجیل نە لە ئایینەکانی تردا هیچ وجودێکی نییە، ئیسلام بێجگە ئەوەی باوکی پێغەمبەرانە ناوی بردووە زۆر ئیمتیازی تری حەزرەتی ئیبراهیمی باس کردووە.

١. بە تەنها ئوممەتێک بووە: ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾﴾

واتە: بە دڵنیایی ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ بەتەنها خۆی ئوممەتێك بووە، واتە: پێشەواو مامۆستای خێرو چاکە بووە گوێڕایەڵ و ملکەچ بووە بۆ خوای گەورەلە دینە پووچەڵەکان لایداوە بۆ دینی حەق لەو کەسانە نەبووە کە هاوبەشیان بۆ خوای گەورە بڕیار داوە

٢. خاوەن زانست و ڕوشد و حیکمەت بووە کە بە واتای ئەقڵانی و کەسێکی زۆر بە هێز لە بیرکردنەوە ناوبراوە، ﴿۞وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ﴿٥١﴾﴾ الأنبياء

واتە: بە دڵنیایی هەر لە پێشتردا ڕێگای ڕوشدو ڕاستمان بە ئیبراهیم پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بەخشی، ئێمە ئەمانزانی کە شایەنی ئەوەیە کە ڕێگای هیدایەت و ڕاستی پێ نیشان بدەین و بیکەین بە پێغەمبەر﴿٥١﴾

٣. خاوەنی سونەتی تایبەتە بۆ لاسایی کردنەوە، ئەوانەی کە هاتوون لە گەڵیدا کە مەبەست پێغەمبەرانی لە نەوەی ئیبراهیم: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ﴾ الممتحنة

واتە: بە دڵنیایی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون مامۆستایەتی و پێشەوایەتیەکی باش بۆ ئێوە هەبوو، واتە: ئیبراهیم و شوێنکەوتوانی ئەوانەی لەگەڵیدا بوون مامۆستا و پێشەوا و پێشەنگی چاکن بۆ ئێوە، ئێوەش شوێن ئەوان بکەون و بەرائەت لە کافران بکەن.

٤. حەزرەتی ئیبراهیم ئیمامی هەموو خەڵکی بووە،: ﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَـٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة

واتە: پەروەردگار ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ)-ی تاقیکردەوە بە چەند وشەیەك کە وتی (إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا) ئەویش تەواوی کرد و داوای زیاتری کرد کە ئەو ئیمامەتە با لە نەوەکانیشمان بێت، یاخود تاقیکردەوە و ئارامی گرت لەسەر هیجرەت کردن و سووتاندن و سەربڕینی ئیسماعیلی کوڕی، خوای گەورە فەرمووی: ئەتکەمە ئیمام و پێشەوا، بۆ خەڵکی، وتی: ئەی پەروەردگار نەوەکانیشم بکە بە پێشەوا، خوای گەورە زانی لە نەوەکانی ئەویشدا کەسانێك ئەبن کە ناگونجێن بۆ ئیمامەت و پێشەوایەتی بۆیە فەرمووی: ئەوەی کە ستەم بکات ئەوە ئەو عەهدو بەڵێن و ئیمامەتییەی منی دەست ناکەوێت﴿١٢٤﴾

٥. هەر کەس لە میللەت ئایینی ئیبراهیمی نەبێت کەواتە لە خراپەکارانەوە و لە خەڵکی بودەڵەو نالەبارە: ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَـٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾﴾ البقرة

واتە: کێ هەیە لە دینی ئیبراهیم کە دینی تەوحیدە لابدات و نەیەوێ و ڕەتی بکاتەوە ئیلا مەگەر کەسێك گێل و نەفام و کەم عەقڵ بێت و ستەم لە خۆی بکات، ئێمە ئیبراهیممان هەڵبژاردووە لە دونیادا، ئەو لە ڕۆژی قیامەتیشدا یەکێکە لە پیاوچاکان﴿١٣٠﴾

٦. حەزرەتی ئیبراهیم خاوەنی دینی حەنەفی بووە، بە واتایەکی تر ئەگەر شوێن ئایینی ئیسلامی حەنەفی نەکەوێت کەواتە تۆ موسوڵمان نیت، ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَـٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِى

سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ﴿١٩٥﴾ آل عمران

واتە: پەروەردگاریش وەڵامی دوعاکەی دانەوەکە من کردەوەی هیچ کەسێك لە ئێوە نافەوتێنم، ئەوەی کردەوەی چاکی کردبێت پاداشتی ئەدەمەوە ئیتر ئەگەر نێر بێ یان مێ جیاوازی نییە، ئافرەتیش وەکو پیاو وایە لە گوێڕایەڵی و کردەوەی چاك و پاداشتدا، ئەو کەسانەی کە کۆچیان کردبێ چ پیاو بن یان ئافرەت لە ماڵ و حاڵی خۆیان دەرکرابێتن لە پێناو خوای گەورەدا ئازار درابێتن لە لایەن موشریکانەوە کوشتاری دوژمنانی خوای گەورەیان کردبێ و لە پێناو خوای گەورەدا کوژرابێتن، ئەوە هەرچی خراپەیان کردبێ هەر هەموویان بۆ ئەسڕمەوە لەبەر ئەوەی هیجرەت کردن و جیهاد کردن و شەهید بوون لە پێناو خوای گەورە هەموو تاوانی مرۆڤ ئەسڕێتەوە تەنها قەرزاری نەبێت، ئەیانخەمە ناو بەهەشتانێك کە باخ و دارەکانی جۆگەلە ئاوی بەژێردا ئەڕوات، ئەمە پاداشتێکە لەلایەن خوای گەورە بۆ ئەو کەسانە، باشترین پاداشت لەلای خوای گەورەیە﴿١٩٥﴾

ئەم شەش ئیمتیازە لە هیچ ئایینێکی تردا باس نەکراوە، بێجگە گوتاری قورئانی بۆ حەزرەتی ئیبراهیم.

لە باسەکانی ڕابردوودا باسی ئەوەمان کرد کە عەرەب توانای بیرکردنەوە و گومان دروستکردنی نەبوو، وتمان گومان دووجارە، خودی دروست بوونی گومان لە ناوەخندا شتکی زۆر باشە، چونکە ئەتگەیەنێتە حەقیقەت، جا گومانەکە لە هەرچی پرسێک بێت، جیاوازی خەڵکی وریا و ئاقڵ ئەوەیە کە گومانی بۆ دروست دەبێت، خەونی دەزرێت و بە دوای وەڵامی گومان دەگەڕێت. عەرەب بە گشتی نەیدەزانی گومان چییە لە بووندا، ئەشێت لەت و کاری ڕۆژانەیاندا گەیشتبن بەم حاڵەتە، بەڵام لە ڕووی گەردوون و ژیان و مرۆڤ و خوا و پرسە و ئاسان بوو، نە توانای بیرکردنەوەیان هەبوو نە تاقەت کاتیان بۆ بیرکردنەوە تەرخان کردووە، زۆر کەم بوون ئەوانەی کاتیان بۆ شیکردنەوە تەرخان کردووە لە ناو عەرەبدا، پێنچن لە پەنجەی دەست تێپەڕ بکەن، بەڵکو مەی هەمیشە قوماریکردبوون یان سەرقاڵی ژیان لەو ناوچە سەختە بیابانە وشکەدا ماندووی کرد بوون، عەرەب زۆر جاهیل بوون تەنانەت (ژمارە)یان تا هەزار بوو لەوە زیاتر توانای ژماردنیان نەبوو.

لە شاری مەککە ڕووداوی ژیانی ئیبراهیم دابەزی، سورەتێک بە ناوی باوکی پێغەمبەران ئیبراهیم بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزی، جیاوازتر لە شێوازی هود، (یونس) و ئەعراف، ئەمانە زیاتر باسی گەلانی ڕابردووە کە بەدەم پێغەمبەرەکەیانەوە ئەچوون لەناو چوون، بەڵام لە سورەتی ئیبراهیم دا جیاوازتر باسی دوو پێغەمبەر دەکات یەک: خودی ئیبراهیمە، دووەم:

حەزرەتی (موسا)یە، لێرەدا نیشانی ئەدات تەرکی پێغەمبەران چی بووە، خوای پەروەردگار زیاتر بیروباوەڕی تێدا تۆخ کردۆتەوە، هەرچەندە سورەتە مەککیەکان هەموو باسی بیروباوەڕە.

لێرەدا خوای گەورە خاکی مەککە بە خاکی ئیبراهیم و ئیسماعیل دەناسێنێت کە ئەو دوو پێغەمبەرە بنیایان کردووە، هەموو عەرەب نەهاتن دژایەتی ئەم ئایەتە بکەن، بەڵکو هەموو عەرەبی بە گشتی خستە بیرکردنەوە، بە زۆر دەیانویست ئەم ڕاستییە لە بیر خۆیان بەرنەوە.

خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَٰذَا الْبَلَدَ آمِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الْأَصْنَامَ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي ۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴿٣٦﴾ رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ رَبَّنَا إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ ۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى اللَّهِ مِن شَيْءٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ﴿٣٨﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَرِ إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ ۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ الدُّعَاءِ﴿٣٩﴾ رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي ۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ﴿٤١﴾﴾ ابراهيم

واتە: ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دوعای کرد ئەی پەروەردگار ئەم شارە کە مەککەیە بیکە بە شارێکی ئەمین و هێمن و ئارام، خۆم و نەوەکانم بپارێزە لەوەی کە بت بپەرستین﴿٣٥﴾ ئەی پەروەردگار ئەم بتانە بوونەتە هۆی گومراکردنی زۆرێك لە خەڵکی، جا هەر کەسێك شوێن من بکەوێ ئەوە لە منە، هەر کەسێك سەرپێچیم بکات ئەوە تۆ ئەی پەروەردگار زۆر لێخۆشبوو و بە بەزەییت﴿٣٦﴾ ئەی پەروەردگار من نەوەکانم جێگیر و نیشتەجێ کردووە لە دۆڵێکدا کە هیچ کشتوکاڵێکی لێ نییە لەلای ماڵەکەی تۆ لە مەککە کە موحەڕەمە، واتە: حەرامە لەسەر ستەمکاران و کافران کە بێڕێزی بەرامبەری بکەن یان سووکایەتی پێ بکەن، ئەی پەروەردگار بۆیە لەوێ جێگیرو نیشتەجێم کردوون تا نوێژ بۆ تۆ ئەنجام بدەن، تۆش وا لە دڵی خەڵکی بکە کە دڵیان ڕاکێشی بۆ لای ئەو ماڵە، بۆ ئەوەی حەج بکەن و عیبادەتی تۆی لێ بکەن ڕزقیان بدە لە بەروبوومەکان، بەڵکو ئەوانیش شوکرانە بژێری تۆ بکەن﴿٣٧﴾ ئەی پەروەردگار تۆ زانای کە ئێمە چ شتێکمان شاردۆتەوەو چ شتێکمان ئاشکرا کردووە، هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە نە لە زەوی و نە لە ئاسمان﴿٣٨﴾ حەمد و ستایش بۆ پەروەردگار کە لە تەمەنی پیریدا کە خۆم و خێزانیشم تەمەنمان گەورەیە و پیر بووین ئیسماعیل و ئیسحاقی پێ بەخشیم، بە دڵنیایی پەروەردگاری من هەموو دوعا و پاڕانەوەیەك ئەبیستێ و وەڵام ئەداتەوە﴿٣٩﴾ ئەی پەروەردگار وام لێ بکە بەردەوام نوێژەکانم ئەنجام بدەم و نەوەکانیشم بەهەمان شێوە، ئەی پەروەردگار دوعاکانمان

قەبوڵ بکە﴿٤٠﴾ ئەی پەروەردگار لە خۆم و دایك و باوکم خۆش بە لە باوەڕداران خۆش بە لەو ڕۆژەی کە خەڵکی هەڵئەستنەوە بۆ لێپرسینەوە لە ساحەی مەحشەردا﴿٤١﴾

عەرەب تووشی شۆک بوو، ئەم چەند ئایەتە وەکو ئاوی سەهۆڵا و لە جێگای زۆر گەرمدا بکەیت بە سەریاندا، عەرەب نەک شۆکی وەرگرت، بەڵکو چاویشیان ئەبڵەق بوو، لە لایەکەوە جێگای فەخر و شانازی بوو بۆیان لە لایەکی ترەوە، وازیان لە ئارەزوو بتپەرستی بۆ نەدە هێنرا، نەیان دەزانی چۆن خۆیان دەرباز بکەن، هۆکارەکەشی توانای بیرکردنەوەیان نەبوو.

## لە شەوە زەنگی جاهیلی ڕۆژهەڵات

خوای پەروەردگار مێژووی عەرەبی بیری عەرەب خستەوە، بەڵام عەرەب خۆی هەڵە دەکرد، چونکە توانای بیرکردنەوەیان نەبوو، قورئان فێریان دەکات کە بیربکەنەوە بە وشەکانی ( یتفکرون، یعقلون، یذکرون، أولو الألباب...هتد) فێری دەکردن بۆ بیرکردنەوە، تەنانەت قورئان فێری دەکردن کە گومان بکەن، هەرچیتان کردووە وەرزش بە مێشک بیر و هۆش و ئەقڵتان بکەن، قورئان کاری لەسەر ئەو پرسانە دەکرد لە قۆناغی مەککەدا.

عەرەب زۆر حەزیان دەکرد گوێ بۆ ڕووداوەکانی ژیانی ئیبراهیم بگرن، لایان گرنگ بوو بە کافر و موشریک و موسوڵمانەوە، خوای گەورە باسی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ دابەزاندن. سەرەتا لەسێ قۆناغدا.

قۆناغی یەکەم: کە لەگەڵ باوکی دا وتوێژ دەکات دەفەرموێت: ﴿۞وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴿٧٤﴾﴾ الأنعام

واتە: کاتێك ئیبراهیم پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بە ئازەری باوکی وت: ئایا تۆ ئەو بتانە ئەکەیتە خوا و جگە لە خوای گەورە ئەو بتانە ئەپەرستی کە بەدەستی خۆت دروستی ئەکەیت و ئەیتاشیت، بەڕاستی من خۆت و قەومە بت پەرستەکەیشت ئەبینم کە ئێوە لە گومڕاییەکی زۆر ئاشکرادان و لە ڕێگای حەق لاتان داوە﴿٧٤﴾

قۆناغی دووەم: لەگەڵ گەردووندا لەگەڵ سروشت دا: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْأٓفِلِينَ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ

مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ۝٧٧ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ۝٧٨﴾ الأنعام

واتە: بەم شێوازە ئێمە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی نیشانی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئەدەین تا لەو کەسانە بێ کە بەچاوی خۆی ئەو شتە سەرسوڕهێنەرانە ببینێ و زیاتر یەقینی لەلا دروست بێت۝٧٥ کاتێك کە شەو ڕووناکی ڕۆژی داپۆشی بە تاریکییەکەی ئەستێرەیەکی بینی وتی: ئەمە خوای منە، وتراوە: بۆ ئەوەی کە ئەمە بکاتە حوجە و بەڵگە بەسەر قەومەکەیەوە، کاتێك کە ئەستێرەکە ئاوا بوو دیار نەما وتی: من خوایەکم خۆش ناوێ کە ئاوا بێت و دیار نەمێنێ۝٧٦ دوای ئەوە کاتێك کە مانگی بینی دەرکەوت وتی: ئەمەیان خوای منە، کاتێك کە مانگیش ئاوا بوو دیار نەما وتی: ئەگەر خوای گەورە هیدایەتم نەدات ئەوە منیش یەکێك ئەبم لەو قەومە وێڵ و گومڕا و سەرلێشێواوانەی کە ڕێگای حەقیان ون کردووە ۝٧٧ کاتێك کە خۆری بینی و خۆر دەرکەوت وتی: ئەمەیان خوای منە لەبەر ئەوەی ئەمە لە هەموویان گەورەترە، ئەمە شایەنی ئەوەیە کە خوا بێ کاتێك کە خۆریش ئاوا بوو وتی: ئەی قەومەکەی خۆم من بەریم لە هەموو ئەو پەرستراوانەی کە ئێوە ئەیانپەرستن لە خۆر و مانگ و ئەستێرە و بت و پەیکەر ئەوەتا بەچاوی خۆتان ئەبینن کە هەمووی ئاوا ئەبێت و نامێنێ ئەگەر ئەمانە خوا بن چۆن ئەبێ خوا ئاوابێت و دیار نەمێنێ۝٧٨

قۆناغی سێیەم: لەگەڵ ناخی خۆیدا، ﴿إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ۝٧٩﴾ الأنعام

واتە: من ڕووی خۆم کردۆتە ئەو خوایەی کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەوییە و بەتاك و تەنها ئەو دەپەرستم، لە شیرك و هەموو دینەکانی تر لائەدەم بۆ دینی حەقی ئیسلام و تەوحید من لەو کەسانە نیم کە شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار بدەم۝٧٩

ئەم هەموو ڕووداوە مێژووییە گرنگە نەخرایە بەرچاوی قوڕەیش لە ڕێگای وەحییەوە تا هاوشێوەی باپیرە گەورەیان بن بیربکەنەوە، فیطرەت و سروشتی ناخیان بە پاکی ڕابگرن، بەڵام عەرەب تێنەدەگەیشتن بیریان بۆ نەدەکراوە ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی بە باوکی پاشان لە بارەی ژیان و گەردوونەوە پاشان لە بارەی ناخی خۆیەوە، هەر ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ داوای دەکرد لە قوڕەیش، لە بیروباوەڕی ڕاست و تەندروست، کێشەکە لەوەدا بوو گەورە و دانا و فەیلەسوفی عەرەب ( أبو جهل) بوو!

گفتوگۆکەی ئیبراهیم هەموو ڕەهەندی پێگەیشتووی ئەقڵی مرۆڤ و هەوڵی کردنەوە و پساندنی کۆت و زنجیرەکان بوو کە لە دەست و ملیان ئاڵاندبوو لە جاهیلەت دا، خوای گەورە بۆ ئەوەی جارێکی تر تووشی شۆکیان بکات بکەونە پرسیارکردن، ئاخر باوکی پێغەمبەران پرسیاری کردووە، ئیسلام فێرمان دەکات پرسیار بکەین، تەنانەت گومانیش بکەین، ئازایەتی بیرکردنەوە و یاخی بوونمان پێ دەبەخشێت، بەڵام قورەیش نەدەجوڵا بۆ بیرکردنەوە بکات، دەرئەنجام وەکو ماسی وا بوون تۆزێک بیریان دەکردەوە، پاشان دەچونەوە، دۆخی ڕابردوو، بیرکردنەوەیان لاواز و ناتەندروست بوو، بەڵام قورئان وازیان لێ ناهێنێت، ڕێک دیمەنی کرداری خۆت دەخاتەوە بەرچاویان بە ڕابردووی ئیبراهیم، ﴿وَحَآجَّهُۥ قَوۡمُهُۥۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنِۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـٔٗاۚ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ۝٨٠ وَكَيۡفَ أَخَافُ مَآ أَشۡرَكۡتُمۡ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمۡ أَشۡرَكۡتُم بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗاۚ فَأَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ أَحَقُّ بِٱلۡأَمۡنِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ۝٨١ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ۝٨٢ وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ۝٨٣﴾ الأنعام

واتە: قەومەکەی دەمەقاڵێ و موناقەشە و گفتوگۆیان لەگەڵ ئیبراهیم پێغەمبەر (عَلَيۡهِ السَّلَامُ) داکرد فەرمووی: ئایا ئێوە مشتومڕ و گفتوگۆ لەگەڵ مندا ئەکەن سەبارەت بە خوای گەورە لە کاتێکدا کە خوای گەورە شەریك و هاوشێوەی نییە، خوای گەورە هیدایەتی منی داوە بۆ ئەم تەوحید و یەکخواپەرستییە ئێوە ئەتانەوێ من بگەڕێننەوە بۆ شیرك و گومڕایی و نەزانی من ناترسێم لەو خوایانەی کە ئێوە کردووتانە بەخوا بۆ خۆتان و ئەیانپەرستن کردووتانە بە شەریك بۆ خوای گەورە، ئەوان ناتوانن زیانم پێ بگەیەنن ئیلا ئەگەر خوا خۆی زیانم پێ بگەیەنێ بەهۆی تاوانێکەوە کە کردبێتم زانیاری خوای گەورە یەکجار فراوانە و دەوری هەموو شتەکانی داوە ئەوە بۆ یاد ناکەنەوە و بیر ناکەنەوە.

عەرەب نەیدەتوانی بیر لەو شەوە بکەنەوە کە شەوەزەنگ بوو، بەڵام ئیبراهیم بە بیرکردنەوە ئاسۆی فراوانی ڕۆژی ئیمانی تێدا هەڵهێناوە، ئەوە حوجەتە کە باسکراوە مەبەست ئەقڵی ئیبراهیم، حیکمەت و عیلم بۆ مرۆڤ لە ئەقڵدا سەرچاوە دەگرێت، کە حوجەتێکە ئیبراهیم کردویەتی لەسەر هەموو مرۆڤایەتی و لەسەر خودی خۆی و لەسەر گەلەکەشی بە تایبەت.

ئینجا باسی یەک ڕیز مەوکیبی موبارەکی پێغەمبەران دەکات کە هەموو خاوەن حیکمەت زانستی بوون لە ڕێگای ئەقڵیانەوە بە ئاڕاستەی وەحی، لە نمونەی ئەم پێغەمبەرانە بۆ قورەیش لە ئیبراهیم بۆ محمد (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) پێغەمبەر لەو نێوەندەدا باس دەکات خوای گەورە، کەچی

عەرەب ناجوڵێت و بیرناکاتەوە لەوکاتەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ۚ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾﴾ الأنعام

واتە: ئیسحاقمان بە ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بەخشی کاتێك کە خۆی و سارەی خێزانی بێئومێد بوون لە منداڵ، لە نەوەی ئیسحاقیش یەعقوبیشمان پێی بەخشی و کوڕەزای خۆی بینی، هیدایەتی هەموویانمان دا، پێش ئەمانیش هیدایەتی (نوح)مان دا لە نەوەی ئەمانیش داوود و سولەیمان و ئەیوب و یوسف و موسی و هاروون هیدایەتی هەمووومان داون و هەمووومان کردوون بە پێغەمبەر سەلامی خوا لە هەموویان بێت بەم شێوازە پاداشتی چاکەکاران ئەدەینەوە﴿٨٤﴾ هیدایەتی زەکەریا و یەحیا و عیسی و ئیلیاسمان داوەو کردوومانن بە پێغەمبەر، ئەمانە هەموویان لە پیاوچاکان و پێغەمبەرانی خوای گەورە بوونە﴿٨٥﴾ ئیسماعیل و یەسەع کە وتراوە: خضرە، یاخود وتراوە: هاوەڵی ئیلیاس بووە، (یونس) و لوطیش ئەمانە هەمووومان هیدایەت دراون و کردوومانن بە پێغەمبەر، هەموو ئەم پێغەمبەرانە فەزڵمان داون بەسەر هەموو جیهاندا بەوەی ئەمانە وەحیان بۆ هاتووە و کراون بە پێغەمبەر و لە خەڵکی باشترن﴿٨٦﴾ هەندێ لە باوك و نەوە و براو خێزانیانمان هیدایەت داوە هەڵمانبژاردوون و هیدایەتمان داون بۆ ڕێگا ڕاستەکەی خوای گەورە﴿٨٧﴾ ئا ئەمە هیدایەتی خوای گەورەیە کە ویستی لێ بێت هیدایەتی هەر کەسێك ئەدا بۆی لە بەندەکانی بۆ ڕێگای ڕاست بە فەزڵ و چاکەی خۆی، بەڵام ئەگەر ئەمانە یان هەر کەسێکی تر شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار بدەن، ئەوە کردەوە چاکەکانی

پێشتریان هەمووی بەتاڵ ئەبێتەوە﴿٨٨﴾ ئا ئەمانەن کە کتاب و حوکم و بڕیارو زانیاری و پێغەمبەرایەتی و پەیامان پێ بەخشیوون، ئەگەر کافرانی قورەیشیش کوفر بکەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ئیمان ئەبەخشین بە کەسانێکی تر کە موهاجیر و ئەنصار و صەحابەی پێغەمبەری خوان ﷺ شوێنکەوتوانیانن تا ڕۆژی قیامەت، کە ئەمانە کافر نین و ئیمانیان بە پێغەمبەری خواهێناوە﴿٨٩﴾ ئا ئەمانەن کە خوای گەورە هیدایەتی داون، ئەی محمد تۆش شوێنی هیدایەتی ئەوان بکەوە، شوێنی پێغەمبەرانی پێش خۆت بکەوە، ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: من داوای ئەجر و پاداشت و پارە لە ئێوە ناکەم لەسەر ئیمان هێنان و هیدایەت، بەڵکو ئەم قورئانە تەنها یادخستنەوەیەکە بۆ هەموو جیهان بە قورئان یادتان ئەخەمەوە﴿٩٠﴾ کافران خوای گەورەیان بە گەورە نەزانیوە ئەوەندەی کە خوای گەورە شایەنی بەگەورە زانینە ئەم ئایەتە لەسەر قورەیش دابەزی کاتێك کە وتیان: خوای گەورە هیچ شتێکی دانەبەزاندووە بۆ سەر هیچ مرۆڤێك، واتە: هیچ کتابی بۆ هیچ پێغەمبەرێك دانەبەزاندووە، مەبەستیان پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەی کێ ئەو کتابی دابەزاند کە تەوراتە و (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) هێنای؟ چونکە قورەیشیەکان دانیان بە تەوراتی (موسا)دا نا، لەبەر ئەوەی ئەو هەواڵانەیان لە جوولەکەوە پێ گەیشتبوو کە لە کاتی خۆیدا تەورات نوور و ڕووناکی و هیدایەت بووە بۆ خەڵکی، بەڵام جوولەکە ئەیان کردە بەش بەش کە هەندێکیان دەرئەبڕی و ئاشکرایان ئەکرد و زۆرێکیشیان ئەشاردەوە، ئەوەی مەبەستیان بوایە ئاشکرایان ئەکرد ئەوەیشی مەبەستیان بوایە ئەیانشاردەوە وەکو مژدەدان بە هاتنی پێغەمبەری خواوە باس کردنی سیفاتەکانی، بەهۆی هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ وە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە شتی پێیان وت لە ڕێگای وەحییەوە کە نە خۆیان و نە باوك و باپیرانیان نەیانزانیبوو و نەیان بیستبوو ئەی محمد ﷺ تۆ وەڵامیان بدەرەوە بڵێ: ئەم کتێبەش خوای گەورە دایبەزاندووە، چۆن ئەو کتێبانەی پێشتری دابەزاند، پاشان وازیان لێ بێنە با لەناو نەزانی و باتڵ و پووچەڵی خۆیاندا وەکو منداڵ یاری بکەن و ڕۆ بچن دواتر سەرەنجامی کارەکەیان دەزانن﴿٩١﴾

## فراوانکردنی بازنەکە بۆ عەرەب

عەرەب کەوتنە پرسیارکردنی قیامەت، بەڵام بەشێوەی گاڵتە ئامێز لەبەرگێکی زۆر جددی دا، دەیان پرسی داخۆ ئێمە بمرین زیندووو دەبینەوە، تەنها ئێسقانەکانمان دەمێنێت زیندووو دەبینەوە؟!

خوای گەورە دیمەنەکانمان بۆ باس دەکات لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿۞ وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ۝﴾ الرعد

واتە: ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەگەر پێت سەیر بێت کە ئەوان تۆ بە درۆ ئەزانن لەوەش سەیر و سەرسوڕهێنەرتر ئەم قسەیەیانە کە ئەڵێن: ئایا ئەگەر ئێمە لە دوای مردن ببین بە خۆڵ سەرلەنوێ دروست ئەکرێینەوە و زیندووو ئەکرێینەوە؟! ئا ئەم کەسانەن کە کوفریان کردووە بە پەروەردگاریان و باوەڕیان بە زیندوووبوونە نییە، ئەمانەن کە کۆت و زنجیر ئەکرێتە گەردنیان و ڕائەکێشرێن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، یان وتراوە: کردەوەکانیانە هەمیشە پێیانەوە پەیوەستە و وەکو کۆت و زنجیر بە گەردەنیانەوەیە، ئەم کەسانە هاوەڵی ئاگری دۆزەخن بە نەمری و هەمیشەیی تیایدا ئەمێننەوە۝

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ۝﴾ الحج

واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لە زیندووو بوونەوە کە لە توانای ئێمە هەیە و ئەتوانین زیندوووتان بکەینەوە، ئەوە ئێمە دروستمان کردوون لە خۆڵ، پاشان ئێوەمان دروست کردووە لە دڵۆپە ئاوێك کە مەنییە لە چل ڕۆژی یەکەم، پاش چل ڕۆژی تر ئەو دڵۆپە ئاوە ئەبێتە خوێنێکی مەییو، پاش چل ڕۆژی تر ئەبێتە پارچە گۆشتێك کە دروست کردنی ئەو مرۆڤە و شێوە و شکلی پێوە دیارە، یاخود پێش ئەوە هێشتا شێوە و شکلی دەرنەکەوتووە تا تەواوی توانا و دەسەڵاتی خۆمانتان بۆ ڕوون بکەینەوە و بۆتان دەرخەین، ئەوەیشی ویستمان لێ بێت لەناو ڕەحمی ئافرەتدا جێگیری بکەین و منداڵەکەی لەبارنەچێ تا کاتی دیاریکراوی خۆی کە کاتی منداڵ بوونە کە نۆ مانگ و نۆ ڕۆژە. لە دوای ئەوە لە سکی دایکتان ئەتانهێنینە

دەرەوە بە منداڵی و کۆرپەیی، پاشان ئەگەنە ئەوپەڕی تەمەنی عاقڵی و باڵغی و هێز و توانا و لێك جیاکردنەوەی شتەکان، هەیشتانە پێش ئەوەی بگاتە ئەو کاتە ئەمرێت، هەیشتانە تا ئەوپەڕی تەمەنی پیرێتی خوای گەورە تەمەنی درێژ ئەکات کە ئیتر فەهم و عەقڵی لە دەست ئەدات، پێشتر کە ئەو زانیاری و تێگەیشتنەی کە هەیبووە هەمووی لە دەست ئەدات، و لە دوای ئەوە هیچ شتێك نازانێ تۆ زەوی ئەبینی کە وشکە و هیچ شتێکی لێنەڕواوە کاتێك کە ئەو بارانە دائەبەزێنینە سەری ئەکەوێتە جووڵە لەبەر ئەوەی ڕووەکەکە لێوەی دەرئەچێت و بەرز دەبێتەوە و دەرئەکەوێت لە هەموو ڕووەکێك نێرو مێیەکی جوان و جووتێکی جوان ڕووەك ئەڕوێت﴿٥﴾

﴿أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَامًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾﴾ المؤمنون

واتە: ئایا ئەمە هەڕەشەی ئەوەتان لێ ئەکات کە ئەگەر بێتوو ئێوە بمرن و ببن بە خۆڵ و ئێسقانتان نەمێنێ و برزێ ئایا سەرلەنوێ دەرئەکرێنەوە و زیندووو ئەکرێنەوە؟﴿٣٥﴾

﴿قَالُوٓاْ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴿٨٢﴾﴾ المؤمنون

واتە: وتیان: ئایا ئێمە ئەگەر بمرین و ببین بە خۆڵ و ئێسقانەکانمان برزێ ئایا ئێمە سەرلەنوێ دروست ئەکرێینەوە﴿٨٢﴾

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ﴿٦٧﴾﴾ النمل

واتە: کافران ئەڵێن: ئایا ئێمە و باوك و باپیرانمان کە مردوو‌ونەو بوونە بە خۆڵ و ڕزیون و ئێسقانیشیان نەماوە، ئایا سەرلەنوێ خوای گەورە ئێمە لە قەبرەکان دەرئەکات و زیندووومان ئەکاتەوە؟﴿٦٧﴾

﴿أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴿١٦﴾﴾ الصافات

واتە: بەدووری ئەزانن زیندووو ببنەوە و بەدرۆی دەزانن و دەڵێن: کە ئێمە مردین و بووین بە خۆڵ و ئێسقانەکانمان ڕزی، ئایا لە دوای ئەوە ئێمە زیندووو ئەکرێینەوە؟﴿١٦﴾

﴿أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ﴿٥٣﴾﴾ الصافات

واتە: ئایا ئێمە ئەگەر بمرین و ببین بە خۆڵ و ئێسقانەکانمان برزێ، ئایا ئێمە سەرلەنوێ زیندووو ئەبینەوە و لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکرێت و سزا دەدرێین لەسەر کردەوەکانمان؟!﴿٥٣﴾

﴿أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ذَٰلِكَ رَجْعٌ بَعِيدٌ﴿٣﴾﴾ ق

واتە: ئایا ئێمە کاتێك بمرین و ببین بە خۆڵ و لەناو زەویدا برزێین، ئایا دوای ئەوە زیندووو بوونەوە هەیە؟ بەڕاستی ئەمە زۆر دوورە﴿٣﴾

﴿وَكَانُواْ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴿٤٧﴾﴾ الواقعة

واتە: ئەیانووت: ئەگەر ئێمە بمرین و ببین بە خۆڵ و ئێسقانەکانمان برزێت، ئایا سەرلەنوێ ئێمە دروست ئەکرێینەوە؟ واتە: بەدووریان ئەزانی باوەڕیان پێ نەبووە﴿٤٧﴾

هەمووی ئایەتەکان کە هاتوون لە سورەتەکاندا بە ( تەرتیبی قورئانی) هاتووە، بەڵام جاهیلی کە بڕوای بە ڕۆژی پاداشت نەبوو ئاسایی بوو ئەو پرسیارە بکات، بەڵام بڕوایان بە بوونی خوای پەروەردگار هەبوو، هەر بە ئایەتە قورئانییەکان بە شێوەیەکی زۆر ئەقڵانی وەڵامی ئەو پرسیارانەیان دەدایەوە، ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٣﴾﴾ العنكبوت

واتە: ئەی محمد ﷺ ئەگەر پرسیار لە کافران بکەی کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؟ خۆر و مانگی ژێربار کردووە کە ئێوە سوودیان لێ ئەبینن؟ ئەوا لە وەڵامدا ئەڵێن: بە دڵنیایی خوای گەورە دروستی کردووە ئەی کە ئەزانن خوای گەورە هەمووی دروست کردووە و شەریکی نییە لەو شتانەدا بۆ لائەدەن لە پەرستنی خوای گەورە﴿٦١﴾ خوای گەورە ویستی لێ بێت ڕزق و ڕۆزی بۆ هەر کەسێك لە بەندەکانی فراوان ئەکات، ویستیشی لێ بێت بۆ هەندێکی تر کەمی ئەکات بە گوێرەی حیکمەتی خۆی، بەڕاستی خوای گەورە زۆر زانایە بە هەموو شتێك﴿٦٢﴾ ئەگەر پرسیار لە کافران بکەی لەو ئاسمانەوە کێ باران دائەبەزێنێتە خوارەوە؟ ئەو زەوییە مردوووە بەهۆی ئەو بارانەوە زیندوووی دەکاتەوەو ئەیژێنێتەوە، ئەوا لە وەڵامدا ئەڵێن: بە دڵنیایی هەر خوای گەورەیە ئەی محمد ﷺ تۆ بڵێ: حەمد و سەنا و ستایش بۆ خوای گەورە بەڵام زۆربەیان تێناگەن﴿٦٣﴾

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾﴾ لقمان

واتە: ئەی محمد ﷺ ئەگەر لە کافران بپرسی کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؟ ئەوان زۆر بە دڵنیاییەوە ئەڵێن: بە دڵنیایی خوای گەورە، بڵێ: حەمد و سوپاس بۆ خوای گەورە کە دانتان بەم حەقەدا نا و بەڵگە بەسەرتاندا چەسپا، بەڵام زۆربەیان نەزانن﴿٢٥﴾

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾﴾ الزخرف

واتە: ئەگەر لە کافرانی قورەیش بپرسی کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، ئەوا ئەڵێن بەدڵنیایی خوای گەورە دروستی کردووە کە خوایەکی زۆر بەعیززەت و زانایە، باوەڕیان بە خوای گەورە هەبووە لە پەروەردگارێتیدا بەڵام شەریکیان بۆی داناوە لە پەرستندا﴿٩﴾

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾﴾ الزخرف

هەموو وەڵامی ئەقڵانی پرسیاری ڕابردوویان بوو.

کێشەکە لە پرسیارکردندا نییە، ئەوان بۆ ئەوەی وا هەست نەکەن کە تاوانە پرسیار کردن بەڵکو ئەوەی ئەوان باسیان کرد حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە چۆنیەتی پرسیار دەکات، خوای گەورەش وەڵامی ئەداتەوە بۆ دڵنیا بوونی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾﴾ البقرة

واتە: کاتێك ئیبراهیم پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بە پەروەردگاری فەرموو ئەی پەروەردگار بەچاو نیشانم بدە چۆن مردووو زیندووو ئەکەیتەوە؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئیبراهیم ئایا ئیمانت نەهێناوە، ئیمانت بەوە نییە کە من توانام هەیە لەسەر زیندووو کردنەوەی مردووو؟ فەرمووی: بەڵێ ئیمانم هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی کە زیاتر دڵم ئارام بێ و ئیمانەکەی دڵ و بینینی چاوم یەك بگرێ. خوای گەورە فەرمووی: بڕۆ چوار باڵندە بێنە کۆیان بکەوە لای خۆت پاشان پارچە پارچە و بەش بەشیان بکە، پاشان هەر پارچەی باڵندەیەك بخەرە سەر شاخێك و لێکیان جیا بکەرەوە پاشان بانگیان بکە بە ئیزنی خوای گەورە هەموو ئەو پارچانە بەخێرایی ئەگەنەوە بە یەك و زیندووو ئەبنەوەو ئەفڕن و دێنەوە بۆ لات بزانە کە خوای گەورە زۆر بەعیززەت و کاربەجێیە﴿٢٦٠﴾

## پرسیارێک کە هەرگیز ناپرسرێت

له هەموو پرسیارەکان گرنگتر، خوای موتەعال نموونەی پرسیاری حەزرەتی (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەهێنێتەوە کە داوا دەکات خوا ببینێت!

لێرەدا پرسیارەکە زۆر گەورەترە لە پرسیاری حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ)، قورەیش داوای هەمان پرسیاری کردووە، بەڵام خودی پرسیارەکە کێشە نییە، خوای موتەعال تووڕە نەبووە لەسەری، چونکە پرسیارکردن لە ئیسلامدا بە هەموو شێوەیەک ئاساییە و بگرە داواکراوە، بەڵام گرنگە لە وەڵامەکەی تێ بگەیت پرسیاری ئیبراهیم بۆ وەڵام دانەوەی ئاسای بوو دەکرا بە شێوەی ماددی نموونەی بۆ بهێندرێتەوە لەم ژیان و لەم جیهانەدا، بەڵام وەڵامی (موسا) جیاوازتر بوو بۆ بینینی خوای گەورە، دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَاءَ مُوسَىٰ لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٤٣﴾﴾ الأعراف

واتە: کاتێك کە (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) هات بۆ مەوعیدی دیاریکراوی لەگەڵ خوای گەورە بۆ ئەوەی خوای گەورە قسەی لەگەڵ بکات، پەروەردگار قسەی لەگەڵ (موسا)دا کرد بەبێ واسیتە، (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) قسەی خوای گەورەی بیست کاتێك کە (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) گوێی لە قسەی خوای گەورە بوو ئەنجا تامەزرۆی بینینی خوای گەورە بوو، بۆیە فەرمووی: ئەی پەروەردگار ڕێگام بدە با بتبینم؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەی (موسا) لە دونیادا تۆ ناتوانی من ببینیت، خوای گەورە فەرمووی: بەڵام تەماشای ئەو شاخە بکە ئەگەر لە جێی خۆیدا مایەوە ئەوە تۆیش ئەتوانی من ببینیت! کاتێك کە پەروەردگار خۆی دەرخست بۆ شاخەکە، شاخەکە وردو خاش بوو، بوو بە خۆڵ (موسا)ش (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەهۆش خۆی چوو کاتێك هاتەوە هۆش خۆی وتی: ئەی پەروەردگار پاك و مونەززەهی بۆ تۆ لەوەی کە داوا بکەم لە دونیادا تۆ ببینم، من تەوبە ئەکەم و بۆ لای تۆ ئەگەڕێمەوەو جارێکی تر داوای بینینی تۆ ناکەم لە دونیادا، من یەکەم باوەڕدارم لە بەنی ئیسرائیلدا، یان من یەکەم باوەڕدارم لەسەر ئەوەی کە کەس تا ڕۆژی قیامەت لە دونیادا ناتبینێت﴿١٤٣﴾

کەواتە وەڵامەکە لێرەدا زۆر بە شێوەیەکی عەمەلی تر درایەوە، بینینی خوا لەم جیهانەدا زۆر نائاساییە ناگونجێت لە ڕووی مادییەوە خوا ببیندرێت، کە ویستی خوای گەورە وابوو دەکەوێت، هیچ ماددەیەک خۆی ناگرێت و هەپرون هەپرون دەبێت و دەبێت بە تۆز و با.

)موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) خێرا وەڵامەکەی دەستکەوت، خۆ ئەو تۆبەی نەکرد لەوەی تاوانی کردووە لە پرسیار کردن، بەڵکو تۆبەی کرد لە گومانەکەی خۆی کە یەقینی بۆ دروست بوو، ئەم گومانانە

زۆر ئەرێنییە کە مرۆڤ بیری لێدەکاتەوە و هەوڵی بۆ ئەدات بگات بە یەقین، هیچ کام لە فەیلەسوف و بیرمەندەکان جورئەتی پرسیاری وایان نەبووە، تەنها پێغەمبەرانە کە خاوەنی گومانی ڕاستەقینەن.

کە دەرئەنجامی ئەم پرسانە خودی پێغەمبەر محمد ﷺ فەرمووی: ئێمە لە پێشترین بە گومان تا ئیبراهیم!

هیچ کەس و زانا و بیرمەندی ئیسلامی و ڕاڤەکارێک ناتوانێت تەئویل بۆ ئەم فەرموودە بدۆزێتەوە دەفەرموێت: {نحنُ أحقُّ بالشَّكِّ من إبراهيمَ إذ قالَ ربِّ أرِني كيفَ تُحيي المَوتى قالَ أوَلَمْ تُؤمِنْ قالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ويرحمُ اللَّهُ لوطًا لقد كانَ يأوي إلى رُكْنٍ شديدٍ ولَو لَبِثْتُ في السِّجنِ طولَ ما لَبِثَ يوسفُ لأجبتُ الدَّاعيَ}[52]

کەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاڕاستەی قورئان فراوانی ئەقڵ و لۆژیک و بیکردنەوەی بەخشیە ئوممەتەکەی کە نەترسن لە بیرکردنەوە لە سەر ژیانی سێ پێغەمبەر ( ئیبراهیم و (موسا) و عوزەیر)، لە بیرمان نەچێت نموونەی هاوشێوەی ئەم پرسیارانە زۆرن لە قورئان وەکو عوزێر و گوێدرێژەکەی و یارانی ئەشکەوت، هەمان وەڵامە بۆ پرسیارە وجودییە سەختەکان کە زانست و فەلسەفە و فیکر ناتوانێت وەڵامی بۆ دەستەبەر بکات، تەنها قورئانە وەڵامی هەموو پرسیارە گوماناوی سەختە وجودیەکان ئەداتەوە، تەنانەت لە توانای ئایینەکانی تریشدا نییە بەگشتی.

## پرسیاری ڕووخاندن بۆ بیناکردن

عەرەب دیسانەوە کەوتنە گاڵتەکردن بە پێغەمبەر ﷺ و وەحییەکەی، تاکە حوجە و وتەیەک کەلای خۆیان بەهێز بوو، دەیانووت تۆ وەکو ئێمە مرۆڤی توانات وەکو تواناکانی ئێمە، ئیتر چۆن بە قسەت دەکەین، ئەمەش لەو پەڕی دواکەوتوویی و جەهالەتیان بوو، بۆیە خوای گەورە سورەتی پێغەمبەران (الأنبياء)ی دابەزاند کە هەموویان مرۆڤن، پاشان قورئان ئاماژەی بەوەدا کە باوکی عەرەب ئیبراهیمە ئەو بە دەستی خۆی بتەکانی شکاندوە، ئینجا باسێکی ئەقڵانی زۆر گرنگ خوای گەورە لە ڕێگای پێغەمبەرەوە دەخاتە ناو هەناوی کۆمەڵگەی قوڕەیش، کە شکاندنی بتەکان بە دەستی خودی باوکتان بووە کاتێک کە گەیشتۆتە پلەی ڕوونکردنەوە، واتا یەکتاپەرستی (التوحيد). دەشێت محمد ﷺ و هاوڕێکانی هەمان کار ئەنجام بدەن، بەڵام کەی و چۆن کاتەکەی دیاری نەکراوە، لە هەمان کاتدا قوڕەیش هیچی پێ

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[52] فەرموودەکەش نەک صەحیحە، بەڵکو کۆڕای لەسەرە ( متفق عليه) (البخاري، مسلم، ابن ماجة، احمد، ابن حبان) ڕیوایەتیان کردووە.

ناکرێت، چونکە ئیبراهیم کە خاوەنی یەکتاپەرستی بوو ئاگر نەیتوانی بیسوتێنێت بە فەرمانی خوایی. کەواتە محمد ﷺ -یش بە دڵنیاییەوە پارێزراوە، بەڵام زۆر جار دەبێت پاچ هەڵبگرین بۆ شکاندن، تا بتوانین سەر لە نوێ بونیاد بکەینەوە.

قورەیش لە پرۆژەی بازرگانی و ئایینی دەترسا، ئەوان لایان وابوو ئەگەر بتەکان نەمێنێت کەس نایەت بۆ طەواف و حەج، پاشان کەرەستە و شتومەک لە قورەیش ناکڕێت، ئیتر بازرگانیان نامێنێت. لە ڕاستیدا ڕێک پێچەوانەکەی ڕاست بوو کە بتەکانی ناو کەعبە نەما و شکان زیاتر کەعبە و مەککە پیرۆزتر بوو خەڵکی ڕووی تێدەکرد.

جوڵاندنی ئەقڵی قورەیش لە ڕێگای باوکی پێغەمبەران و باوکی عەرەبەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ فَأْتُوا۟ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ﴿٦١﴾ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُوا۟ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ﴿٦٥﴾﴾ الأنبياء

واتە: بە دڵنیایی هەر لە پێشتردا ڕێگای ڕوشد و ڕاستمان بە ئیبراهیم پێغەمبەر بەخشی، ئێمە ئەمانزانی کە شایەنی ئەوەیە کە ڕێگای هیدایەت و ڕاستی پێ نیشان بدەین و بیکەین بە پێغەمبەر﴿٥١﴾ کاتێك کە ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بە باوکی و بە قەومەکەی وت: ئەم بتانە چین کە ئێوە بەدیاریانەوە دانیشتوونە و ماونەتەوەو عیبادەتیان ئەکەن﴿٥٢﴾ ئەوان هیچ بەڵگەیەکیان پێ نەبوو تەنها وتیان: ئێمە باوك و باپیرانی خۆمان بینیوە کە عیبادەت و پەرستشیان بۆ ئەم بتانە کردووەو ئێمەیش لاسایی ئەوان دەکەینەوە﴿٥٣﴾ ئیبراهیمیش (عَلَيْهِ السَّلَامُ) فەرمووی: بە دڵنیایی ئێوە و باوك و باپیرانتان لە گومڕاییەکی زۆر ئاشکرادا بوون کە عیبادەت و پەرستن بۆ ئەو بتانە دەکەن﴿٥٤﴾ وتیان: ئەی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئایا تۆ حەقت بۆ هێناوین و بەڕاستە یان گاڵتەمان لەگەڵدا ئەکەی؟ چونکە پێشتر قسەی وامان لێت نەبیستووە﴿٥٥﴾ ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) فەرمووی: بەڵکو پەروەردگاری

ئێوە تەنها پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە کە دروستی کردوون، تاك و تەنها و بێ شەریکە منیش لەسەر ئەم یەکخواپەرستییە شایەتم﴿٥٦﴾ سوێند بێ بەخوای گەورە ئەبێ هەموو بتەکانتان بشکێنم کاتێك کە ئێوە پشت هەڵئەکەن و ئەڕۆن بۆ ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی جەژنەکەتانەوە﴿٥٧﴾ دوای ئەوەی کە ئەوان لە شار چوونە دەرەوە، ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) مایەوە و وتی: من نەخۆشم، دەستی کرد بە بت شکاندن و هەر هەمووی شکاند تەنها بتە گەورەکە نەبێ کە پاچەکەی دایە دەستی، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو پرسیاری لێ بکەن بزانن کێ بتەکانی تری شکاندووە، یان وا بزانن ئەو شکاندویەتی و پێی ناخۆشە لەگەڵ ئەودا ئەو بتە بچووکانەیش دەپەرستن!﴿٥٨﴾ کاتێك گەڕانەوە بینیان بتەکان هەمووی شکاوە وتیان: کێ وای لە خواکانی ئێمە کردووە، بەڕاستی ئەوە کەسێکی ستەمکار بووە﴿٥٩﴾ وتیان: بیستوومانە گەنجێك هەیە کە بە خراپە باسی خواکانی ئێمەی کردووە ئەو گەنجەش ناوی ئیبراهیمە (عَلَيْهِ السَّلَامُ)﴿٦٠﴾ وتیان: بڕۆن بیهێنن لە پێش چاوی خەڵکی سزای بدەین بۆ ئەوەی خەڵکی ئامادەی سزاکەی بێت، یاخود شایەتی بدەن لەسەری﴿٦١﴾ وتیان: ئەی ئیبراهیم ئایا تۆ وات لە خواکانی ئێمە کردووە و هەمووت شکاندوون؟﴿٦٢﴾ فەرمووی: بەڵکو خوایە گەورەکەیان، بتە گەورەکەیان، وای لێ کردوون و هەموویانی شکاندووە، دەی پرسیاری لێ بکەن ئەگەر ئەتوانێ وەڵامتان بداتەوە و قسە ئەکات﴿٦٣﴾ هەندێکیان گەڕانەوە بۆ لای هەندێکیان، واتە: بێ بەڵگە و بێ قسە مانەوە، یاخود لۆمەی یەکتریان کرد بۆ خواکانمان بێ پاسەوان بەجێهێشت، وتیان: بەڕاستی ئێوە ستەمکارن کە عیبادەتی ئەمانە ئەکەن، یان بێ پاسەوان خواکانتان بە جێهێشت!﴿٦٤﴾ پاشان سەریان شۆڕ کرد وتیان: ئەی ئیبراهیم تۆ ئەزانی ئەم بتانە قسە ناکەن چۆن پرسیاریان لێ بکەین و لێیان بپرسین کە کێ شکاندوویەتی!﴿٦٥﴾

ئیبراهیم پرسیار دروست دەکات بە ڕووخاندن و شکاندنی بتەکان تا حەقیقەت و ڕاستی توانای بتەکان دەربکەوێت کە تەنها دار و تەختە و بەردن توانای هیچیان نییە.

چونکە بە پرسیاکردن لە گەورەی بتەکان شتێک ڕوون دەبێتەوە، ئەوان خۆیان وەڵامی پرسیارەکەیان داوە ناڕاستەوخۆ کە بتەکان قسە ناکەن، ئینجا قورەیش دەیانووت خۆ ئێمە بتەکان ناپەرستین کە هاوشێوەی خوایە، بەڵکو ڕۆحی بتەکان دەپەرستین کە لە خوامان نزیک دەکاتەوە!

ئەوەش لە گێلێتی کەمتر بوو، چونکە خوایەک بەو توانا و سیفاتە پیرۆزانەوە کە خالقە و بەدیهێنەری ئەم بوونەوەر و هەموو مەخلوقاتەیە، چۆن بە بەرد و دار و ئێسقانی ئاژەڵ لێی نزیک دەبێتەوە، قورئان دەیجوڵاندن بۆ زیاتر بیرکردنەوە، بەڵام بیرکردنەوەی ئەرێنی، کەچی توانای بیرکردنەوەی باشیان نەبوو!

ئەمەش مانای وانیە تەنها لە ناو کۆمەڵگای قورەیش وابووە باو بووە نا، بەڵکو لە ئێستاماندا هەمان جاهیلیەت هەیە و هەمان ڕووکەشە تەنها ناوەکان گۆڕاوە، لە ئەبو جەهلەوە بۆ جۆبایدن، لە ئوبەی کوڕی خەلەفەوە بۆ ناتنیاهۆ...هتد.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستی بە ئارام گرتن بوو لەگەڵیاندا، دەبوو ئارام بگرێت تا تێدەگەن.

ئارامگری حەزرەتی ئەیوب، (یونس)، ئەزموونێک بۆ حەزرەتی محمد ﷺ

خوای موتەعال باسی ئارامگری ئەیوب دەکات کە نەخۆش بوو، ئارامگر بوو تا لێواری مەرگ.

﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ۝٤١ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ۝٤٢ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ۝٤٣ وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا فَٱضۡرِب بِّهِۦ وَلَا تَحۡنَثۡۗ إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ ۝٤٤﴾ ص

واتە: ئەی محمد ﷺ تۆ یادی ئەیوب پێغەمبەر (عَلَيهِ السَّلَامْ)-یش بکە کاتێك بانگی لە پەروەردگاری کرد و لێی پاڕایەوە وتی: من شەیتان تووشی ماندوویتی و سزای کردووم بەهۆی نەخۆشی و ئەو شتانەوە، گەڕاندیەوە بۆ شەیتان لەبەر ئەوەی شەیتان هۆکار بووە۝٤١ خوای گەورە فەرمووی: بە پێیەکانت ڕابکە و بیدە بە زەویدا ئەمیش وای کرد و ئاوێکی بۆ هەڵقوڵاند و فەرمووی: بەناو ئەم ئاوەدا برۆ و خۆتی پێ بشۆرە ئەمە ئاوێکی سارد و سازگارە و دواتر لێشی بخۆرەوە بەوە چاك ئەبیتەوە یەکسەر چاك بووەوە۝٤٢ کەسوکاریشیمان بۆ گێڕایەوە، هاوشێوەی ئەوانەیشی لەگەڵیاندا پێ بەخشیوە وەکو ڕەحمەتێك لە خوای گەورەوە بەهۆی ئارامگرتن و سوپاسگوزاری و ڕازی بوونی وەکو یادخستنەوەیەکیش بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن عەقڵ و ژیرین، کە بزانن سەرەنجامی ئارامگرتن خۆشگوزەرانی و دەرووی خێر و بردنەوەیە ۝٤٣ هەندێك پووش یان پەلە دار خورمایە بگرە بەدەستەوە، بەو شێوازە لێی بدە بۆ ئەوەی سوێندەکەت نەشکێت و ئەویش ئێش و ئازاری پێ نەگات، ئێمە بینیمان ئەیوب کەسێکی زۆر ئارامگر و باشترین بەندە بوو زۆر بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕایەوە۝٤٤

ئەگەر وەسفی ئارامگری ئەیوب تەماشا بکەین بە وشەی (صابرا) هاتووە ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە وشەی ئارامگری واتا دان بەخۆدا گرتن تاکو کۆتایی مەرگ یاخود مردن.

وشەی (الصبر) لە بنەڕەتدا گیایەکە لە بیابان و سەحراوی زۆر لماوی سەوز دەبێت، عەرەب ناوی تری لێ ناوە لە جۆرە گیایە لە تاو ئارامگری ناونراوە (الصبار) یان ( الصبیرة)، هەموو ئەم

ناوانە لەو جۆرە گیایە وە هاتووە کە ڕەگی دەخاتە ناو جەرگەی زەوی تا لەو جێگا بێ ئاو و بارانە دا کە سەحراویە، جێگایەکی(ڕوطوبەت) بدۆزێتەوە ژیانی خۆی بێ بەردەوام بکات، ئەو گیایە ڕێک پێچەوانەی ڕووکەشەکەیەتی لەسەر زەویدا زۆر گیایەکی بچووکە و سەرهەڵنادات، بەڵام لە بنەڕەتدا ڕەگی زۆر درێژە و بە ناخی زەویدا ڕۆ دەچێت بۆ دەرهێنانی ئاوی ناو جەرگەی خاک تا بژیت.

لە زۆر ناوچەی عەرەب نشین ئەم جۆرە گیایە پێیدەوتریت گیای هیوا (نبتة الأمل)، چونکە جەخت لە سەر مانەوەی دەکات لە ژیاندا لە هەموو سەردەمێکی دژوار و سەخت دا دژایەتی مەرگ دەکات، جێگایەکی بێ ئاوە پڕ خۆڵ و لماویە بای خۆڵاوی و لمی زۆری تێدایە ژینگەیەکی ئەم گیایە لە کۆنەوە پێی وتراوە (صبر) کە نازناویشە بۆ عەرەبی بیابان نشین، کەواتە سەرچاوەی سەبرە، ئارامی لە ناو عەرەبەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەمەش مانای وانیە، گەلانی تر خاوەنی ئیمتیاز  نەبن، بۆ نموونە عەرەب زۆر بێ توانایە لە شاخ و جێگا بەرزەکاندا بژیت، ڕێک بە پێچەوانەی کورد و ئەفغانی گەلی ئاری بە گشتی. ئەو کەسە ئارامگرە لەسەرما و لە ژیانی شاخاویدا، بەڵام عەرەب توانای نییە یەک مانگ لەو جێگایەدا بژیت، کەواتە هەر کەسە لە جێگا و شوێنی خۆیدا خاوەن تایبەتمەندی و سیفاتی خۆیەتی.

وشەی (صبر) عەرەب خاوەنیەتی، زۆر ئارامگربوون تا کاتی مەرگیان، تەنانەت خوای گەورە نموونەی پێغەمبەرێک دەهێنێتەوە کە توانای ئارامگرتنی نەبوو لە بانگەوازەکەیدا: ﴿فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ﴿٤٨﴾﴾ القلم

واتە: ئەی محمد ﷺ تۆ ئارام بگرە بۆ حوکم و بڕیاری پەروەردگارت لەسەر ئازاردانی نەتەوەکەت، تۆ وەکو (یونس)ی هاوەڵی نەهەنگەکە مەبە کە لە قەومەکەی تووڕەبوو بەجێی هێشتن و دواتر لەناو دەریاکە نەهەنگەکە قوتیداو دواتر لەناو دەمی نەهەنگەکە داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە کرد و خوای گەورە فەرمانی بە نەهەنگەکە کرد فڕێی دایە دەرەوە، کە ئەم دواتر غەم و پەژارە و خەفەتی خوارد، یاخود لەناو سکی نەهەنگەکەدا بەند کرا﴿٤٨﴾

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ عەرەبە و لەو ناوچەیدا ژیاوە خاوەنی ئارامگری بووە، بەڵام بانگەواز و کارکردن بۆ دینی خوای گەورە ئارامی و سەبری باشتر و جوانتری دەوێت، هەر بۆیە خوای گەورە ئاگاداری دەکاتەوە کە گۆڕانکاری دەکەیت، پێویستت بە ئارامگری جوانتر و باشتر هەیە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُمۡ فَأَنذِرۡ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ﴿٥﴾ وَلَا تَمۡنُن تَسۡتَكۡثِرُ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصۡبِرۡ﴿٧﴾﴾ المدثر

واتە: هەستە ئاگاداری خەڵکی بکەوە﴿٢﴾ پەروەردگارت بە گەورە بزانە بەوەی کە بەتاك و تەنها بیپەرستی و شەریکی بۆ بڕیار نەدەیت﴿٣﴾ جلو بەرگ و پۆشاکەکەت پاك ڕابگرە﴿٤﴾ واز لە تاوان بێنە، یاخود بەمانای بت دێت لە بتەکان دووربکەوە و مەیانپەرستە﴿٥﴾ ئەگەر شتێکت بەخشی چاوەڕێی ئەوە مەبە یان داوای ئەوە مەکە کە زیاترت پێ ببەخشن، یاخود بە کردەوە چاکەکانت منەت مەکە بەسەر خوای گەورەدا، یاخود لاواز مەبە لەوەی کە خێر و چاکە زۆر بکەیت، یاخود بە پێغەمبەرایەتیەکەت داوای ئەجر و پاداشت لە خەڵکی مەکە﴿٧﴾

پاشان دەفەرموێت: ﴿فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا﴿٥﴾ إِنَّهُمۡ يَرَوۡنَهُۥ بَعِيدٗا﴿٦﴾ وَنَرَىٰهُ قَرِيبٗا﴿٧﴾﴾ المعارج

واتە: ئەی محمد ﷺ تۆ ئارام بگرە ئارامگرتنێکی جوان کە ناشوکری و گلەیی و گازەندەی لە خوای گەورە تیادا نەبێت﴿٥﴾ کافران ئەم ڕۆژە کە ڕۆژی قیامەتە بەدووری ئەزانن، یاخود بە ئەستەم و مەحاڵی ئەزانن و ئەڵێن: ئەستەمە زیندووو بوونەوە و لێپرسینەوە هەبێت﴿٦﴾ بەڵام ئێمە ئەیبینین، یاخود باوەڕداران وای ئەبینن کە ئەمە ڕۆژێکی نزیکە لەبەر ئەوەی هەر شتێك کە بێت ئەوا نزیکەو ئیلا ڕوو ئەدات﴿٧﴾

ئەم پێناسەیە کە خوای گەورە کردوویەتی بۆ جوانی سەبر، دیوی ڕاستەقینەی ئارامگرییە، جۆرێک لە ئارامگری نێگەتیڤ هەیە کە زۆر کەس هەر بە صەبر باسی دەکات، بەڵام جیاوازی ئارامی ئەرێنی و نەرێنی دەبێت بکرێت بۆ نموونە:

مرۆڤ کە خۆی ترسنۆکە ناوێرێت ڕوو بەڕوو بێتەوە، ئەوە پێی ناوترێت ئارامگری ئەوە ترسنۆکییە!

ئەگەر تەماشای حەمزەی مامی پێغەمبەر و عومەری کوڕی خەطاب بکەین دوو کەسی زۆر ئازار و چاو نەترس بوون، بەڵام ئارامگربوون لە شاری مەککەدا بە ئاراستەی وەحی دەجوڵانەوە کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وەریبگرن ئەوان ئازا بوون، بەڵام ئارامیان گرت و دانیان بە خۆیاندا گرت، یاخود مرۆڤ پارەی پێ نییە خۆی هەژارە، بانگەوازی ژیانی زوهدو عابیدی و ( تەقەشوفی) دەکات، ئەو کەسە نابێتە زاهید کە هیچی نەبێت، چونکە نازانێت ئەگەر دەوڵەمەند بوو هەروا دەکات؟!

کەواتە ئەو کەسەی کە دەوڵەمەندە خاوەنی پارە و سامانی زۆرە، لەو دەوەشێتەوە کە زاهید و زوهد بکات لە ژیاندا، چونکە دەوڵەمەندە خۆی دەگرێتەوە.

نموونەی تر یەکجار زۆرە ئارامگری لەو شتەدایە کە توانای بەسەریدایە، بۆ نموونە کەسێک باوکی دەمرێت یان دایکی یان هەر ئازیز و خۆشەویستێک لە کاتی هەواڵپێدانی مردنەکەدا ئارامی و بەصەبر دەردەکەوێت، کە لە دواییدا چونکە مردووو هەرگیز ناگەڕێتەوە، گرنگە لە جێگای ئارامگریدا ئارامگر بیت، بۆچی لە ناو هەموو پێغەمبەراندا تەنها پێنج پێغەمبەر بە پێشەنگی هەموویان هەڵبژێراون؟! لەبەر ئەوەی زۆر ئارامگر بوون، ئەویش ((نوح)، ئیبراهیم، (موسا)، (عیسا)، محمد) سەلامی خوا لە هەموویان بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍۭۚ بَلَٰغٌۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٣٥﴾﴾ الأحقاف

واتە: ئەی محمد ﷺ ئارام بگرە هەروەکو چۆن پێغەمبەرانی (ئولول عەزم) کە خاوەنی عەزیمەت و دامەزراوی بوونە ئارامیان گرتووە لەبەرامبەر ئازاری قەومەکانیان کە (نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا و محمد) بوونە (سەڵات و سەلامی خوایان لێ بێت) پەلەی سزا مەکە سزایان بۆ دابەزێ، ڕۆژێك کە بە چاوی خۆیان سزای خوای گەورە دەبینن کە لە دونیا هەڕەشەیان لێ کرا بوو پێیوەك ئەوە وایە کە لە دونیادا نەژیابێتن تەنها چەند کاتێك لە ڕۆژدائەم قورئانەی کە تۆ ئامۆژگاریانی پێ ئەکەی ڕاگەیاندنێکە تا عوزریان نەمێنێ لە قیامەت هیچ کەسێك لەناو ناچێ تەنها ئەو کەسانە نەبێ کە لە گوێڕایەڵی خوای گەورە دەرچوونە، والله أعلم

کەواتە ئارامگری لە ژیانی پێغەمبەران و پێغەمبەری خوا ﷺو زنجیرەیەکی گرێ دراو بوو، ئارامگری دەگاتە پلەی ئیحسان و بەندایەتی زۆر گەورە خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾﴾ هود

واتە: تۆ ئارامگر بە لەسەر دامەزراوی و خواپەرستی بەڕاستی خوای گەورە پاداشتی چاکەکاران نافەوتێنێت﴿١١٥﴾

﴿وَٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾﴾ البقرة

واتە: پشت بە صەبر گرتن و نوێژ کردن ببەستن لەسەر چاکە، بەڕاستی نوێژ زۆر گەورە و قورسە تەنها لەسەر کەسانێك نەبێ کە خاشع و ملکەچی فەرمانی خوای گەورەن﴿٤٥﴾

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾﴾ البقرة

واتە: ئەی باوەڕداران ئێوە پشت بە ئارام گرتن و نوێژ ببەستن بەرامبەر ئەو بەڵاو ناخۆشییانەی کە ڕووبەڕووتان ئەبێتەوە، بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵ ئارامگرانەیاندایە بەوەی سەریان ئەخات و پشتیوانیان ئەبێ و یارمەتیان ئەدات﴿١٥٣﴾

ئاوێتە بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ژیانیان و ئارامگریان زیاتر و زیاتر ئینێرجی و هێز و توانای دایە پێغەمبەری ئازیز ﷺ، گێڕانەوەی ژیانی و ڕووداوی ئەزموونی پێغەمبەران بۆ پێغەمبەری ئازیز ﷺ، بریتی بووە لە زیاتر ئارامگری و دڵنیابوون لە کارکردنیدا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۚ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴿١٢٠﴾﴾ هود

واتە: لە هەموو هەواڵی پێغەمبەرانت بۆ ئەگێڕینەوە، کە خوای گەورە چۆن سەریخستوون و کافرانی لەناوبردووە، کە بەهۆیەوە دڵت پێی جێگیرو دامەزراو و پڕ لە دڵنیایی بێت، لەم سووڕەتەیشدا حەق و پەندو ئامۆژگاری و بەسەرهاتی ئوممەتانی ترت بۆ هاتووە یادخستنەوەیەکە بۆ باوەڕداران﴿١٢٠﴾

هەروەها پێدەچێت پێغەمبەری خوا ﷺ، تووشی هەمان باری دەروونی حەزرەتی (یونس) بووبێتەوە، هەر بۆیە خوای موتەعال ئاگاداری دەکاتەوە کە ئەزموونی حەزرەتی یونس (عَلَيْهِ السَّلَام ) دووبارە نەکاتەوە.

ئەزموونەکە لێرەدا بریتییە لە ئاوێتەبوونی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەگەڵ واقیعەکەدا لە ناو کۆمەڵگەی قوڕەیش یاخود عەرەب بە گشتی، چونکە کاتێک (یونس عَلَيْهِ السَّلَام) کۆمەڵگەکەی جێهێشت لانیکەم لە ناو کۆمەڵگەکەدا بوو، بەڵام کە گیری کرد لە ناو ئاوەکەدا تووشی نەهەنگەکە بوو هەر خۆی بوو، لە تەنهایی لە ناڕەحەتی جا لەناو سکیدا بووبێت یان لە ناو تاریکی دەریا، یاخود لە ناو دەمیدا خۆی حەشار دابێت، ئاماژەبوو بۆ ئەوەی تێبگات ماسی گەورە ماسی بچووک دەخوات، نەهەنگەکان بە تەن ماسی ورد دەخۆن، وەکو دەوڵەمەندەکانی قوڕەیش و زاڵمەکان کە قوتی هەزارەها منداڵ و ژن و پیاوی کۆیلەیان لە بن دەست بوو، ئەو سکی (حوتی) سەرمایەداریە لە ئێستادا بەرچاوە کە چاویان توانای ماسییە بچووکەکان و خودی ماسییە بچووکەکان حەپەلوش دەکات، تاریکییەکەش بریتیە لە تاریکی ڕەوشتی کۆمەڵگەکە و وازهێنان لێی، دەبێت هەموو خۆ بخەنە بەردەم (حوتە) گەورەکە و لاوازەکان بخوات.

پێغەمبەری خوا ﷺ باش لە ڕووداوەکەی (یونس) تێگەیشت، ئاخر بە تەنها زاڵم نابێت بە زاڵم، ئەگەر مەزڵوم نەبێت، ئەم مەزڵومەش ئەگەر ڕازی بێت بە زوڵمی زاڵم با مەزڵومیش بێت، ئەویش هەر زاڵمە، چونکە خۆی ڕا دەستی جەللادی زاڵم کردووە.

ناکرێت خۆمان ڕادەستی هەڵبژاردنی خوامان بکەیت، بماندەنە وەحی دەریا و نەهەنگە گەورەکان حەپەلوشی بکەن، ڕازی بوون بە هەڵبژاردنی داری گۆچان، کوتەک، تیزاب، ژەهر، فیشەک، شمشێر و...هتد، دوژمنەکەم هەڵمدەخەڵەتێنێت بۆ ئەوەی بڵێێن مرۆڤ دۆستە، هەڵبژاردنی داوەتە دەستمان، لە کۆتاییدا هەموو هەڵبژاردەکان دژی خۆمە و دوژمنەکەم سوودی لێ وەردەگرێت.

ناکرێت خەڵکی بدرێتە دەست خورافات و چاو بەست و زوڵم و ستەم، کەچی وەکو چۆن حەزرەتی (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) خرایە ناو زەریاکە، زۆر دیموکراسی خواز بووە، ئاخر چۆن دەکرێت، بە وتەی زۆرینە کەمینە زەرەرمەند بێت، چۆن دەبێت بۆ ئاکار و بەها و ڕەوشتێک چۆک دا بدەین کە خۆمان خاوەنی بین، زوڵم هەرگیز ناگۆڕدرێت بە گۆڕانکاری لە خۆماندا نەبێت، خوای گەورە هەموومانی ئاگادار کردەوە لە ڕێگای پێغەمبەری ئازیزەوە ﷺ، ... إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ ...﴿١١﴾ الرعد

واتە: بە دڵنیایی خوای گەورە هیچ قەومێك ناگۆڕێت یان لە هەر ناز و نیعمەتێکدا بن لێیان ناگۆڕێ تا خۆیان خۆیان نەگۆڕن بە خراپەکاری﴿١١﴾

پێغەمبەر محمد ﷺ چۆن دەرچوو لە سکی حوتەکەی پێغەمبەر (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ)

دەزولەی نوور لە تاریکیدا

سکی حوت واتاکەی پڕ نائومێدییە تاریکی سکی حوت واتاکەی بێ هیواییە، تاکە دەزولەی بێ هیوایی و نائومێدی بۆ ڕۆشنکردنی نوورێک و زیکر و فیکری خوای پەروەردگارە لە تاریکیدا (یونس) (عَلَيْهِ السَّلَامُ)، دەیفەرموو: أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ هُمۡ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ الأنبياء

واتە: بەڵکو موشریکان لەسەر زەویدا خۆیان خوایان بۆ خۆیان بڕیار داوە و بڵاوی ئەکەنەوە، یاخود ئایا ئەوان مردووو زیندووو ئەکەنەوە؟﴿٢١﴾

(یونس) بە هەڵبژاردنی ناوەکان زوڵمی لێ کرا، یان هەڵبژاردنی زاڵمانە کە ڕێگا چارەی تر زۆرە بێجگە پێشبڕکێی ناشەریف و زوڵم و زۆر، خۆ ئەگەر زیکر و فیکری خوای موتەعال نەبوایە بۆ (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) تا ڕۆژی قیامەت لەو تاریکی سکی حوتە دەمایەوە.

﴿فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴿١٤٤﴾﴾ الصافات

واتە: ئەگەر (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەناو سکی نەهەنگەکە تەسبیحاتی خوای گەورەی نەکردایە یان نوێژی نەکردایە﴿١٤٣﴾ ئەوە لەناو سکی ئەو نەهەنگەدا ئەمایەوە تا ڕۆژی زیندووو بوونەوە، واتە: ناو سکی نەهەنگەکە ئەبووە گۆڕی﴿١٤٤﴾

وا پەی نەبەن لە زیکر و یادی خوا تەنها بریتییە لە یادی خوا بە دەنگ و زمان نا؛ زۆر لەوە گەورەترە، بەڵکو دید و تێڕوانینە بۆ گۆڕانکاری تەواو، ئەم دیدە نوێیە کە سەوز بوو موعجیزە دروست دەکات، واتایەکی نوێیە لە هەمبەر زوڵم و بەرپرسیارێتی، ئەم دیدە جارێکی تر تێگەیشتنێکی نوێی دایە حەزرەتی (یونس)، ئەگەر ئەو دیدە نوێیە نەبوایە تا ڕۆژی قیامەت دەمایەوە.

هەموو ئەم تێڕوانینانە بەس نەبوو، بەڵکو گرێپێدانی ئیمان لەگەڵ کردار گڕێ و دەزولەی نوورەکەی لە تاریکیدا دەکاتە بڵێسەی ئاگر و مەشخەڵی ڕێگا تا تاریکییەکان بە گشتی ڕووناک بکاتەوە.

هیوا دەستی پێ کرد، دارێک لە پڕ دەرکەوت پڕ لە گەڵا و سێبەرێک کە پارێزەرە بۆ حەزرەتی (یونس) لە گەرمای پڕ خۆری سوتێنەر، دارێک لە ( یەقطین) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿۞ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ﴿١٤٦﴾﴾ الصافات

واتە: خوای گەورە فەرمانی کرد بە نەهەنگەکە لە دەمییەوە فڕێی دایە دەشت و شوێنێکی چۆڵەوە کە هیچ ڕووەکی لێنەبوو، لاواز و نەخۆش بوو جلوبەرگی لەبەردا نەمابوو﴿١٤٥﴾ دارێکمان بۆی ڕرواند کە سێبەری بۆ بکات﴿١٤٦﴾

وانەیەکە کە مرۆڤ لە نائومێدی و بێ هیوای دەردەکات لە بیابانێکی وشک و گەرمدا، هیوا دەڕوێنێت لە ناخی (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) دا هەروەکو ئەو دارە لەو جێگایەدا لە بڕیاری گۆڕانکاری حەزرەتی (یونس) (عَلَيْهِ السَّلَامُ)، تەنها ڕزگاربوون نەبوو لە سکی حوت و تاریکی ناو دەریا و سەوز بوونی دارێک لە نەخۆشی لاشەیی و فیکری، بەڵکو دیارییەکی گەورەتری پێشکەش کرا کە بە

سەدان هەزار کەس گەڕانەوە بۆ دینی خوای موتەعال: ﴿وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ﴾ الصافات

واتە: پاشان ناردمان بۆ لای خەڵکی (نەینەوا) کە سەد هەزار کەس یاخود زیاتر بوون

هەر (یونس) بوو ( نەینەوا)ی جێ هێشت بەبێ هیوایی، بەڵام سکی حوتەکە ئەزمونێکی نوێ بوو. (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) بە یادی خوا ئەوەی نەدەکرا زۆر بە ئاسانی ڕوویدا، بە مرۆڤێکی جیاوازتر هاتە دەرەوە ئەگەر نەبوایە تا ڕۆژی قیامەت دەمایەوە لەو جێگایەدا، ئەزموونەکە بۆ پێغەمبەر محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

## بە تەنها چیم پێ دەکرێت؟

پێغەمبەری خۆشەویست صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە شاری مەککە لە سەختترین کاتەکانی بانگەوازی، وەحی بۆ دێت لەسەر حەزرەتی (یونس)، لە بەرانبەر ئەزمونی قوڕەیشی لاشە زل و زەبەلاح دا کە دژی حەزرەتی محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەستابوونەوە.

هێزی ئابووری قوڕەیش کە وەکو نەهەنگی زەبەلاح و ماسی (قرش) دانەکانی وەکو مشار دژی بانگەوازی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بوو، هاوپەیمانی عەشایەری ناو نیوەدوورگەی عەرەب و خودی قوڕەیش، نەهەنگێکی زۆر زەبەلاح تر بوو لە نەهەنگ (قرش)ی ئابووری، هیچ بوارێکی بۆ بانگەوازی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەهێشتبووەوە.

بێجگە ئابووری و هاوپەیمانی عەشایەری (٣٦٠) بت لە کەعبەدا بوو، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەیویست هەمووی لەناو بەرێت بۆ هەتا هەتایە.

بێجگە هەموو ئەم ئاستەنگ و لەمپەڕانە لە بەردەم پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دا، یاسا و عورفی جاهیلی قوڕەیش هیچ کات نەیدەهێشت تاکە کەسێک لە عورف و یاسا و کلتوریان دەربچێت، جا هەر کەسێک بێت لە هەر عەشیرەتێک، بگرە خودی عەشیرەتەکەش پشتی تێ دەکرد.

ئەو تاک کەسەش نەیدەتوانی لەو بیابانەدا بە تەنها بژی، مانەوەت داوای گوێڕایەڵی و سەر داخستنی لێ دەکردی، نەتکردایە ژیانت نەماوە، زۆرن لەوانەی کە لە چوارچێوەی عەشایەری عەرەب دەرچوون لەناوچوون و مردن و هیچ جێگا و مەکانەتیان نەما لە ناو کۆمەڵگەی عەرەبدا و پوکانەوە، قورسای لەو کۆمەڵگەیەدا بۆ تاکە کەس تەنها گوێڕایەڵییە.

لە هەمووی نا هەموارتر ڕۆڵی شاعیر و کاسەلێس و ماستاوچییەکانی ئەو سەردەمە بوون کە سەریان دەکرد بە هەموو دۆڵێکدا بۆ ئەوەی گەورە ورگ زلەکانی قوڕەیش ڕازی بکەن: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ﴾ الشعراء

واتە: ئایا نابینی ئەوان لە هەموو دۆڵێکدا قسە ئەکەن و ڕۆئەچن

لە هەمووی سەخت تر عەرەب خاوەنی پەرتووکی ئاسمانی نەبووە، ئەدەبیاتی وەحی و پێغەمبەرایەتییان نەدەزانی چییە، وەک یەهود و نەسارا بوون، لە هەموو ژیانیاندا لە مێژووی عەرەبدا لە دوای ئیسماعیل (عَلَيْهِ السَّلَامُ) پێغەمبەرێکیان نەبووە بێجگە حەزرەتی محمد .صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە بەرامبەر ئەم هەموو لەمپەرەدا داخۆ لە تواناياندایە چی بکات؟!

پاشان کۆمەڵێک کلتوری کۆمەڵایەتی نارەوشتی لە ناو عەرەبدا هەبوون، زینا و ڕیبا و زیندەبەچاڵ کردنی کچان و فرۆشتنی خەڵکی هەروا بە هەرەمەکی و پڕ بوو لە زوڵم و داخۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەو پرسیارەی کرد بێت وەکو (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) بە تەنها چیم پێ دەکرێ؟!

پێغەمبەر محمدی مەککی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەو قۆناغەدا زۆر سەختی ڕووبەڕوو بوویەوە، هەموو ئەو بەرپرسیاریەتیانە کەوتە سەرشانی ئەم پیاوە نەجیبە سالارە بەڕێزە، دەبوو وەکو خشت و بلۆکی بونیاد لەم کۆمەڵگە دارماوە وشک و ڕەقە بونیادی بنێت و خشت لەسەر خشت بەڕێکی دیواری دروست بکات، گۆڕانکاری بنەڕەتی بکات. ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مرۆڤە وەکو هەموو مرۆڤەکانی تر خاوەن هەست و نەست و شعور و سۆز و عاطیفەیە.

تۆ بڵێیت وەکو (یونس)ی پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە بەرپرسیارێتی هەڵبێت بە خۆی و وەحییەکەیەوە، بەڵێ لەوەدابوو کە محمد پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تووشی هەمان نائومێدی ببێت و بڕوات و ئەو کۆمەڵگەیە بەجێی بهێڵێت، بەڵام خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ﴾ القلم

واتە: ئەی محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تۆ ئارام بگرە بۆ حوکم و بڕیاری پەروەردگارت لەسەر ئازاردانی نەتەوەکەت، تۆ وەکو (یونس)ی هاوەڵی نەهەنگەکە مەبە کە لە قەومەکەی تووڕەبوو بەجێی هێشتن و دواتر لەناو دەریاکە نەهەنگەکە قوتیدا و دواتر لەناو سکی نەهەنگەکە داوای

لێخۆشبوونی لە خوای گەورە کرد و خوای گەورە فەرمانی بە نەهەنگەکە کرد فڕێی دایە دەرەوە، کە ئەم دواتر غەم و پەژارە و خەفەتی خوارد، یاخود لەناو سکی نەهەنگەکەدا بەند کرا[18]

سێ تێبینی لەسەر باسکردنی حەزرەتی (یونس) و مەکانەتی لە گوتاری قورئانی دا، کە پانتاییەکی یەکجار فراوانی لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ داگیر کردووە، پەیوەستی زۆری هەیە بە ژیانی پێغەمبەری خوا محمد ﷺ.

تێبینی یەکەم: ئەگەر تەماشای پلەبەندی بکەین لە ژیانی پێغەمبەران دەبینین باسی یەکەم پێغەمبەر کە دابەزیوە پێش حەزرەتی ئیبراهیم حەزرەتی (یونس)-ە، لە ڕاستیدا جێگای تێبینیە پێش حەزرەتی ئیبراهیم کە خاوەنی ئایینی حەنەفیە و پێش حەزرەتی (موسا)، کە پانتاییەکی زۆری داگیر کردووە لە قورئاندا، یەکەم ژیانی پێغەمبەری (یونس) (عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ)-ە، کە عەرەب هەر ناوی نەبیستوە، یان بە هاوەڵی نەهەنگ یان خاوەن نەهەنگەکە ناوی هاتووە (صَاحِبِ ٱلْحُوتِ)، ئەمەش میحوەری سەرەکی باری دەروونی پێغەمبەری خوا ﷺ دەست نیشان دەکات و دەیوەستێنێت لە بەردەم بەرپرسیاریەتێکی زۆر گەورەدا، کە ژیانی ئەم پێغەمبەرە بەرێزە چەندین بواری ئەرێنی لەخۆ گرتووە، ئەویش ڕووبەڕووبوونەوەی نائومێدی و بێ هیوایی پاشان توانای گۆڕانکاری و لە هەمانکاتدا کارکردن، ئەگەر یەک مرۆڤیش بێت کە لە ناوەڕۆکیدا پڕیەتی لە ڕۆحی بەرەنگاری و ڕووبەڕووبوونەوە، ئەویش بە دوو شێوە کە بریتییە لە:

شێوەی یەکەم: ڕووبەڕووبوونەوەی ترس و نائومێدی و بێ هیوایی نەتوانینی چارەسەرکردنی بە واتای کۆتایی نییە و هەمیشە مرۆڤ دەتوانێت خاڵ دابنێن و بگەڕێتەوە بۆ سەری دێڕ، هەندێک کار کە چارەسەر نابێت لە زەمەنێکدا واتا کۆتای دنیا نییە، هیوای تر زۆرە و پلانی تر هەیە ئەوەش حاڵەتێکی زۆر ئاساییە، هەموو کەس پێیدا تێپەڕ دەبێت، پێغەمبەرانن یان بانگخوازانن یاخود سیاسی و بیرمەند و خەڵکی ئاسایی، جا پەیوەندی هەیە بە گۆڕانکاری کۆمەڵگە و سیاسەت لە حوکم و دەسەڵات یان ژیانی تایبەت بە کەسەکە.

شێوەی دووەم: گرنگە مرۆڤ بەو قەیرانانەدا تێپەڕێت، تێپەڕێت لە ناو ئومێدی و ناڕەحەتی و بێ هیوایی، دەرچوون لە سکی حوت بە دیدێکی نوێ و بە دنیا بینییەکی نوێ و بە ئیمانێکی نوێ هەروەکو چۆن حەزرەتی (یونس عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) کردی، کە زیاد لە سەدان هەزار کەس گەڕانەوە، خۆ ئەگەر ئەو دیدە نوێ و بیرەڕوونی و گۆڕانکارییە نەبوایە تا ڕۆژی قیامەت لە سکی حوتەکەدا دەمایەوە.

تێبینی دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ، پاش هاتنی ژیانی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە لە چەند بۆنەیەکدا، کە سی و نۆ ڕێگای جیاواز ئەو فەرموودەیەی باس کردووە و دەفەرموێت و ئاشکرای

دەکات ( کە هیچ فەزڵ و پلەیەکی زیادەی نیە لە (یونس)ی کوڕی مەتا)، تەنانەت لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە هیچ کەس نەڵێت محمد ﷺ باشترە لە (یونس) (عَلَيْهِ السَّلَامُ).[53]

هەروەها بە شێوەیەکی تریش هەر لە بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: بۆ هیچ کەس نییە بڵێت کە گوایە من ( واتا پێغەمبەر) باشترە لە (یونس)ی کوڕی مەتا.[54]

ئەم فەرموودانە لە ڕێگای سێ هاوەڵەوە ڕیوایەت کراوە، عەبدوڵڵای کوڕی جابر، ئیبن عباس، ئەبو هورەیرە، کە بە سی و نۆ ڕێگا لە کتێبی فەرموودەکاندا هاتووە.

زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەمان هەست و نەستی (یونس) دا تێپەڕ بووە، بەو واتایەی کە (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) هەڵهات و وازی لە بانگەوازی هێنا، باش درکی بە ئازار و ناڕەحەتییەکان کرد بوو پێغەمبەر ﷺ، چونکە زۆر نەمابوو لەگەڵ خۆیدا دووبارە بێتەوە، ئەویش هەڵبێت لە تاو ئازار و ئەشکەنجەی قوڕەیش تا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾﴾ القلم

واتە: ئەی محمد ﷺ تۆ ئارام بگرە بۆ حوکم و بڕیاری پەروەردگارت لەسەر ئازاردانی نەتەوەکەت، تۆ وەکو (یونس)ی هاوەڵی نەهەنگەکە مەبە کە لە قەومەکەی تووڕەبوو بەجێی هێشتن و دواتر لەناو دەریاکە نەهەنگەکە قوتیدا، دواتر لەناو سکی نەهەنگەکە داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە کرد و خوای گەورە فەرمانی بە نەهەنگەکە کرد فڕێی دایە دەرەوە، کە ئەم دواتر غەم و پەژارەو خەفەتی خوارد، یاخود لەناو سکی نەهەنگەکەدا بەند کرا﴿٤٨﴾

بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە دوایدا ڕوە و درەختەکە دەڕۆیشت کە سێبەری هیوا بوو تا ڕزگاری بێت لە سکی حوتی قوڕەیش و تاریکی جاهیلی.

تێبینی سێیەم: لە ژیانی سیرەتی موبارەکی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر لێکچوونیان هەیە، لەگەڵ حەزرەتی (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) دا، لە شەوەزەنگی جاهیلی ناو قوڕەیش دا کە هاوشێوەی سکی حوتەکەی (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) بوو.

کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ طائیف، لەوێ نەک خەڵکی پێشوازییان لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکرد، بەڵکو گاڵتەیان پێ دەکرد، لەویش خراپ بەرد بارانیان کرد. سەختترین کاتی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە وەفاتی خەدیجەی هاوسەری و مامی ئەبو طالیب بوو، لە دوای ئەو بەرد بارانکردنە کە زۆر ئازار درا لە شاری طائیف، چووە نزیک ڕەزە باخێک تا پشو بدات و لە دەستی بەردبارانی خەڵکی طائیف ڕزگاری بێت، لەوکاتەی پشوو

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[53] مَن قال: أنا خَيْرٌ مِن يُونُسَ بنِ مَتَّى، فقَدْ كَذَبَ/ صحيح البخاري.

[54]- من قال أنا خيرٌ من يونسَ بنِ مَتَّى ، فقد كذَبَ/ أخرجه البخاري، رقم ٤٦٠٤.

ئەدات لاوێک بە هێشوە ترێیەک دێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و هێشوە ترێکە پێشکەش بە پێغەمبەر ﷺ دەکات، هیوایەکە لە کاتی بەرد بارانکردنەکەدا لەوکاتە هێشوە ترێ بێت، ئومێد و هیوا بەخشییە، پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕووداوی (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە بەرچاودایە کە خوای موتەعال دەفەرموێت: { وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ }

کەسەکە هێشوە ترێ یەکەی بۆ هێناوە، نەسرانییە و خزمەتکاری دوو دەوڵەمەندی شاری مەککەیە، بەڵام کار دەکات لە باخێک لە نزیک طائیف، دەوڵەمەندەکان ناسراون بە عوتبە و شەیبیەی کوڕانی ڕەبیعە، خزمەتکارەکە ترێیەکەی دایە دەستی پێغەمبەر ﷺ، ڕاستەوخۆ پێغەمبەری خوا ﷺ پرسی خەڵکی کوێیت؟ (بۆ ئەوەی بواری قسەکردن بکاتەوە، بانگەوازی بکات) فەرمووی: خەڵکی کام خاکیت ئەی عەواس؟ چونکە لە کاتی هێنانی ترێکەدا خۆی ناساند بە پێغەمبەری خوا ﷺ، عەواس وتی: خاکی (نەینەوا). ئینجا پێغەمبەر ﷺ دیسانەوە بیری کەوتەوە کە تووشی نائومێدی بێ هیوای نەبێت، فەرمووی خاکی ئەو پیاو چاکەی کە ناوی (یونس)ی کوڕی مەتایە، تا کۆتایی ڕووداوەکە.

هەمان واقیعە ڕوو ئەداتەوە لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ دا لە جێگایەکی تردا، چونکە ڕووداوەکان زۆر لەیەکەوە نزیکن ( ترێ کە پێوەر بکەین بەدارە یەقطینەکە، دەرچوون لە دەمی حوتەکەدا یان سکی حوتەکەدا کە (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) کاتێکی کەمی پێچوو، پێغەمبەری خواش ﷺ لە طائیف زۆر کەمی برد هەمووی سێ شەوڕۆژی پێچوو دوای ئەوە بەرد باران کرا، پاشان دوای ئەوەش زۆری نەبرد سەدان هەزار کەس بوونە هاوەڵی پێغەمبەر و سەدان هەزاری تریش موسوڵمان بوون، هەر ئەوەندە عەواس لە شانۆی ڕووداوەکاندا دەردەکەوێت و دوای ئەوە بۆ هەتا هەتای ون دەبێت.

## لە پەراوێزی زیاتری ڕووداوەکاندا

ئەگەر تەماشای سیرەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بە چاوێکی گوتاری قورئانی سوننەتی موبارەکی بکەین، هەست بەو ئاوێتە بوونە دەکەین لە ژیانی (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) دا، بەڵام بە شێوەیەکی نوێ و مۆدێرنە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو هەنگاوێکیدا ئەزموونی پێغەمبەران و گەلانی ڕابردوو بە چاکە و خراپەیانەوە لەبەر چاوی دابووە و بە وەحی ئاراستەش دەکرا.

لەگەڵ ئەو دیدە واقعییە پێغەمبەر ﷺ بۆ ژیان و گەردوون مرۆڤ، کە خوای گەورە بە گوتاری قورئانی گۆشی دەکرد و پەروەردە دەبوو لە گەڵیدا و چرکە بە چرکەی ساتەکانی ڕوشد[55]ی زیاتر دەبوو، ڕوشدی پێغەمبەری خوا ڕۆژ بە ڕۆژ پرتر دەبوو

لەهەموو ئەم باسانە گرنگتر ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێت بە چاوی ( مرۆڤ) بوونی تەماشای بکەین، چونکە بیروباوەڕی کۆن و کلاسیکی و ( تەقلیدی) زۆر جار پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو ( لاهوتینک) کە نەسرانییەکان تێکەڵاوی بیروباوەڕیان، بەو شێوەیەش خەڵکێکی زۆر تەماشای پێغەمبەر ﷺ-ی پێ دەکات، پێغەمبەر محمد ﷺ ناسنامەی مرۆڤ بوونی ون نەبووە، بەڵکو لە هەموو کات و سات و کاتەکاندا خوای گەورە لە گوتاری قورئانیدا دەست نیشانی ئەو ناسنامە مرۆڤ بوونەی کە پێغەمبەر ﷺ -مان بۆ دەکات و جوانترین وشە لە بەندایەتی و لە مەیدانیدا لە پێغەمبەری خوا ﷺ جەختی لەسەر کردۆتەوە وشەی (بە بەندە بوونی خوایە) (عبده ورسوله)، هیچ زیادە ڕەویەک بۆ ژیانی پێغەمبەری خواش ﷺ لە لایەن زانایانی سونەتەوە نەکراوە، بەڵکو هەمیشە حەقیقەتی ناسنامەی مرۆڤ بوونی دەرخراوە.

زۆر گرنگە مرۆڤی موسوڵمان زۆر شانازی بە مرۆڤبوون و تەنانەت بە مرۆڤبوونی پێغەمبەر ﷺ -ەوە بکات، دەبێت ڕووداوەکان کە ڕوویانداوە لە ژیانی محمد پێغەمبەر ﷺ-ی مرۆڤدا، وەکو خۆی باسبکرێت کە ترسی هەبووە، تینووی بووە، ئازاری هەبووە...هتد، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە ماوەیەک وەحی دوا کەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی خۆی بکوژێت، ئەمەش لە فەرموودەکانی بوخاریدا هاتووە کە ویستوویەتی لە شاخی بەرزەوە خۆی فڕێ بدا.

قَالَ الزُّهْرِيُّ فَأَخْبَرَنِي عُرْوَةُ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أَنَّهَا قَالَتْ : ... وَفَتَرَ الْوَحْيُ فَتْرَةً حَتَّى حَزِنَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا بَلَغَنَا حُزْنًا غَدَا مِنْهُ مِرَارًا كَيْ يَتَرَدَّى مِنْ رُءُوسِ شَوَاهِقِ الْجِبَالِ ، فَكُلَّمَا أَوْفَى بِذِرْوَةِ جَبَلٍ لِكَيْ يُلْقِيَ مِنْهُ نَفْسَهُ تَبَدَّى لَهُ جِبْرِيلُ فَقَالَ يَا مُحَمَّدُ إِنَّكَ رَسُولُ اللهِ حَقًّا ، فَيَسْكُنُ لِذَلِكَ جَأْشُهُ ، وَتَقِرُّ نَفْسُهُ ، فَيَرْجِعُ ؛ فَإِذَا طَالَتْ عَلَيْهِ فَتْرَةُ الْوَحْيِ غَدَا لِمِثْلِ ذَلِكَ ، فَإِذَا أَوْفَى بِذِرْوَةِ جَبَلٍ تَبَدَّى لَهُ جِبْرِيلُ فَقَالَ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ.[56]

ئەمە ڕاستیە، بگرە جێگای فەخر و شانازی ئێمەی موسوڵمانە، ئەمە بەڵگەی ژیانی پێغەمبەرایەتی ئەو پێغەمبەرە ئاشکرا دەکات، ڕاستگۆیەتی لە گۆڕەپانی واقیعەکەی کە تێیدا ژیاوە، سەرقاڵ بووە بە وەحییەکە و هیچی لە بارەوە نەزانیوە سەرەتا ، ترساوە لەرز گرتوویەتی،

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[55]- وشەی (ڕوشد) بە واتای بەکارهێنانی زانستە کۆکراوەکانە لای مرۆڤ، کە چۆن لە دونیای واقیعدا بەکاری بهێنێت.

[56]- ژمارەی فەرموودەکە (٦٥٨١) البخاري.

حاشا وەکو مرۆڤی ساختەچی و درۆزن نەبووە، لە خۆیەوە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات، بەڵکو بە هەموو بونیادی مرۆڤ بوونی خۆی گەڕایەوە بزانێت ئەم وشە قورئانی و (إقرا) و جوبرەئیل و ئەشکەوتی (حیر) چین، ئەی ئەو دەنگەی لە ئاسمان هات وتی: محمد تۆ پێغەمبەری لەگەڵ ئەم هەموو دیاردە وەحیانەدا، هێشتا نازانێت چییە، بۆیە دڵ و دەروونی گوشراوە بە دوای وەڵامدا دەگەڕێت تا ئەو کاتەی ئادەم دەبێتەوە بە سورەتە قورئانییەکان و ئاوێتەی دەبێت و لە ژیانی پێغەمبەراندا ڕێگا و نەخشەی ڕاپەرین و هەڵسانەوە، دیاردەکان بۆ ئەو هەموو بارە دەروونیەیە، خوای موتەعال دەفەرموێت:

وەکو خاوەن حوتەکە، یان هاوڵی حوتەکە، یاخود ڕووداوی ئەو پێغەمبەرەی کە لەگەڵ حوتەکەدا ڕزگاری بوو، نەکەی وەکو ئەو بیت بێئومێد بیت بێ هیوا بیت ( ولا تكن)، خۆ دەکرا وەکو ئەو بیت هیچ نگییە نەبوو، بەڵام وەحی ئاگاداری دەکاتەوە و دەیپارێزێت (وَلَا تَكُنْ كَصَاحِبِ الْحُوتِ)، ئەمەش بە واتای پاراستنی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەوەی کە خاوەنی ( عیصمَەتە) و ( مەعصومە).

کەواتە محمد ﷺ وەکو (یونس) کە سەر لە نوێ گۆڕانکاری کردەوە لە تاریکی ناو سکی حوت و دەریاکە، دە تۆش خەڵکی لە سکی حوتی تاریکی و جاهیلی دەربهێنە بۆ ڕووناکی ئیمان و سێبەری شەریعەت، تا بە سەدان هەزار مرۆڤ شوێنی بکەون، ئەمەش ئاوێتەبوونی ڕووداوەکانی (یونس)ە لەگەڵ سیرەتی موبارەکی حەزرەتی محمد ﷺ.

## سەرەتای هەڵسانەوە لە ئەشکەوتەوە بۆ شارستانیەت

لە ئەشکەوتێکی بچووکەوە بۆ لوتکە، لە ئەشکەوتێکی تاریکەوە کە جێگای مرۆڤێک یان دوو مرۆڤی تێدا دەبێتەوە لە چیاکانی نزیک شاری مەککە لە مێژوودا پەراوێز خراوە، سەرەتای هەڵسانەوەیەکی نوێی شۆڕش و ڕاپەرینێک بوو لەو ئەشکەوتەوە ئاوەدانی شارستانیەت و ژیان دەستی پێ کرد.

لەوانەیە لاتان سەیر بێت، بەڵام ئەوەی باسی دەکەین لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ڕوویدا کە لە دە ساڵ تێپەڕی نەکرد، لە ئەشکەوتەوە بۆ فەتح، پاشان دەرگای فتوحاتی تریش کرایەوە کە زۆربەی وڵاتانی تر چوونە ناو باوەشی ئەو شارستانیەتە کە هەمووی سێ سەدەی خایاند.

ئەوەی کە جێگای سەرنجە زۆرینەی شۆڕش و ڕاپەرینەکانی دنیا لە ئەشکەوت و شاخەکانەوە سەری هەڵداوە بۆ هەڵسانەوەی، نموونەی یارانی ئەشکەوت، ئەشکەوتی ( ثور:سەور) کە لانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکر ڕەزامەندی خوای لیبێت بوو. شۆڕشەکانی تری کۆن نوێ لە شۆڕشی کورد، شۆڕشی ئەفغان...هتد.

ئەشکەوت بە واتای خۆ حەشاردان و دابڕان بۆ ماوەیەک لە دەست کۆمەڵگەی زاڵم و دەسەڵاتی زاڵمەکان، ئەم دیاردەیە کە ڕوویداوە لە ئەشکەوتەوە هەمیشە نوێگەری و شارستانیەتی بە دوای خۆیدا هێناوە، بەو مەرجەی ئەگەر بە قۆناغ و پلەبەندی سورەتی (الكهف) دا واتا ( ئەشکەوت) ڕۆشتبێت.

واتا دەستپێکی شۆڕش بە لاوەکان دەست پێدەکات کە قورئان ناوی ناون بە ( اليقينية) کە لاواز و بێ توانابوون بە بیرو باوەڕەکەیانەوە ڕایان کردە ناو ئەشکەوت و پاشان چووە قۆناغی وتوویژ لە نێوانی کافر و ئیماندا کە ڕووداوی دوو هاوڕێیەکە تەواوکەری قۆناغی دوای ئەشکەوتن، هاوڕێی یەکەم کافر خاوەنی سامان دەسەڵات و ماڵ و منداڵ و نفوزە، هاوڕێی چاکە خواز و ئیماندارە خاوەنی ئیمانی بەهێز و خواناسییە، پاشان قۆناغی دوای ژیانی (موسا)یە لە سایەی فیرعەونی زاڵم و خوێنڕێژ و دەسەڵاتداری سەردەمی خۆی، (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) سەرکردە و زەعیمی گەلەکەی خۆی، هەموویانی ڕزگار کرد لە دەستی فیرعەون و چووە خاکی (سیناء) بەرەو خاکی ( میعاد) کە چاوەڕوانیان دەکرد دەوڵەتی تیا دابمەزرێنێت. (یونس عَلَيْهِ السَّلَامُ) بوونی مامۆستایەک کە زانستی سەر وەرەقەی کردە واقیع ئەویش (خضر) بوو، لە دوایدا بەرەو شارستانیەت، هێز و توانای بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای سەردەم کە لە کەسایەتی (زولقەرنەین) دا باسکراوە.

## سورەتی الكهف( ئەشکەوت) هەفتانە

لە نێوان زانایانی فەرموودەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دا ڕای جیاواز هەیە لەسەر لاوازی فەرموودەکە، خوێندنی سورەتی الکهف هەیە لە ڕۆژانی هەینی دا بخوێندرێت، هەندێک دەڵێن فەرموودەکە لاوازە، هەندێکیش دەڵێن بە هۆکاری ڕێگای جیاوازی گێڕانەوەی فەرموودەکە گەیشتووە پلەی (حسن).

لێرەدا ئەوەی گرنگە لە ژیانی پێغەمبەری ئازیز صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و هەموو پێغەمبەرانی تریش بە قۆناغی سورەتی (الكهف) دا ڕۆیشتون، خودی سیرەتی موبارەکی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕێک بە قۆناغی ئەم سورەتەدا تێپەڕ بووە، کە سەرەتا خاوەنی بیروباوەڕبوون، هەرچەندە خودی ئایینەکە لە ئەشکەوتی (حیڕ) دەستی پێ کردووە، ئەم ئەشکەوتە کە لە سیرەت و قورئاندا لەگەڵماندا دووبارە دەبنەوە، هەروا باسێکی سادە و ساکار نییە، بەڵکو مەدلولاتی تایبەتی خۆی هەیە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هاوەڵانی پەروەردە کرد لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی، بەڵام هەر لە سەرەتاوە زۆربەیانی نارد بۆ حەبەشە بۆ پاراستنی پرۆژەی ( تەوحید)، پاشان خۆشی تەشریفی برد بۆ شاری مەدینە، هەروەکو یارانی ئەشکەوت هەموو بە بیرو باوەڕەکانیانەوە هیجرەتیان کرد، پاشان لە شاری مەدینە هاوشێوەی دوو هاوڕێکە، کە یەکێکیان خاوەنی باخ و باخات بوو، هەمان ئەزموونی جوولەکە بوو لە شاری مەدینەدا دووبارە بووەوە، ئەوانیش

شانازیان بە باخ و باخات و هێزو دەسەڵاتیان دەکرد بە چەک و جبەخانەی زۆر هێزی سەربازیان دەنازن، ئینجا بە دوای خضر و (موسا) کە واتای گەیاندنی زانست بوو بە ڕوشد، (موسا) خاوەنی زانستی زۆر بوو بەڵام خضر خاوەنی ڕوشد بوو، بۆیە (موسا) داوای لێ کرد فێری ڕووشدی بکات.

﴿قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا٦٦﴾ الكهف

واتە: (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) پێی فەرموو: ئایا ڕێگام ئەدەی کە هاوەڵایەتیت بکەم و شوێنت بکەوم تا لەوەی کە خوای گەورە فێری کردوویت منیش فێر بکەی؟٦٦

پێغەمبەری خواش صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ هاوەڵاندا هەموو زانستیان کردە ڕوشد و لە مەیدانی واقیعدا چەسپاندیان، چونکە زانست لەسەر کاغەز و کتێب دا نییە، گرنگی ئەو زانستە ئەوەیە کە کاری پێبکرێت، ئەوەش واتای ڕوشد.

زولقەرنین ئەو دەزگا دەوڵەتییە گرنگانەیە کە (سەردەمی یاسا) دەپارێزێت دەزگای ئەمن و ئاسایش و پاشان دەزگا و وەزارەتی ئاوەدانی و خزمەتگوزاری فەراهەم دێنێت بۆ خەڵکی، خودی خەڵکەکەش بەشداری پێ دەکات لەگەڵ دەسەڵاتدا هەموو دەبنە بەشێک لە حوکمەتەکەدا.

پوختەی باس:

خوێندنەوەی سورەتی الكهف لە هەموو هەفتەیەکدا ئاماژەیە بۆ ئەو نەخشە ڕێگایە کە پرۆژەی دامەزراندنی بیروباوەڕ ڕووبەڕووبونەوە و کارکردن لە مەیدان تا دامەزراندنی دەوڵەت و پەسندنکردنی شەریعەت.

هەموو ئەمانەی کە پلە بەندی و ڕێکخستنی کاری شارستانیەتی بوو کە وشەی ژیار و شارستانیەتی دەشێت هەمووی لە وشەی ( الأمة) دا کۆ بێتەوە و کۆتا بونیادنانەو جێبەجێکردنی ئەو خەلیفایەتییەیە کە خوای موتەعال داوای کردووە یان تەمکینی گشتی.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئاوێتەی گوتارە قورئانییەکان بووبوو کە لە چوار چێوەی ژیان و ڕووداوەکاندا دەردەکەوێت، ئەوەی کە زۆرێک لە کورد ناوی ناوە ( چیرۆکە قورئانییەکان) کە لە ڕاستیدا چیرۆک و حیکایەت نییە، وەکو لە ( کتێبی مەملەکەتی قورئان) لێکۆڵینەوەی جددیمان کردووە بۆ ئەو پرسە.

کەواتە ژیانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە دوای باس و پرسەکانی کە وەکو مێژوو بۆ ئوممەتەکەی گێڕاوەتەوە، جا بە هۆکار بێت واتا بۆ هۆکارێک دابەزبێت یاخود بێ هۆکار،

تایبەت بێت بە گشتی، هەرگیز بە یەک ڕوودا ڕاڤە ناکرێت، بەڵکو چەندین ڕووی جیاوازی سیاسی، فیکری، کۆمەڵایەتی، ئابووری، ئاکار و ڕەوشتەکانی تێدا بەدی دەکرێت و خوێندنەوەی یەکجار زۆر هەڵدەگرێت، هەر دەبێت واش بێت، چونکە بۆ ژیانی پێغەمبەر ﷺ هاتووە و هەمووی وەحییە و ئاراستەی خوای پەروەردگارە.

## قۆناغی مەدینە و ڕووداوەکان لەگەڵ پێغەمبەراندا

چەند مێژوویەکی کۆنی پێغەمبەرانی ڕابردوو لە سەر ئەزموونی قۆناغی مەککی ئاماژەمان پێداوە، لێرەوە لە دوای هیجرەتی، باسەکان و پرسەکان جیاواز تر دەردەکەون لە قۆناغی مەدینەدا، قۆناغی مەدینە کە واتای سیرەتی موبارەکی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە شاری مەدینە ئەمەش دوو خاڵی گرنگی وەردەگرێت لە قۆناغی مەدینە جیاواز ترە لە قۆناغی مەککی لە ڕووی پرس و دیاردە و تەنانەت جۆری گوتاری قورئانی و خودی هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەککە زیاتر ئارامگر و خۆ لادان لە جەنگ و پاراستنی تاکەکانی ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی و پاشان پەروەردە بە بیرو باوەڕی ڕەسەن کە ( تەوحیدە)، لە مەدینە دامەزراندنی دەسەڵات و دەوڵەت و سوپا و هێز و کاری خزمەتگوزاییە، بونیادنانە و داڕشتنی یاسا و بنەماکانی شەریعەت بە وەحی..هتد.

لە قۆناغی مەککەدا، یاسر و سومەییە شەهید دەکرێن، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ دەفەرموێت (ئارامبگرن ئەی خانەوادەی یاسر جێگاتان بەهەشتە)

هەر هەمان پێغەمبەرە بۆ دەست درێژی کردنە سەر ئافرەتێک و کوشتنی پیاوێکی ئیماندار سوپا دەکاتە سەر جوولەکە و لە گەڕەکی بەنو قەینوقاع لە ناو شاری مەدینەدا دەریان دەکات.

قۆناغەکان گۆڕانکاری تەواویان بەسەردا هاتووە، هەر هەمان پێغەمبەر بوو هانی موسوڵمانانی ئەدا کە کۆچ بکەن و لەگەڵ قوڕەیش تێکنەگیرێن بە هیچ شێوەیەک ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ قوڕەیش ڕوو نەدات لە شاری مەککەدا.

هەر هەمان پێغەمبەرە سوپا ئامادە دەکات لە جەنگی بەدردا، زۆرینەی سەرکردەکانی قوڕەیش دەکوژێت و بەدیل دەیانگرێت.

لێرەدا خودی پێغەمبەری نازدار ﷺ ژیانی ئاوێتەی ناو ژیانی هەندێک پێغەمبەری تر دەبێت کە جیاوازتر لە پێغەمبەرانی ئاراستەکراوی وەحی لە شاری مەککە. لێرەدا پێغەمبەرانی خاوەنی دەسەڵات دەردەکەون وەکو (موسا) و (عیسا) و (داوود) و سلێمان ...هتد دێنە ناو گۆڕەپانی ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

## پێغەمبەر (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) و پێغەمبەر محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

کۆچی حەزرەتی (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) لە دەستی فیرعەونی میسر و، کۆچی حەزرەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە دەستی فیرعەونەکانی قورەیش، هەمان ئاوێتەبوونە کە لە سیرەتی موبارەکی دووبارە دەبێتەوە، جەنابی (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بۆ شاری ( مەدیەن) پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بۆ شاری (مەدینە)، هەروەها ساڵەکانیان کە هاوشێوەیە، جا چ بۆ فەتح بێت یان بۆ کۆتایی پەیامەکەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەروەکو چۆن پەیامی (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) کۆتایی هات لە ڕزگارکردنی گەلی ئیسرائیل، واتای کۆتای بە واتای ئەنجامدانی کارە سەرەکییەکەیان.

بانگەوازی هەر بەردەوام بووە و خودی پەیامەکان بوونیان هەبووە تا کۆتاییەکەی قورئان هەموو پەیامەکانی تری لە خۆ گرتووە، کۆتایی بە ئەحکام و شەریعەتی پێغەمبەرانی ڕابردوو هاتووە.

پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چووە شاری مەدینە و هەروەکو چۆن یەکەم کاری (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) دروستکردنی جێگا بوو بۆ بەندایەتی و کۆبوونەوە کە لە ناو ئەدەبیاتی یەهوود دا بە (خێمە)ی کۆ بوونەوەکان ناسراوە، پێغەمبەری خواش صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ یەکەم کاری دروست کردنی مزگەوت بوو، جا چ لە قوباء بوو بێت، پاشان لە شاری مەدینەدا.

گەلی ئیسرائیل گەلێکی گوێرایەڵ نەبوون، هەروەکو چۆن ئەعراب لە دەورو پشتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دا گوێرایەڵ نەبوون، بە واتای ئەوەی نەدەهاتنە چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، گەلی ئیسرائیلیش بە هیچ شێوەیەک فەرمانی پێغەمبەرەکانیان جێبەجێ نەدەکرد کە فەرمان و وەحی خوای موتەعال بوو.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەوڵەتی دامەزراند و سوپای ڕێکخست، ئەزموونی ساڵی (تیبە) خستییە پێش چاو، ئەوان هیچیان بۆ نەکرا چونکە گوێرایەڵ نەبوون لە ساڵانێکی بەتاڵدا دەسوڕانەوە بۆ ماوەی چل ساڵ تا سەر لە نوێ لانی کەم دوو جیل پێگەیشتن، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و هاوەڵان ڕێک پێچەوانەی گەلی ئیسرائیلیان کرد، بە ئەزموونی خراپەکاری ئەوان بە تایبەت لە سورەتی (البقرة)-دا کە لەسەرەتای شاری مەدینە دابەزی کە گەورەترین سورەتی قورئانە جا درێژترین، چونکە گەورەترین و پیرۆزترین ئایەتی لە خۆ گرتوە کە ئایەتە لکورسییە.

بەردەوام هەموو ئەزموونی ئەوانی دەخستە بەرچاویان، هاوەڵانی پێغەمبەریش صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێچەوانەی گەلی ئیسرائیل کاریان دەکرد و بانگەوازیان دەکرد.

## سورەتی دەوڵەت (البقرة)

زۆرێک لە بیرمەندانی نوێی ئیسلامی سورەتی البقرة ناوزەد کردووە بە پاشگرێکی تر بە ناوی سورەتی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی لە شاری مەدینەدا.

لە شاری مەدینەدا و بە تایبەت لە دەورو پشتیدا گەورەترین کۆمەڵگەی یەهوودی هەبوون لە جیهاندا، هەموو یەهوودی جیهانی لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺدا، بێدەسەڵات و چەوساوە بوون لە هەموو جێگاکانی دنیادا، بێجگە شاری مەدینە و ناوچەی ( فەدەک و خەیبەر) کە زۆرترین کۆمەڵەی یەهوودی بوون و دەسەڵاتی تەواو ڕەهایان هەبوو لەناوچەکەدا، خۆ ئەگەر لە شاری مەدینەدا دەسەڵاتی تەواو ڕەهایان نەبوو بێت، بەسەر دوو هۆزی ئەو شارەدا کە ناویان ( ئەوس و خەزرەج) بوو، بەڵام ناڕاستەوخۆ دەسەڵاتی بڕیار و بیرکردنەوەی ئەو دوو هۆزە لە دەستی یەهوودی مەدینەدا بوون، بەڵام ناوچەکانی فەدەک و خەیبەر هیچی کەمتر نەبوو لە شاری مەککە و مەدینە و طائیف!

هەرچی یەهوود هەبوو لە کۆمەڵگەکانی فارس و ڕۆم دا زۆر چەوساوەبوون لە لایەن ئایینەکانی نەسرانی و مەجوسی یەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺهاتە شاری مەدینە و دەوڵەتی دامەزراند وەکو هاوڵاتی و هاونیشتمانی تەماشاکران لە دەوڵەتەکەدا واتا وا دانراون کە بەشێکن لە دەوڵەتی ئیسلامی، تەنانەت بە ئەهلی (زیمەش) سەیر نەکران، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەستووری وڵاتدا ئەرک و مافی بۆ دیاریکردن هاوشێوەی ئیمانداران، ( جزیە) یان لێ وەرنەگیرا، بە پێچەوانەی هەموو دەسەڵاتەکانی ڕابردوو، بەڵام ئەوان بوونە شەیتان و لەگەڵ پلەی شەیتانی یەهوود، کافریش بوون.

لە بەر ئەوەی بێجگە لەکافر بوونیان، هێزێکی تریان پێکهێنا لە بەناوی مونافیقەکان کە لە دوای جەنگی بەدر دروست بوون، بە هەموو شێوەیەک پاڵپشتی دەکران لە لایەن یەهوودی ناوچەکەوە.

سورەتی البقرة دابەزی جۆری مرۆڤەکانی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺڕوون کردەوە کە سێ جۆرن (موسڵمان- کافر- مونافیق) ئەوەی خستە پێش چاوی موسڵمانان کە زۆر ئومێد و هیوایان بە یەهوود نەبێ کە گوێڕایەڵ بن و هیوای موسڵمان بوونیان لێ بکرێت، هەموو هاوەڵان ئەو هیوا و ئومێدەیان هەبوو، تەنانەت خودی پێغەمبەری خواش ﷺهەمان هیوا و ئومێدی هەبوو کە یەهوود زۆر موسڵمان دەبن، بەو پێوەرەی کە هەردوو لا خاوەن پەرتووکی ئاسمانی و یەک ڕووگەن ( قیبلە) کە ئەو دەمە بۆ ماوەی ساڵێک و چەند مانگێک هاوقیبلە بوون.

پاشان قورئان هەرچی نارەحەتی و ئازار و ئەشکەنجەی پێغەمبەرانی گەلی ئیسرائیل ئاشکرا دەکات لە سورەتی (البقرةدا) کە بە دەستی گەلی ئیسرائیل چەشتوویانە، هەموو ئەزموونیان دەخاتە بەرچاوی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی ڕەزامەندی خوایان لێبێت، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو هاوەڵانی کرد بە برا لە نێوانی موجاهید و ئەنساردا لەسەر بنەمای بیر و باوەڕە، فێری خۆشویستنی ڕاستەقینەیان دەکات.

یەهوود لەو ماوەیەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ بونیادی دەوڵەتەکەی دەکرد ئەوان لە هەوڵی تێکدان و لەمپەر خستنە بەردەم ئەو دەوڵەتە بوون، هەمیشە هاوپەیمانیان دژی موسڵمانان و خودی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبەست لەگەڵ دوژمنەکانیاندا، چەندین جەنگیان بەرپا کرد کە بە زەررو زیان لەسەر خۆیان کۆتایی هات و تەواو بوو، لە بەناوبانگترینیان جەنگی ( خەندەق) و جەنگی (خەیبەر) بوو، تەنانەت بەشدار بوون لە خودی پلان داڕشتن بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ تیرۆر بکەن، لە بەناوبانگترین سەرکردەکانیان حوییەی کوڕی ئەخطەب، سەلامی کوڕی موشارەم، کەعبی کوڕی ئەشرەف.

### ڕووداوی مانگاکەی گەلی ئیسرائیل لە سیرەتی پێغەمبەرمان دا ﷺ

خوای موتەعال درێژترین سورەتی بە ناوی مانگاوەوە (البقرة) ناو ناوە کە گرنگی لە ناوی مانگادا نییە یان خودی مانگادا، بەڵکو گرنگی لە ڕووداوی سەر بڕینی مانگایەکدایە کە دەکرێتە قوربانی بۆ خوای موتەعال، کە لە باسەکانی ڕابردوودا و لە جێگای خۆیدا بە درێژی ڕوونمان کردۆتەوە.

ئەم ڕووداوە بە واتای ئەوە نییە کە مرۆڤ نابێت زۆر پرسیار بکات، کە هەندێک بەو واتا ئاماژەی بۆ دەکات، بنەڕەتی پرسیار کردن کە ئیسلامی لە سەردامەزراوە بە خراپ و پاشان بەکردنی با چاکتر بزانرێت. لە ڕاستیدا ئەمە واتاکەی نییە، بەڵکو ئەوەمان فێر دەکات کە پرسیارکردن لە بوارێکدا نەکەین کە هیچ خێر و بێرێکی نییە.

نموونەی گەلی ئیسرائیل لەسەر ڕەنگ و جۆر و کوالیتی و مانگا پرسیاریان دەکرد کە ئەوان لەلایەن پێغەمبەرەکەیان ڕاسپێردرا بوون کە مانگایەک سەربڕن بۆ قوربانی، ئیتر هیچ پێویست نەبوو بەوەی کە ئەو هەموو پرسیارەی لەسەر بکەن.

موسڵمانانی وا فێر کرد کە بە دڵنیاییەوە پرسیار بکەن، بەڵام پرسیار نەکەن لە بواری لاوەکی کە هیچ، فەرمانێکی پێ نەکراوە، وەکو ئەوەی کە ئێستا دەبینرێت لە ناو ئوممەتی ئیسلامیدا لە کوێدا دەست بگرن، لە کوێدا پەنجە بجوڵێت یان نەجوڵێت، یان پرسیاری تر کە هیچ لە بوارەکانی عیبادەت و خواناسی ناگۆڕێت، یان پرسیارێک کە سوودی لێ وەرناگیرێت لەوەی ئەو

مێرووله نێر بوو یان مێ، یان سەگی یارانی ئەشکەوت ناوی چی بوو، زۆرێک هاوشێوەی ئەم پرسیارانە کە هیچ زانستێکی لە سەر بینا ناکرێت.

ڕووداوی مانگاکە بریتی بوو لەوەی کە موسڵمانان بەشتی لاوەکییەوە خۆیان سەرقاڵ نەکەن، بە بنەڕەتی پرسەکانەوە سەرقاڵ بن، تا بگەنە ئامانج و قۆناغی وەحی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، بڕیاری خوایی ڕۆژانەدا دابەزی، ئەگەر پرسیاری لاوەکییان بکردایە لە سەر خۆیان و ئوممەتەکەشیان سەخت دەکرد ئەو سورەتە و پرسی مانگاکە هاوەڵانی فێری پرسیاری جددی کرد.

## پرسیار کردن لە موعجیزە

لە ژیانی پێغەمبەراندا بە گشتی و شوێنکەوتوانیان، داوای موعجیزەیان لە پێغەمبەرەکانیان دەکرد، بە تایبەت حەزرەتی (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بە پێچەوانەی هاوەڵانی پێغەمبەر محمد ﷺ، ئەوانەی لەگەڵ (موسا)دا بوون خوای گەورە گەزۆی بۆ دەباراندن لەگەڵ گۆشتی برژاوی باڵندەکان، بەوەشەوە نەوەستان، داوای خەیار و پاقلە و نیسک و سیریان دەکرد!

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی هەڵکەندنی خەندەق دا هەبوو بەردی بەسکیەوە بەستبوو، کەچی ڕوویان نەدەهات داوای موعجیزەی خواردن بکەن، لە کاتێکدا پێغەمبەری نازدار ﷺ ئاگای لە حاڵ و گوزەرانیان بوو، هەر خودی پێغەمبەر دەگەڕا تا خودی جەنابیان لە موعجیزە تێریان بکات تا هاوەڵێک بەزەیی بە حاڵی پێغەمبەر ﷺدا هاتەوە زانی لە هەموو گەلەکەی برسی ترە، چووە ماڵەوە خواردنی بەشی دوو کەسیان هەبوو لە خۆیان زیاتر، بانگهێشتی پێغەمبەری خوا ﷺی کرد، پێغەمبەریش هەموو خەڵکی ناو خەندەقی بانگ کرد، بە ویستی خۆی و بە فەرمانی خوای موتەعال موعجیزەکە ڕوویدا، خەڵکی ناو خەندەق یان سوپاکەی ئەو ڕۆژە لە هەزار کەس تێپەڕی دەکرد، هەموو تێرو پڕیان خوارد لەو خواردنە.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چونکە خاوەنی قورئان بوون موعجیزەکە خۆیان بەدییان دەکرد و لەگەڵیدا دەژیان، هەزگیز بە بیریاندا نەدەهات داوای موعجزەی بەرجەستە لە پێغەمبەر ﷺ بکەن، ئەوان ئەقڵ و ڕۆح و قیامەتیان پڕ پڕ کردبوو لە وزەی وشەکانی قورئان، ئیتر بێ باک بوون لە داواکردنی موعجیزە.

موعجیزەی قورئان کاریگەری وای لەسەر دروستکردبوون هیوایان هەبوو کە هەمیشە سەرکەوتوون، یەقینیان لەسەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەر بۆ دروست بوو بوو لە کاتی ئەو ناڕەحە تییەدا کە ١٠ هەزار سەربازی کافر بۆیان کۆ بوونەوە، ئەوان بە ٣ هەزار سەربازەوە چاوەڕوانی سەرکەوتن بوون بەسەر قورەیش و یەهوودا، بەڵکو چاوەڕوان بوون جیهان بکەوێتە

بەر دەستیان، ئیمپراتۆریەتی فارس و ڕۆم و دەوڵەتانی تری وەکو یەمەن فەرمانڕەوایی بکەن، وەکو گەلی ئیسرائیل نەبوون بۆ بچووکترین کێشە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا جەنگ بکەن، بەڵکو گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بوون لە فەرمانی دەرنەدەچوون، لەوەش زیاتر بە جۆش و خرۆشەوە بوون بۆ سەرکەوتنی ئەم دینە کە پێغەمبەری خوا چاوەڕێی لێ دەکردن.

گەلی ئیسرائیل هیچ کارێکیان ئەنجام نەدا کە دڵخۆشی پێغەمبەرەکانیان بێت، بگرە خراپەکاریان دەکرد بەرانبەر دوو برای پێغەمبەر هاروون و (موسا)، کەچی پێغەمبەری خوا، هاوەڵەکانی دایک و باوکیان دەکردە قوربانی، ئەوەندە دڵسۆز بوون، بۆ تاڵێ مووی پێغەمبەر ﷺخەریک دەبوو شەڕ و لە نێوانیاندا جەنگ دروست بێت، بۆ ئاوی دەستنوێژی پاڵیان بە یەکترەوە دەنا، لە نێوانی خۆیاندا دەیانخەواند، لە ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشی بە پێغەمبەری نازدار ﷺ.

لە چوونی (موسا عليه السلام) بۆ موناجات لەگەڵ پەروەردگاری ئەوان گوێرەکەیان دروست کرد وەکو بت دەیانپەرست، پێغەمبەرێکیش ڕێگری دەکردن کەچی سەرپێچیان دەکرد، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺهاوەڵانی ناردە حەبەشە پاشای ئەو دەوڵەتەیان موسڵمان کرد، ( نەجاشی ئەصحەمی) ڕەحمەتی خوای لێبێت.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ قورئانیان لەبەر دەکرد و پیادەیان دەکرد، کەچی گەلی ئیسرائیل تەوراتیان ڕادەستی دوژمنەکانیان کرد و لە تابوتیان دانا، لە جەنگدا هەڵدەهاتن و خۆیان ئامادە نەدەکردەوە، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺلە جەنگدا ڕاستیان بکردایە خۆیان بۆ جەولەی دواتر ئامادە دەکردەوە.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺبە دوای شەهیدیدا دەگەڕان، گەلی ئیسرائیل حەزیان دەکرد هەزار ساڵ بژین لە مەرگ دەترسان، بەڵام هاوەڵانی پێغەمبەر محمد ﷺبە دوای مەرگدا دەگەڕان بۆیە تەمەنیان پڕ بەرەکەت بوو.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺبە قورئان یەقینیان بۆ دروست بوو بوو لە پرسەکانی ئیمان، کەچی گەلی ئیسرائیل داوای بینینی خوایان دەکرد، لە حەزرەتی (موسا).

پێغەمبەری خوا ﷺلە سەردەمی پێغەمبەرایەتی دا، دەوڵەتی دروست کرد هاوەڵانی شار و ناوچەکانی نیشتمانی عەرەبیان هەموو فەتح کرد، کەچی هاوەڵانی (موسا عليه السلام) کەوتنە ساڵی (التية) واتا لە بازنەی بەتاڵ دەسوڕانەوە، تا هەموویان مردن و جیلی تر دروست بوو.

## جیاکاری بۆ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی

ئەزموونی هەموو پێغەمبەران و کارو چالاکی ئەوان بە گشتی باسکراوە لە قورئان و سوننەت دا، بەڵام پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی و ئوممەتەکەی جیاواز تر لەگەلانی ڕابردوو و پێغەمبەرەکانیان.

ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ خەسڵەتی تایبەتیان هەیە، بۆ نموونە کاتێک قیبلەی موسڵمانان و یەهوود یەک جێگا و ڕووگە بوو، خوای گەورە جیاکاری کرد لە نێوانی موسڵمان و یەهوودا.

بۆ نموونە ئەگەر ڕووگەی ئایینەکانی ڕابردوو هەموو ڕووە و قودس بوو، خوای گەورە ڕووگەی گۆڕین بە کەعبە، قودس ڕووگەی پێغەمبەرانی ڕابردوو بووە، بەهەمان شێوەش ئیسماعیل بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو بارانێک جیاکارییەکی تەواوی بەخشییە حەزرەتی محمد ﷺ، ئەگەر نەوەی ئیسرائیل و پێغەمبەرەکانیان بەگشتی خاوەنی ڕووگەی تایبەت بوون، ئەوا پێغەمبەری خواش ﷺ هەر لە ڕێگای پێغەمبەرانی ڕابردووەوە وا ئێستا خاوەنی ڕووگەی تایبەتە بەخۆی کە کەعبەیە، لە هەزاران ساڵی ڕابردوودا گێڕانەوەی مێژووی بونیادی کەعبە، جیاکاری تەواوی بەخشییە ئوممەتی محمد ﷺ کە خاوەنی ئیمتیازی تایبەت بە خۆیانن.

﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ۝١٢٧﴾ البقرة

واتە: ئیبراهیم و ئیسماعیل (عَلَيْهِمَا السَّلَامُ) هەردووکیان ئەساسی کەعبەیان بەرز ئەکردەوە لەو کاتەدا فەرموویان: ئەی پەروەردگار ئەم کارە پیرۆزەمان لێ قبووڵ بکە کە دروست کردنی کەعبەیە، هەر تۆ بیسەرو وەڵامدەری دوعای و هەر تۆ زۆر زانایت بە نییەتمان۝١٢٧

لە ڕووی ئیمتیازی ئوممەتیشەوە ئوممەتی پێغەمبەر محمد ﷺ لە پێغەمبەران و ئوممەتانی تر جیاکراتەوە، گەلی ئیسرائیل خاوەنی هەڵبژاردەی گەل و ئوممەتانی جیهان بوون بەوەی کە بانگەواز بکەن، بەڵام ئەو ئیمتیازە وەرگیراوە لە گەلی ئیسرائیل بەخشرا بە ئوممەتی محمد ﷺ، بەڵام لە هەڵبژاردنەوە بوون بە (خەیرییە) واتا بوونە (خەیرە ئوممەت) لە بەر ئەوەی ئەرکی بانگەوازەکە کەوتۆتە سەر شانی ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ

وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِۗ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمۚ مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴿١١٠﴾﴾ آل عمران

واتە: ئەی ئوممەتی ئیسلام، ئێوە لەناو حەفتا ئوممەتدا باشترین و چاکترین و بەسوودترین ئوممەتن کە دەرکەوتبێتن و هاتبێتن بۆ خەڵکی، کە حەفتا هەزار لەم ئوممەتە بەبێ لێپرسینەوە و سزا دەچنە بەهەشتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد خوای گەورە بۆی زیاد بکات، خوای گەورەیش لەگەڵ هەر هەزارێك حەفتا هەزاری تری بۆ زیاد کرد، ئەمەش بەهۆی گەورەیی و بەرێزی پێغەمبەری خواوەیە ﷺ باشترینی ئوممەتی ئیسلامیش هاوەڵانن، چونکە گفتوگۆ کردن سەبارەت ئەوانە، لەقیامەتیش هەر ئوممەتی ئیسلام باشترین ئوممەتن و یەکەم ئوممەتن کە دەچنە بەهەشتەوەو نیوەی خەڵکی بەهەشت پێك دەهێنن، چونکە فەرمان ئەکەن بەچاکەو ڕێگری و قەدەغەی خراپە ئەکەن، ئیمان بەخوای گەورە ئەهێنن ئەگەر ئەهلی کتابیش لە جوولەکە و گاور ئیمانیان بهێنایە وەکو ئێوە ئەوە بۆ خۆیان باشتر بوو، بەڵام ئیمانیان نەهێنا، کەمێکیان ئیمانیان هێنا، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان فاسق بوون و لە ڕێگای حەق دەرچوو بوون و لەناو کوفرو گومڕایی خۆیاندا مانەوە﴿١١٠﴾

ئەم ئیمتیازە نابەخشرێتە هەرکەس کە بڵێ ئوممەتی محمد ﷺ ، بەڵکو پێویستە مەرجی خەیریەکە لە خۆیدا بەجێ بهێنێت ئەویش بانگەوازە.

جیاکارییەکی گرنگی تر لە بەندایەتیدا، لە نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات و جیهاد کە ئەمانە هەموو جیاکاری ئیمتیاز بوو بۆ ئوممەتی محمد ﷺ لە ناو گەلانی ڕابردوودا، شێوازی بەندایەتیان تایبەت بوو بە خۆیان خوای موتەعالیش جیاکاری کرد لە نێوان هەموو ئوممەتانی تری دنیادا بۆ ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

خوای گەورە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺی کردۆتە شاهید بەسەر هەموو گەلانی جیهانەوە، پلەی دادپەروەری پێ بەخشیوون، ئەم ئیمتیازو جیاکارییە لەناو هیچ ئوممەتێکی تردا ڕووینەداوە، هەربۆیە بوونەتە خاوەنی قیبلەی تایبەت، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًاۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴿١٤٣﴾﴾ البقرة

واتە: بەم شێوازە ئێوەمان گێڕاوە بە باشترین یان دادپەروەرترین ئوممەت، بۆ ئەوەی ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا ببنە شایەت بەسەر خەڵکییەوەو شایەتی بۆ پێغەمبەران ئەدەن کە دینیان بە ئوممەتەکانیان گەیاندووە، وەکو ئەوەی کە شایەتی بۆ (نوح) پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەدەن کە

پەیامی خوای گەورەی گەیاندووە، بۆ ئەوەی پێغەمبەری خواش شایەت بێ بەسەر ئێوەوە کە دینەکەی خوای گەورەی پێگەیاندوون کاتێك کە ئێمە ئەو قیبلەیەمان گۆڕی لە (بیت المقدس)ەوە بۆ کەعبەی پیرۆز، تەنها بۆ ئەوە بوو بزانین کێ بەڕاستگۆیی شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکەوێت و کێیش پاشگەز ئەبێتەوەو لە دین هەڵئەگەڕێتەوە، بە دڵنیایی خوای گەورە بەرامبەر بە خەڵکی زۆر بەڕەئفەت و ڕەحمەتە﴿١٤٣﴾

جیاکاری تری زۆر دراوە بۆ ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە ئەنفال و غەنیمەت، هەموو خاکی سەرزەوی کراوەتە مزگەوت بۆ ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، واتا مرۆڤی موسڵمان هەر جێگایەک خاوێن بێت دەتوانێت نوێژی خۆی بکات، لە ئایینەکاندا جێگای تایبەت هەیە بە بەندایەتی، بەڵام ئوممەتی محمد ﷺ هەموو زەوییان بۆ بۆتە مزگەوت.

زۆرێکی تر لە ئیمتیاز کە لەشەریعەتەکانی تردا قەدەغە بووە یان خۆیان لەسەر خۆیان حەرامیان کردووە، خوای موتەعال کار ئاسانی زۆری کردووە بۆ کۆتا پێغەمبەری ئاخر زەمان ﷺ و ئوممەتەکەی، جا ج لە بواری شەریعەت کە مەبەست لێرەدا فیقهی ئیسلامییە بە هەموو بەشەکانی ( عیبادات و موعامەلات) بەندایەتی و مامەڵەکردن، پاشان لە ڕووی بیروباوەڕ...هتد.

هەموو ئەو ئیمتیازانە کە خوای گەورە بەخشیویەتی لە سەری تاقی دەکرێنەوە بە چەند ناڕەحەتییەک، لەوانە: ترس، برسێتی، بێ پارەیی، لە مردن، لە وشکە ساڵی، ئەگەر ئیماندار ئارامگر بوو خوای گەورەی لەخۆی توڕە نەکرد و تووشی هەر موصیبەتێك لەم موصیبەتانە هات، ئەوا خوای موتەعال ڕەحمی پێکردووە و ڕێنمایی کردووە، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓا۟ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ﴿١٥٧﴾﴾ البقرة

واتە: بە دڵنیایی تاقیتان دەکەینەوە بە کەمێك لە ترس کە دوژمن زاڵ بکەین بەسەرتانداو ترسی دوژمنتان هەبێ و بە برسێتی و نەبوونی بە کەمی لە ماڵ و سەروەت و سامان و نەفس و بەروبووم، بەڵام مژدە بدە بەو کەسانەی کە لە کاتی ئەو بەڵاو موسیبەتانە ئارامگرن﴿١٥٥﴾ ئەو کەسانەی کە تووشی بەڵاو موسیبەتێك ئەبن ئەڵێن: ئێمە هەر موڵکی خوای گەورەین و هەموومان بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕێینەوە﴿١٥٦﴾ هەر کەسێك بڵێ: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) صەبرو ئارام بگرێ، ئەوانە صەڵاواتی خوای گەورەیان لەسەرە واتە: خوای گەورە لێیان خۆش ئەبێ و

مەدحیان ئەکات لەلای فریشتەکان و خوای گەورە ڕەحمیان پێ ئەکات ئەوانە خوای گەورە هیدایەتیان ئەدات﴿١٥٧﴾

جیاکاری لە لەناوبردنی گەلانی تریش کراوە لەگەڵ موسڵماناندا، وەکو گەلی (نوح) و عاد و سەمود و لوط و شوعەیب ناکات، بەڵکو بەو پێنج موصیبەتە ئوممەتی محمدﷺ تاقی دەکاتەوە، واتا ئوممەتەکە هەرگیز لە ناو ناچێت.

## جیهاد و خەبات لە پێغەمبەرانی ڕابردوو تا پێغەمبەر محمدﷺ

یوشەعی کوڕی نون لە دوای پێغەمبەر (موسا) و هاروون بووە پێغەمبەری گەلی ئیسرائیل، ئەم هۆزە ئەوەندە سەخت بوون حەزیان بە چاولێکەری بوو، حەزیان بەوە نەبوو کە پێغەمبەرێک ڕابەرایەتیان بکات بەڵکو هاتن و داوای پادشایان دەکرد کە بەسەریانەوە دابنرێت وەکو دەسەڵات تا ئەمان ملکەچی بن، ڕازی نەبوون بە سەرکردایەتی پێغەمبەرێکی عەزیز کە خوای موتەعال ناردوویەتی.

ئەمانەش هەموو بیانووگرتن و خۆشاردنەوە بوو لە بەرپرسیارێتی و بانگەوازی کارکردن، دەهاتن خۆیان بائەدا لەبەردەم پێغەمبەر یوشەع دا و داوای جیهاد و خەباتیان دەکرد، بەڵام لە کۆتاییدا کۆمەڵێکی زۆر کەم دەمانەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُوا۟ ۖ قَالُوا۟ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبْنَآئِنَا ۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ تَوَلَّوْا۟ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴿٢٤٦﴾﴾ البقرة

واتە: ئایا نابینی کۆمەڵێك لە خانەدان و دەسەڵاتدارانی بەنی ئیسرائیل لە دوای وەفاتی موسا کاتێك کە بە یەکێك لە پێغەمبەرەکانی خۆیان وت (کە شمویل یان شەمعون بوو): پاشایەکمان بۆ بنێرە تا لە ژێر ئاڵای ئەو پاشایەدا لە پێناوی خوای گەورە کوشتار بکەین، فەرمووی: ئایا لەبیرتان کرد کە ئێوە کوشتارتان لەسەر فەرز کرا بەڵام نەتان کرد، یان لەوانەیە کوشتارتان لەسەر فەرز بکرێت و نەیکەن! وتیان: باشە ئێمە چیمانە بۆ کوشتار نەکەین لە پێناو خوای گەورە کاتێك کە ئێمە لە ماڵ و حاڵی خۆمان دەرکراوین و منداڵمان لێسەندراوە، بەڵام کاتێك کە کوشتاریان لەسەر فەرز کرا، زۆربەی هەرە زۆریان پشتیان هەڵکرد، تەنها کەمێکیان نەبێ، لەبەرئەوەی نیەتیان باش نەبوو، عەزیمەتیان نەبوو، خوای گەورە خۆی زۆر زانایە بە ستەمکاران﴿٢٤٦﴾

هاوەڵانی پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە شاری مەککەدا داوایان کرد کە جیهادی چەک بکەن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای پێنەدان، کاتێك لە شاری مەدینەدا خوای گەورە ئایەتی جیهادی چەکی دەبەزاند هەندێک لە هاوەڵان دوو دڵ بوون، خەریک بوو چرکەساتی لاوازی ئیمانیان کاریگەری دروست بکات وەکو گەلی ئیسرائیل، بەڵام هاوەڵان خێرا گەڕانەوە بۆ لای خوای موتەعال و ترسان لە هەڕەشە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ۝ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفْعَلُونَ۝ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ۝﴾ الصف

واتە: پێش ئەوەی جیهاد پێویست بێت کەسانێك لە باوەڕداران وتیان خۆزگە دەمانزانی خۆشەویسترین کردەوە لای خوای گەورە چییە تا ئەنجامـمان بدایە، خوای گەورە ڕایگەیاند خۆشەویسترین کردەوە لای خوای گەورە ئیمان هێنان و جیهاد کردنە، دواتر لەسەر کەسانێك لە باوەڕداران قورس بوو، یان لە غەزای ئوحود تێکشکان، خوای گەورە فەرمووی: ئەی باوەڕداران بۆچی قسەیەك ئەکەن کە بە کردەوە جێبەجێی ناکەن و نایسەلمێنن، یاخود وتراوە لەسەر مونافیقان دابەزیوە کە وتیان :کوشتارمان کردو نەیانکرد بوو، وە بەڵێنیان بە موسڵمانان دابوو سەریانبخەن و سەریاننەخستن۝ خوای گەورە تووڕەبوون و ڕق لێبوونێکی زۆر ڕقی لەو کەسانەیە کە تەنها قسە ئەکەن و بە کردەوە نایسەلمێنن، یاخود شتێکیان نەکردووە ئەڵێن: کردوومانە۝ بە دڵنیایی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ کە کوشتار ئەکەن لە پێناو خوای گەورە بە یەك ڕیزو یەك پۆل، وەك ئەوەی دیوارێك بن و نووسابێتن بەیەکەوەو یەکیانگرتبێت و بووبێتن بەیەك پارچە، واتە: دوژمن ناتوانێ بێتە ناویانەوە۝

خوای موتەعال نموونەی حەزرەتی (موسا) دەهێنێتەوە بۆ چارەسەری کێشەی دڵ و دەروونی کە ئازاری دڵی پێغەمبەر (موسا)یان داوە و ئەوەی وتویانە پیادەیان نەکردووە، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ ۖ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ۝﴾ الصف

واتە: بەهەرحاڵ گەلانی ڕابردوو بە تایبەت گەلی ئیسرائیل کۆمەڵێکی کەمیان نەبێت، هەموو گەلەکە سەرپێچیان دەکرد، خوای موتەعال بە پێغەمبەر و هاوەڵانی فەرموو کە جیهادی چەکی لەسەر فەرز کردن، لە قورئاندا بە وەحی۝

ئاراستەی کردن کە جەنگ، ناڕەحەتە و خەڵکی بە گشتی حەزی پێ ناکات، بەڵام زۆر جار خێر و باشە لە شتێك دایە کە مرۆڤ حەزی پێ ناکات و بە پێچەوانەوە.

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴿٢١٦﴾﴾ البقرة

واتە: خوای گەورە کوشتاری کافرانی لەسەرتان فەرز کردووە هەر چەندە ئەم کوشتارە قورسە لەسەرتان، بەڵام لەوانەیە ئێوە شتێك کە پێتان ناخۆشەو نایزانن لەوانەیە خێری تیا بێ بۆ ئێوە لەوانەیشە کە شتێکتان پێ خۆشەو هەوڵی بۆ ئەدەن بەڵام شەڕو خراپە بێ بۆ ئێوە، خوای گەورە خۆی باشتر ئەزانێ چ شتێك بۆ ئێوە باشە و چی خراپە، بەڵام ئێوە عیلمی غەیب و زانیاری نهێنی نازانن و زانیاریتان نییە﴿٢١٦﴾

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە جیهاد لە سەریان فەرز بوو، ئیتر خۆیان نەشاردەوە، بەڵکو کوڕ و باوک تیر و پشکیان دەکرد کێ بڕوات بۆ جەنگ و جیهاد، هەبوو کە بانگی جیهاد ئەدرا لە مزگەوتی پێغەمبەری خواوە، هەبوو لە شەوی پەردەدا بوو، فریای خۆشتن نەدەکەوت، خێرا چەکی هەڵدەگرت و شەهید دەبوو.

یوشەعی کوڕی نون دەپاڕایەوە لە خوای موتەعال لە نیوەڕۆ و عەسر ڕۆژی جومعەدا سێ شەو و ڕۆژ ڕۆژ ئاوا نەبوو، دەترسا پێغەمبەرەکەیان بەناوی شەممە کە پشووی جوولەکەیە جەنگ و جیهاد نەکەن، خوای گەورە دوعاکەی حەزرەتی یوشەعی گیرا کرد، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ گێڕاوینەتەوە و لە ڕابردوودا ئاماژەمان پێ داوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو نیوە دوورگەی عەرەبی خستە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە، سەرپێچی نەدەکرا لە نەچوون، بەڵکو سەرپێچی کرا لە چۆنیەتی کردنی وەکو گوێ نەدان بە جێگاکانیان، لە جەنگی ( ئوحودا) شکست خواردوو نەبوون بەڵکو تووشی موصیبەت بوون، لە خاکی جیهاد و مانەوەیان. پاشان خۆیان ئامادە دەکردەوە بۆ جەنگ، ئەگەرچی هەندێک لە سوپاکە هەڵهاتن، بەڵام زۆرینە لە ناو گۆڕەپانەکەدا مایەوە و هەڵهاتووەکانیش خێرا پەیوەندیان کردەوە بە سوپاکەوە.

هەروەها لە جەنگی ( حونەین)دا، موسڵمانان تووشی لووتبەرزی و خۆبەزلزانی بوون تا خوای موتەعال بەهەمان شێوەی جەنگی (ئوحود) تووشی موصیبەتی کردن، بەڵام خێرا هەموو گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەرەکەیان.

بەڵام لە دوایی یوشەعی کوڕی نون پێغەمبەر لە ناو گەلی ئیسرائیلدا هەمیشە هەبوو، کەچی لە بوونی پێغەمبەراندا جەنگیان دژی یەکتر دەکرد و خاکی کەنعانیان دابەش کرد بە سەر چەند دەسەڵاتی جیاوازی ئەسباتەکاندا، شەڕی ناوخۆیان دەکرد لە وجودی پێغەمبەرەکانیاندا.

لەوانەیە،خەڵکێک بپرسێت لە نێوانی عەلی و معاویەدا هەمان جەنگی برا کوژی ڕوویدا؟ ئەی ئەوە نییە لە ناو مێژووی موسڵمانانندا جەنگ بەرپابووە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ڕاستە جەنگ ڕوویداوە، بەڵام لە بوون و وجودی پێغەمبەر ﷺ دا نەبووە، بەڵکو دوای نەمانی وەحی جەنگ ڕووی داوە، پاشان لەسەر دەستی حەسەنی کوڕی عەلی کۆتایی پێ هاتووە، کە ماوەیەکی زۆر کورتی برد، بەڵام جەنگی گەلی ئیسرائیل سەدەی خایاندوە و لە وجودی پێغەمبەرەکانیاندا ڕووی داوە.

پێغەمبەر محمد ﷺ بۆی نەبوو لە جەنگدا ڕابکات و هەڵبێت، بۆیە هاوەڵان هەرگیز پشتی پێغەمبەریان بەرنەداوە و هەمیشە لەگەڵیدا دەجەنگین، ئیتر ئەوانیش بیریان لە هەڵهاتن نەدەکردەوە، یان شەهید بوون یان سەرکەوتن.

داوای پادشایان لە پێغەمبەر ﷺ نەدەکرد، بەڵکو دەیانزانی پادشاو مەلیک و سەرۆک و کیسرا و قەیصەرەکان دەبێت هەموو لە ژێر ڕکێفی پێغەمبەری خوا ﷺ دا بن و حەزرەتی محمدیش ﷺ بە حوکمی خواو فەرمانڕەوایی هەموویان دەکات.

هەر بۆیە لە شاری مەدینەدا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەوڵەتی دامەزراند، وەزیری هەبوو کە ئەبو بەکر و عومەر بوون، بیتول مالی هەبوو لای بیلال حەبەشی بوو، سوپای دامەزراندن کە سەدان سەرکردەی سەربازی هەڵکەوتوی تێدا بوو لە حەمزەی مامیەوە تا خالیدی کوڕی وەلید و هاوشێوەکانیان.

پاشان جزیەی لە کافر دەسەندو زەکاتی لە موسوڵمانان کۆ دەکردەوە و دەیدایە هەژارەکان، وڵات و شار و دێهاتی پڕ کرد لە دادپەروەری، نیوە دوورگەی عەرەبی ناسرابوو بە جەردە و خوێنرێژ و ڕێگری ..هتد، هەموو ناوچەکانی ئارام کردەوە، خزمەتگوزاری دامەزراند لە چۆنیەتی بازاڕ و هێنانی ئاو و ئاوەڕۆ بۆ باخ و باخات و پێداویستی مرۆڤەکان، لە کاتی جەنگدا بەستنی هاوپەیمانی و پەیوەندی دبلۆماسی و ئامادەکردنی چەک و جبەخانەی بەهێز بۆ سوپاکەی زۆری تر کە سیمای دەوڵەتی پێغەمبەر محمد ﷺ بوو.

## دڵنیا بوون بە زانست و هەستەکان، عوزێر پێغەمبەر (عليه السلام) وەکو نموونە

لە دامەزراندنی دەوڵەتی مەدینەدا پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان هەروا بە ئاسانی دەوڵەتیان دانەمەزراند، بەڵکو لە یەکەم ڕۆژی چوونیان بۆ ناو دەوڵەتی ( یەسریب) کە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو ئەو شارە بووە بە ناوی ( شاری پێغەمبەر) ( مدينة الرسول)، لەهەموو لاکانەوە عەرەب و یەهوود ئەعرابە دەشتیەکیەکان، وەکو گورگ کەڵبەیان تیژ کردبوو لەو دەوڵەتە، جەنگیان لەگەڵ دەکردن و خەڵکیان لێ تیرۆر دەکردن لە ماوەیەکی کەمدا ٧٠

هاوەڵی پێغەمبەریان بە فێڵ و کاری دوور لە ئاکاری سەردەمی جاهیلیش شەهید کرد، هەموو گەورە هاوەڵان لە زانست و فیقە و بیر و باوەڕ و دەرخکاری قورئانی پیرۆز(حافظ قرآن).

پێشتر ٧٠ کەسی تر لە هاوەڵان لە جەنگی ئوحددا شەهید بوو بوون، کاریگەری دروست کرد لە سەر هاوەڵان و تەنانەت خودی پێغەمبەری ئازیزمان محمد ﷺ ، عەرەب و یەهوود بە گشتی خۆیان مەڵاس دابوو تەنها بۆ موسڵمانان، لەم باری دەرونییە و ناڕەحەتی و ناهەمواریيەی ناو کۆمەڵگەی شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوای گەورە باسێک دادەبەزێنێت بۆ پێغەمبەری خوا کە لە سورەتی (البقرة)دا هاتووە، باسی کەسێک بۆ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان دەکات کە بەلای جێگایەکدا ڕۆشتووە خاپور و وێران بووە، ( خاوية على عروشها) عروش واتا سەقف و دیوار و هەمووی لەگەڵ زەویدا تەخت بووە وێرانەیەکی تەواوە.

هاوەڵانی پێغەمبەریش ١٤٠ کەسیان لێ شەهید بووبوو لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، بۆ ئەوانەش وێرانکارییەک بوو، پێدەچێت بیرکردنەوەی هەمان بیرکردنەوەی ئەو پێغەمبەرەی گەلی ئیسرائیل بوو بێت لە دوای (بەنوختنەسر ) کە چۆن جێگای ئەو ١٤٠ هاوەڵە پڕ دەبێتەوە، لێرەدا باسەکە پەیوەندی نییە بە گومان و زیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت، بەڵکو پەیوەندی هەیە بە کات و سەردەمەوە.

چونکە ئیمامی عومەر دەفەرموێت: ( سوێند بە خوا ئاسمانم بۆ بکرێتەوە بەهەشت و دۆزەخ بە چاوی خۆم بینیم، ئیمانم هیچ زیاد دەکات، بەڵام کەم ناکات)[57]

عوزێریش بەهەمان باری دەروونی دایە کە دوای ئەو هەموو شەڕ و وێرانکارییە بەنوختنەسر چۆن ئەم جێگایە ئاوەدان دەکاتەوە خوای موتەعال: ﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ ۖ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾﴾ البقرة

واتە: یاخود ئەو کەسەی کە بەلای دێیەکدا تێپەڕی، سەقفی خانووەکان هەمووی ڕووخابوو بەسەر دیوارەکانیدا و کەسی تیا نەمابوو، فەرمووی: چۆن ئەمە لە دوای وێرانکردن و کاول کردن خوای گەورە زیندوووی ئەکاتەوە، یاخود ئەو کەسانەی کە لەناویدا مردووون چۆن خوای گەورە زیندووویان ئەکاتەوە، خوای گەورە سەد ساڵ لەوێدا مراندی، پاشان زیندوووی کردەوە و پێی فەرموو: ئایا تۆ چەندێك لێرە مایتەوە چەندێك مردبوویت؟ وتی: ڕۆژێك یان بەشێك لە ڕۆژوو

---

[57]- قال عمر: والله لو انشقت السماء ورأيت الجنة ورأيت النار، فقلت أزداد فيهما يقينا.

کەمتر لە ڕۆژێك مامەوە، خوای گەورە فەرمووی: بەڵکو تۆ سەد ساڵە لێرە ماویتەوەو مردوویت تەماشای خواردن و خواردنەوەکەت بکە کە لەگەڵ ئەو ماوە زۆرەدا هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە بە تواناو دەسەڵاتی خوای گەورە، تەماشای گوێدرێژەکەت بکە چۆن پارچە پارچە بووە و ئێسکەکانی ڕزیوەو خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی تۆ بکەینە نیشانەیەك بۆ خەڵکی لەسەر زیندووبوونەوە یان تەماشای ئێسکەکانت بکە چۆن هەندێکی بەرز ئەکەینەوە بۆ سەر هەندێکی، پاشان بە گۆشت دای ئەپۆشین، کاتێك کە ئەمەی بۆ دەرکەوت و بە چاوی خۆی ئەم شتەی بینی فەرمووی: ئەزانم و بەڕاستی دڵنیام کە خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە﴿٢٥٩﴾

خوای موتەعال بۆ ئەوەی لە ڕووی مەیدانییەوە نیشانی بدات کە چۆن سیستەمی داناوە بۆ لەناو چوون، هەر ئەو خوایە کە دەتوانێت بونیاد و زیندووی بکاتەوە.

لێرەدا واتای کارەکە لەیەک کەس و تاکە کەسدا دەرناکەوێت بۆ بەدی هێنانی ئامانج، دەشێت هەر کەس هات و کاری خۆی بکات، بەڵام نازانێت ئامانج دێتە بەر دەست، بۆ نمونە حەمزەی مامی پێغەمبەر یاخود موصعەب کوڕی عومەیر، هیچیان تەمکین و فەتحی مەککەیان نەدی، بەڵکو زوو شەهید بوون، بەڵام هاوەڵەکانی تر ئامانجەکەیان بینی، لەوانەی کە لە شاری مەککەدا شەهید بوون، نە هیجرەتیان دی نە حوکمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ واتا مرۆڤ کارکردنی لەسەرە ئامانج دێت، بەڵام مەرج نییە لە کاتی من و تۆدا بێت، بەڵکو بۆ نەوەی داهاتوو بێت.

ئەم وانەیە زۆر ڕوون بوو بۆ هاوەڵانی، هەر بۆیە خوای گەورە نموونەی عوزەیری بۆ هێنانەوە بۆ دڵنیابوونی مەیدانی بوو لە ( عیلم یەقین بۆ عەین یەقین بوو) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ﴿٢﴾ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴿٣﴾ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴿٤﴾ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ﴿٥﴾ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ﴿٧﴾﴾ التكاثر

واتە: خوای گەورە ئەفەرمووێ: خۆشەویستی و نازو نیعمەت و ڕازاوەیی و ژیانی دونیاو گەڕان بەدوای دونیاو سەروەت و سامان و ماڵ و منداڵدا سەرقاڵی کردوون لەوەی کە هەوڵ بۆ قیامەت بدەن و عیبادەتی خوای گەورە بکەن، کە نابێ وابێ﴿١﴾ حاڵی ئێوە وایە تا ئەو کاتەی کە سەردانی گۆڕستان ئەکەن، واتە: ئەمرن و بەرەو گۆڕستان ئەبرێن مەگەر ئەو کاتە وازبێنن، ئەگەرنا مرۆڤ هەر لە هەوڵی دونیادایە تا ئەو ڕۆژەی کە ئەمرێت﴿٢﴾ نەخێر نابێت ئێوە ئاوا بەو شێوازە سەرقاڵی کۆکردنەوەی سەروەت و سامان بن و فەخرو شانازی بە سەروەت و سامان و ماڵ و منداڵ و شتە دونیاییەکان بکەن، ئەگەر وابکەن لە داهاتوودا لە ڕۆژی قیامەت

سەرەنجامی ئەم کارەتان ئەزانن﴿٣﴾ دیسان بۆ جەخت کردن و بەرهەڵستی کردنە کە نابێ ئێوە وابن ئەگەر وابوون لە داهاتوودا سەرەنجامی ئەو کارەتان ئەزانن﴿٤﴾ نەخێر ئێوە نابێ حاڵتان وابێ ئەگەر بتانزانیایەو عیلمی یەقینتان هەبوایە، چۆن یەقین و دڵنیان لە شتەکاندا، ئاوایش دڵنیاییتان هەبوایە بۆ ڕۆژی قیامەت، ئەوە بەم شێوازە گرنگی و بایەختان بە زۆری و کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و ماڵی دونیا نەئەداو سەرقاڵی نەدەکردن لە ڕۆژی قیامەت، بەڵام ئێوە عیلمی یەقینتان نییە کە واتان لێ بکات هەوڵ بۆ ڕۆژی قیامەت بدەن﴿٥﴾ ئەوە بە دڵنیایی لە ڕۆژی قیامەتدا دۆزەخ بەچاوی خۆتان ئەبینن، مەگەر ئەو کاتە پەشیمان بن﴿٦﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا دۆزەخ ئەبینن بە (عَيْنَ الْيَقِينِ) بەچاوی خۆتان ئەیبینن کە ئەو کاتە هیچ گومانێکتان تیایدا نابێت﴿٧﴾

خوای پەروەردگار حەزرەتی عوزێری مراند ١٠٠ ساڵ، پاشان زیندوووی کردەوە، خودی خۆی و خواردنەکەی وەکو خۆی مابوونەوە، گوێدرێژەکەی بوو بووە خۆڵ و ئێسقانەکانی بە سەریەکدا کەوتبون، پێشتر بە دوورو درێژی باسکراوە، ئەوەی کە لێرەدا گرنگە باس بکەین کات و سەردەمە، خوای موتەعال ڕاگری زەمەن و دادپەروەری لە ڕزق و ڕۆزی و دادگەری ڕەها، کەسێک خۆی سەرکێش و خراپەکارە بۆ هەتا هەتایی لە دۆزەخ دا دەمێنێتەوە و کافر و زاڵمە لەم دنیادا، خوای موتەعال ئازادی داوەتێ لە کارو کردەوەیدا، تا لە قیامەت توانای وتنی ئەوەی نەبێت بڵێ زوڵمم لێ کراوە، بۆ خراومەتە دۆزەخ؟

لە دوای وێرانکاری بەنوختنەسر سەرلەنوێ خەڵکی هەموو وێرانەو کەلاوەکانیان ئاوەدان کردەوە لە دوای هەڵسانی لە خەوی مەرگ، خوای گەورە زیندوووی کردەوە دوای ١٠٠ ساڵ، بۆی دەرکەوت وەکو هیچ ڕووی نەدابێت، بۆ ئێمەش وایە لە ئێستادا لەسەردەمی فارس، ڕۆم، تەتار و مەغۆڵ و خاچپەرستان خەڵکی زۆر لە ناو چوون، بەڵام ژیان نەوەستا و بەردەوام بوو.

هەر ئەم وانەی حەزرەتی عوزێر بوو هاوەڵانی فێر کرد کە کاربکەن، زەمەن و کات بۆ خوای پەروەردگار دەست نیشان ناکرێن خوای موتەعال تەنها ( قابض) ڕۆحەکان نییە، بەڵکو قابض-ی کات و زەمەنە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە هاوەڵان حاڵ و گوزەرانتان چۆن دەبێت لە ڕۆژی قیامەت دا، کە خوای موتەعال کۆتان دەکاتەوە، ئەو کۆ کردنەوەیە (٥٠) هەزار ساڵی پێدەچێت؟! نەنان دەخۆن نە ئاو؟!

هاوەڵان هەموو کەوتنە مقۆ و مقۆ هەندێکیان لە تاواندا ڕووی خۆیان داپۆشی و دەستیان کرد بە گریان، ئینجا تەمەشایان کرد پێغەمبەری خوا ﷺ زەدەخەنە گرتی، فەرمووی:

کاتەکەتان لێ دەڕوات زۆر بە ئاسانی وەکو ئەوە وایە کە دوو ڕکعات نوێژی سوننەت بە خێرایی بیکەن.[58]

کەواتە زەمەن و کات ناڕۆن ئەوە ئێمەین تێدەپەڕین بە پێوەری خۆمان هەژماری دەکەین، خوای موتەعال ساڵ و سەدەو کاتژمێری بۆ پێوەر ناکرێت هەموو مەخلوقی خوای موتەعالە.

چونکە لەوانەیە ئەو هەستە لای زۆربەمان هەبێت و بیکەینە پرسیار لە مێشک و دڵی خۆماندا، یاخود بپرسین و بڵێین: کەسێک هەزاران ساڵە مردوووە، کەسێکی تریش ڕۆژێک پێش قیامەت دەمرێت، داخۆ حاڵیان چۆن دەبێت ئەم دوو مرۆڤە؟ هەر وەکو ١٠٠ ساڵەکەی عوزێرە کە هەستی پێنەکرد، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: بۆ مرۆڤی باش وەکو ئەوە وایە ئاوڕ بەلای ڕاستیدا بداتەوە ئەوەندە کاتی پێ دەچێت، با هەزارەها ساڵیش بێت مرد بێت.

## جنۆکە و پێغەمبەری خوا ﷺ

پێغەمبەری خوا ﷺ لەو پەری ناڕەحەتی و ئازار و ئەشکەنجەی قوڕەیش و طائیف دا بوو، دوای بەردبارانکردنی لە شاری طائیف گەڕایەوە لەگەڵ زەیدی کوڕی حارس لە نێوانی شاخ و کێوی ڕووت و قوتی نێوان مەککە و طائیف دا بۆ لادانێکی کاتی نوێژی کرد، چەند جنۆکەیەک هاتنە خزمەت پێغەمبەر، کە بۆ یەکەم جار بینیان پێغەمبەری خوا قورئانی خوێند گەڕانەوە بۆ (نصیبین) لە نێوان سوریا و تورکیای ئەمڕۆدا، هەواڵەکەیان بردەوە بۆ هێزو گەلەکەیان.

لە هەموو ماوەی ڕابردووی ژیانی پێغەمبەر ﷺ و قوڕەیش، جنۆکە وەکو مەخلوقی شەڕەنگێزی نیشان دەدرا، ڕاستە بەشێکی زۆری جنۆکە شەیتان نین، وشەی شەیتانیش وەکو ئاماژەمان پێداوە پلەو پایە و مەنهەجە.

لێرەدا هاوکێشەکە بە تەواوی گۆڕانکاری بەسەردا هات، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بە پێغەمبەری جنۆکە و مرۆڤەکان، کەواتە ئەوانیش وەکو موسڵمانە مرۆڤەکان برامانن، چونکە لێرەدا دەردەکەوێت کە ئیماندار برای ئیمانداره ( إنما المؤمنون الإخوة).

ئەو ترسەی کە لە دڵی مرۆڤەکاندا هەبوو، بەوەی کە جنۆکە زیان بەخشە بە گشتی کۆتایی هات و بوونە برای مرۆڤەکان، هەموو شوێن یەک پێغەمبەر کەوتن..

---

[58] یقول رسول عن یوم القیامة: کیف بکم إذا جمعکم ربکم خمسین الف سنة یوم القیامة لا تأکلون أکلة و لا تشربون شربة؟

فبدأ الصحابة نجظون وجوههم ولهم صوت بکاء: وایتم النبي قال: وله نمانتر علی المؤمن من رکعتین حقیقین یصلیها

کۆی ئیمانداران بە دوای ئەوەدا دەگەڕێن کە خێر و چاکە و بانگەوازی ئیسلام بگەیەنن، زۆرجار مرۆڤ لە جێگایەکدا وتەیەکی چاک دەڵێت: خۆ ئەگەر مرۆڤ گوێی بۆ نەگرت زۆر ئاسایی وەری بگرێت چونکە تۆ پاداشتی خۆت وەردەگریت، ئینجا مەخلوقاتی وەک جنۆکە گوێی لێی بێت و سوودی لێ وەربگرێت یاخود مسوڵمان بێت، ئەوا دەبێتە صەدەقەی جاری بۆ خاوەنەکەی.

کۆی گشتی باسەکە ئەوەیە کات و سەردەم و جێگا بۆ بەندایەتی گرنگی لەوەدایە چاوەڕێی ئامانج لە کات و جێگای خۆیدا نەکەین، تۆ کار بکە ئامانجەکە بۆ ڕەوەندی دوای خۆمان یان گەلانی تره گرنگە کار بکەین، پاشان خوای گەورە ویستی وابوو کە هیجرەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ طائیف جنۆکە سوودمەند بێت نەک مرۆڤەکان بە گشتی، هەرچەندە مرۆڤەکان سوودیان لێ وەرگرتووە، لە کۆتاییدا بۆتە زانیاری بە وەحی بۆ ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قورئاندا دەیخوێنینەوە.

## لە نێوانی حوکم و پێغەمبەرایەتی دا نموونەی داوود پێغەمبەر (عَلَيْهِ السَّلَامُ)

لە ناو گەلی ئیسرائیلدا پۆست دابەش کرابوو لە نێوانی قیادەی سەربازی و پێغەمبەرایەتی، هەمیشە پادشای گەلی ئیسرائیل دەبوو بە هێز و دەوڵەمەند و خاوەن موڵک بێت، لە کاتی ڕووبەڕوونەوەدا پێویست بوو پادشا گەلی ئیسرائیل بپارێزن، ئەم ڕەوشتەش لە دوای وەفاتی (موسا) و هاروون و یوشەعی کوڕی نون دەستی پێکرد کە گەلی ئیسرائیل پارچەپارچە بوو بوون.

لەسەردەمی (طالوت) دا کە کرایە پادشا و سەرکەوت بەسەر هێزی دوژمندا لە ناو سوپاکەدا کەسێکی ئازا و لێزان دەرکەوت پادشایەتی و پێغەمبەرایەتی لە خۆیدا کۆکردەوە، ئەم دوو خەصڵەتە بەیەکەوە زۆر گرنگە، ئەو گەل و ئوممەتەی شوێن پێغەمبەرێک بکەون کە حوکمی دەوڵەت و پێغەمبەرایەتی تێدا کۆبووبێتەوە، ئەوە بە دڵنیاییەوە سەرکەوتوو دەبن.

پێغەمبەری ئازیز ﷺ کە هاتە شاری مەدینە جوولەکە نەیتوانی ڕەخنەی دەسەڵات لە پێغەمبەری خوا ﷺ بگرێت، چونکە لە تەورات دا باسی پێغەمبەرایەتی (داوود) و (سولەیمان)ی کوڕی هاتبوو کە پادشا و پێغەمبەر بوون، بەڵام نەسارا وەکو پێغەمبەر تەماشای ئەم دوو پێغەمبەرە عەزیزە ناکەن هەر بە پادشایان دەزانن.

خەلیفایەتی (داوود) لە شاری مەککە دا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کراوە کە دەبێت پێغەمبەر خاوەنی سیستەمی بەڕێوەبردنی دەوڵەت بێت، کە لە مێژووی ئیسلام دا بە واتای ( خیلافەت) دێت.

پێغەمبەر محمد ﷺ هەر لە سەرەتای بانگەوازەکەیەوە، داوای حوکمی ڕەهای دەکرد لە ناو قوڕەیش دا، خۆ قوڕەیش بیرۆکەی پێغەمبەرایەتیەکەی بە یەکجاری ڕەت نەکردەوە، خەڵکانێک هەبوون لە ڕابردوودا کە بانگەشەی دینی حەنەفییان دەکرد لە نێوان دوورگەی عەرەبدا، عەرەب زۆر گرنگی پێ نەدان، چونکە بانگەوازەکەیان تەنها لە چوارچێوەی ئامۆژگاری کۆمەڵایەتیدا بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ داوای گۆڕانکاری بنەڕەتی دەکرد، شۆڕشی بەرپا کرد دژی هەموو پەرستراوەکانیان و دابونەریت و یاسا و ڕێساکانی عەرەب، قوڕەیش ڕزای بوون بە پەرستنی خوایەک تا هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وەکو دانوستان کە ساڵێک خوای پێغەمبەری محمد ﷺ بپەرستن بە پێچەوانەشەوە بۆ موسڵمانان، خوا کاری کافرەکانی ڕەت کردەوە و فەرمووی: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ٦﴾ الكافرون

واتە: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەی کافران کە مەبەست کافرانی قوڕەیشە و هەموو کافران ئەگرێتەوە تا ڕۆژی قیامەت١ ئەوەی کە ئێوە عیبادەتی بۆ ئەکەن لەو بتانە من عیبادەتی ئەو بتانە ناکەم٢ ئێوەیش عیبادەتی ئەو خوایە ناکەن کە من ئەیپەرستم، لەبەر ئەوەی ئەگەر عیبادەتیشی بکەن لەگەڵ بت پەرستی و شەریکدانان بۆ خوای گەورە پێی ناوترێ: عیبادەت، بەڵکو پێی ئەوترێ: شیرك٣ من عیبادەتی ئەو بت و خوایانە ناکەم کە ئێوە ئەیپەرستن٤ ئێوەیش عیبادەتی ئەو خوایە ناکەن کە من دەیپەرستم٥ لە ڕووی شەرعەوە مومکین نیە و بەهیچ شێوازێك من عیبادەتی خواکانی ئێوە ناکەم٦

پێغەمبەر محمد ﷺ بە دوای تەواوی هەموو جومگەکانی دەسەڵاتەوە بوو، بەشێکی جێنەدەهێشت لایەنێکی تر بگرێت، بەڵکو دین بە واتای سیستەمی تەواو پڕی بەکارهاتوو لە ئوممەتی محمد ﷺ.

دوو شارستانیەت زۆر بە هێز بووە هاوشێوەی یەکێکیان هەرگیز دروست نابێتەوە، ئەویش شارستانیەتی (داوود) و (سولەیمان)-ە سەلامی خوایان لێ بێت، بونیادی هەموو شارستانییەک و ئاوەدانکردنەوەیەک هەزار ساڵ دەخایەنێت، پاشان گۆڕانکاری بەسەر جیلی کۆندا ٤٠ ساڵی تەواو دەخایەنێت، ئەم ژمارەیە لە قورئانەوە سەرچاوەی گرتووە، گۆڕینی جیلی (موسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) لە سیناء بە هەزار ساڵ دەست پێدەکات تا جێنیشکردنی بە سێ سەدە، عەرەب لە مردن و زیندووبوونەی عوزێر پێغەمبەر (عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) تا هاوەڵانی ئەشکەوتی گۆڕینی جیلەکان لە سەردەمی پێغەمبەری خواوە دەستی پێ کرد، واتا لە پێغەمبەرایەتییەوە بۆ وەفاتی ٢٣ ساڵی خایاند، پاشان خیلافەت تەواوکەری بانگەوازە ئیسلامییەکەیە کە ٣٠ ساڵی خایاند. هەمووی ٥٣

ساڵی خایاند، بەڵام لە دوای ٤٠ ساڵ وردە وردە بەرەو لاوازی هات لە ڕووی جیلەکانەوە جەنگی ناوخۆ و هەڵگەڕانەوە بەتەواوی ڕووی دا، بەڵام کە دەستگیرایەوە بە قورئان و سوننەت ڕەوەندەکان باشتر بوونەوە تا ئاستێک توانرا شارستانی و ژیاری حەتیین (حطین) دامەزرێنن کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە ئەگەرچی بە هێز نییە لە ئێستادا.

## چارەسەری بیرو باوەڕو ناسینی خوا موتەعال

لە هەموو قۆناغەکانی شاری مەککە و مەدینەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی جددی ئەوە بوو کە بیر و باوەڕی خەڵکی دامەزرێنێت بە تایبەت لە قۆناغی مەککی دا، بەڵام ئەوەش مانای وانییە کە لە شاری مەدینەدا گرنگی پێ نەدرابێت، بەڵکو لە هەموو کات و ساتێکی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بانگەوازەکەی بریتییە لە یەکتاپەرستی، کە کرۆکی بیروباوەڕی ئیسلامییە.

هەموو ژیانی پێغەمبەران بە گشتی باسی چارەسەری بیرو باوەڕ بووە بە جۆرێک کە هەریەکەیان گۆشەنیگایەکی بیروباوەڕی دەرخستووە، کە بە گوێرەی ئەو گۆشە نیگایانە نیگایەکی بیر و باوەڕی تەواو بووە بۆ مرۆڤە موسڵمانەکان لە ڕێگای وەحییەوە.

نمونەی: سورەتی مەریەم کە باسی کاروانێکی پێغەمبەران دەکات کە هەمووی باسی چارەسەری کیشەی بیرو باوەڕە، جا لە باسی حەزرەتی زەکەریا و یەحیا و بنەماڵەی عیمران کە خودی خاتوونە مەریەم تێیدا ببیێت، خاڵی سەرەکی لەم باسەدا بڕیاردانی هاوبەشە بۆ خوای موتەعال ئەم بەشە باسەکەی لە ڕێگای بتەکانەوە نییە، بەڵکو لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە کە زیادەڕەویان تێدا کردووە گەیاندیانە ئاستی خوای پەروەردگار، ئەویش حەزرەتی (عیسا) و عوزێر و بەشێکی تر لە پێغەمبەرانە وەکو نموونەی حەزرەتی ئیبراهیم کە لە ئاستی خوادا تەماشایان دەکەن، پەنا بە خوای گەورە لەوەش خراپتر کە پیاوە چاکەکانیان دەکەن بەهاوبەشی لەگەڵ خوای موتەعال.

هەروەها لە شاری مەدینەدا کاتێک وەفدی نەجران کە نەسارا بوون ویستیان گفتوگۆ و موباهەلە بکەن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، کە ئەوان پێیان وابوو کە (عیسا) کوڕی خوایە لەم سەرو بەندەدا پێغەمبەری خوا ﷺ چەندین ئایەتی لەو بارەوە بەسەریاندا خوێندەوە بۆی باس کردن، چیتر ئەوان توانای ڕووبەڕووبوونەوەی پێغەمبەریان نەماو پاشەکشەیان کرد لە موباهەلەکە، چونکە یەقین و دڵنیایی تەواویان نەبوو لە ئایینی نەسرانی.

## حەزرەتی عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) و پێغەمبەر محمد ﷺ

پێغەمبەری ئازیز ﷺ جوانترین پێناسە لە لای، بەندەی خوای پەروەردگار بوو، لە شایەتوماندا فەرموویەتی کە بڵێن ( محمد عبده ورسوله) هەرگیز لە مرۆڤبوونی خۆی زیاتری

باس نەکردووە بگرە خۆی بە بەندەی (الله) ناساندوە، خوای موتەعالیش هەر زیاتر لە قورئاندا بە بەندەی خۆی ناوی بردووە، وەکو نمونەی سەرەتای سورەتی الإسراء و الکهف.

﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِیٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِی بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١﴾ الإسراء

واتە: پاك و مونەززەهی بۆ ئەو خوایەی کە شەوڕەوی کرد بە بەندەکەی خۆی کە محمدە ﷺ کە دەوروبەری (بیت المقدس)مان پڕ خێرو بەرەکەت کردووە بە بەروبووم و ئاو و دابەزینی وەحی و ناردنی پێغەمبەران و شوێنی پیاوچاکان، شەوڕەویمان بەو بەندەیەی خۆمان کرد تا هەندێك لە موعجیزەو ئایەتە سەرسوڕهێنەرەکانی خۆمانی نیشان بدەین، بەدڵنیایی هەر خوای گەورەیە کە زۆر بیسەرو بینەرە(١)

لە دوای گەڕانەوەو هاتنەوەی موهاجیرەکانی حەبەشە کە لەو دەوڵەتەوە پەناهەندە بوون، ئەوانەش پێویستیان بە جارێکی تر پەروەردە هەبوو، کە ئەو کۆمەڵە لە جێگایەکدا بوون حەزرەتی (عیسا) کوڕی مەریەمان بە خوا دەزانی، پاشان وەفدی نەجران کە هاتن بەهەمان شێوە لەسەر هەمان پرسی حەزرەتی (عیسا) کوڕی مەریەم ئاخافتنیان دەکرد، تا ڕادەیەک جوولەکە یەکتاپەرست بوون، هەندێکی یان مەزهەبەکانی جوولەکە عوزێریان بە کوڕی خوا دەزانی نەک هەموو جوولەکە بە پێچەوانەی مەسیحییەکان، ئەوان زۆرینە (عیسا)ی کوڕی مەریەمیان بە خوا دەزانی.

﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ٣٠﴾ التوبة

واتە: جوولەکەکان وتیان: عوزێر کوڕی خوای گەورەیە، گاورەکان وتیان: (عیسا) کوڕی خوای گەورەیە، ئەمە قسەی ئەوان بوو کە بەدەم ئەیانکرد بەبێ ئەوەی کە بیری لێ بکەنەوە کە ئەم قسانەیان هاوشێوەی قسەی بت پەرستان و کافرانی پێشتر بوو کە بە لات و عوززاو مەناتیان ئەوت: ئەمانە کچی خوای گەورەن، یان ئەیانوت: مەلائیکەت کچی خوای گەورەیە، خوا بیانکوژێ و لەناویان بدات، یان نەفرەتی خوای گەورەیان لێ بێت چۆن لەم حەقە لائەدەن و ئەچنە سەر باتڵ(٣)

هەر بۆیە بۆ پێغەمبەری ئازیز ﷺ وەکو ئاگادارکردنەوە و زەنگی ترسناک لەو بارەیەوە، ئایەت دابەزی کە خوای گەورە موحتاج نییە بە کوڕ و منداڵ، ئەم وشەیە هەروا ئاسان و سادە نییە، جا چ بەشێوەی ڕاستەوخۆ بێت کە (عیسا عَلَيۡهِ السَّلَامُ) بە کوڕی خوا دەزانن، خوای

گەورە ناردویەتییە سەر زەوی وەکو (لاهوت و مەنوست) یان بە گشتی وەکو یەهوود کە خۆیان زانا تاک بە تاکی یەهوود خۆی بە کوڕی خوا دەناسێنێت، پەنا بە خواو بەشێکیش عوزێر بە گەورەترین کوڕی خوا دەناسێنن.

خوای موتەعال دەفەرموێت بە پێغەمبەری خوا: ﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾﴾ مريم

واتە: نزیکە ئاسمانەکان لەت بێت و لەناوبچێت لەو قسەیە کە ئەیکەن بۆ خوای گەورە، نزیکە زەویش بەهەمان شێوە لەت بێت و شەق بێت، نزیکە شاخەکان بڕوخێن بەسەر یەکتریدا﴿٩٠﴾ کاتێك کە بانگەشەی کوڕ ئەکەن بۆ خوای گەورە، خوای گەورە ئەوەندە لەو قسەیە تووڕەیە﴿٩١﴾ گونجاو نییە بۆ خوا و خوای گەورە پێویستی بە منداڵ نییە﴿٩٢﴾ چونکە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەموویان عەبدی خوای گەورەن و دان بە بەندایەتیدا ئەنێن بۆ خوای گەورە، ئیتر چۆن ئەبێ ئەم بەندانە ببن بە کوڕی خوا﴿٩٣﴾ خوای گەورە سەرژمێری کردوون و ژماردوونی و هیچیان لە خوای گەورە ناشاردرێنەوەو کەسیان دوا ناکەون و هەموویان لەبەر دەستی خوای گەورەدا ئامادە دەبن﴿٩٤﴾ هەموویان لە ڕۆژی قیامەتدا بە تاك تاك دێن، بە دڵنیایی ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە﴿٩٥﴾

هەروەها لەناو قوڕەیش دا هەمان بۆچوون و مەبەستی هاوشێوەی یەهوود و نەسارا هەبوون، کە جنۆکەیان بە منداڵی خوا دەزانی و کوڕ و کچیان بۆ خوای موتەعال بڕیار ئەدا، گوایە کچەکانیان دەکوشت بۆ ئەوەی ببنە فریشتە و فریشتەشیان بە منداڵی خوا دەزانی، پەنا بە خوای گەورە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ فَٱعْبُدُوهُ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾﴾ الأنعام

واتە: لەناو مرۆڤدا کەسانێك هەن کە جنیان کردووە بە شەریك بۆ خوای گەورەو عیبادەتیان دەکەن و بەگەورەیان دەزانن، یان گوێڕایەڵی جنیان کردووە لە پەرستنی بتەکانیان لە کاتێکدا

کە ئەزانن خوای گەورە ئەوانی دروست کردووە نەك جنییەکان، ئەوانی دروست کردبێ ئەی بۆ ئەیانکەنە شەریك بۆ خوای گەورە، موشریکەکان ئەیانووت: مەلائیکەت کچی خوایە، گاورەکان ئەیانووت: (عیسا) کوڕی خوایە، جوولەکە ئەیانووت: عوزێر کوڕی خوایە، کوڕو کچیان بۆ خوای گەورە بڕیار ئەداو درۆیان هەڵئەبەست بەبێ ئەوەی کە زانیاریان هەبێ بەڵکو لە نەزانی و نەفامییانەوە بوو پاك و مونەززەهی و بەرزو بڵندی بۆ خوای گەورە، خوای گەورە زۆر لەوە پاك و مونەززەهو بەرزو بڵندترە لەو قسە پووچەڵانەی کە ئەوان ئەیکەن کە کوڕو کچ ئەدەنە پاڵ خوای گەورە، خوای گەورە پێویستی پێی نییە﴿١٠٠﴾ خوای گەورە داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییەو دروستی کردوون بە شێوازێك کە پێشتر وانەبوون، خوای گەورە چۆن منداڵی ئەبێت لە کاتێك کە خێزانی نییە، ئەمە شتێکی ئەستەمە خوای گەورە هەموو شتێکی دروست کردووە بە مەلائیکەت و (عیسا) و عوزێرو هەموو ئەو کەس و شتانەی تر کە ئەوان ئەیدەنە پاڵ خوای گەورە، هەمووی عەبدو دروستکراوی خوای گەورەن، خوای گەورە زانیاری بەهەموو شتێك هەیە﴿١٠١﴾ ئەو (الله) یە کە پەروەردگاری ئێوەیە هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە شایەنی پەرستن بێ تەنها زاتی پیرۆزی (الله) نەبێت کە دروستکاری هەموو شتێکە، ئێوە بەتاك و تەنها عیبادەت بۆ ئەو خوایە بکەن چونکە تەنها ئەو شایەنی پەرستنە و هەر ئەو تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و پارێزەری هەموو شتێکە﴿١٠٢﴾ چاوەکان ناتوانن خوای گەورە ببینن لە دونیادا، بەڵام لە قیامەتدا باوەڕداران خوای گەورە ئەبینن (الْقِيَامَة) واتە: کۆمەڵێك ڕوو گەشاوەو پرشنگدارە لە ڕۆژی قیامەت لەبەر ئەوەی تەماشای خوای گەورە ئەکەن و فەرموودەکانیش موتەواتیرن کە هیچ گومانێکی تیا نییە لەسەر ئەوەی کە ئیمانداران لە ڕۆژی قیامەت، لە بەهەشتدا خوای گەورە ئەبینن، بەڵام خوای گەورە هەموو چاوەکان ئەبینێ و حەقیقەتی ئەزانێ و ئاگای لێیەو هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە، خوای گەورە زۆر نەرمونیانە بە بەندەکانی، یان هەست بە نهێنییەکان دەکات بە ئاسانی، زانیارییەکی زۆر وردی هەیە﴿١٠٣﴾

جا کە خوای موتەعال بۆی ڕوونکردنەوە کە هاوشێوەی نییە لە هیچ شتێکیدا ئینجا بیر و باوەڕی دامەزراندن لەسەر ڕێبازی و موحتاجی خوای گەورە لە بەرانبەر هەموو کەون و مرۆڤ و جنۆکە فەریشتەو گیانلەبەرو ماددەو وزەدا و پێویستی بە هاوەڵ و ڕێنیشاندەرو منداڵیش نییە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾﴾ الإخلاص

واتە: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: خوای گەورە تاك و تەنهایەو هاوشێوەی نییە﴿١﴾ هەموو دروستکراوەکان پێویستیان بە خوای گەورەیە و خوای گەورە پێویستی بە هیچ کەسێك نییە﴿٢﴾ خوای گەورە کەسی لێ نەبووە خۆیشی لە کەس نەبووە﴿٣﴾ خوای گەورە هاوشێوەی نیەو

هیچ لە دروستکراوەکانی خوای گەورە لە خوای گەورە ناچن، نە منالّی هەیە، نە دایکی هەیە، نە باوکی هەیە، نە خێزانی هەیە﴿٤﴾

ئەگەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵە بەڕێزەکانی وەکو پەناهەندەی نارده وڵاتی حەبەشە، پاشان زۆرێک لە ناو عەرەبی ڕۆمەکاندا نەسرانی بوون، بە تەواوەتی بەیانی قورئانی هات کە ئەو بیرو باوەڕە هەڵە و چەوتەو خوای موتەعال قبوڵی نییە، موسڵمانان کاربکەن و بانگەواز بکەن بۆ ڕاستکرنەوەی ئەو چەمکانەی کە نەسارا وەیانگرتووە، خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ۚ إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۖ وَلَا تَقُولُوا۟ ثَلَـٰثَةٌ ۚ ٱنتَهُوا۟ خَيْرًا لَّكُمْ ۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ سُبْحَـٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٌ ۘ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٧١﴾ لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْتَنكَفُوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧٣﴾﴾ النساء

واتە: ئەی ئەهلی کتاب ئەی جولەکەو گاورەکان زیادڕەوی مەکەن و سنوور مەبەزێنن لە دینەکەتاندا، ئەوەی حەق نەبێ مەیڵێن بۆ خوای گەورەو درۆی بۆ هەڵمەبەستن و خێزان و منداڵی بۆ بڕیار مەدەن، بەڵکو (عیسا)ی کوڕی مەریەم تەنها بەندەو پێغەمبەری خوایەو کوڕی خوا نییە، وشەیەکی خوای گەورە بووە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ مەریەم کە وشەکەش (كُنْ) بوو خوای گەورە بە جبریلی فەرموو پێی بفەرمە: (كُنْ) دروست بە، بەو وشەیە یەکسەر (عیسا) دروست بوو، ڕوحێك بوو کە لەلایەن خوای گەورەوە خوای گەورە کردیە بەر (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ)، ئێوە ئیمان بەخواو بەسەرجەم پێغەمبەرانی خوای گەورە بێنن کە خوای گەورە تاك و تەنهایەو منداڵ و خێزان و شەریکی نیە، پێغەمبەرانیش بەندەو نێردراوی خوای گەورەن مەڵێن: سێ خوا هەیە، واز لەم بیروباوەڕی سێ خوایەتییە بێنن، ئەوە بۆ خۆتان باشترەو لەسەر کوفر بەردەوام مەبن، لەبەر ئەوەی زاتی پیرۆزی (الله) تاك و تەنهایە و هیچ شەریکێکی نییە، پاك و مونەززەهی بۆ خوای گەورە کە زۆر لەوە پاکترە کە منالّی هەبێ و پێویستی بە منال بێ، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندا هەیە هەر هەمووی موڵکی خوای گەورەیە، چ پێویستی بە شەریك و بە منال هەیە، ئەگەر هەمووی موڵکی خوا بێ موڵك چۆن ئەبێ بە شەریکی خاوەنەکەی﴿١٧١﴾ (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) ڕەتی ناکاتەوە و خۆی بە گەورە نازانێ لەوەی کە عەبدی خوای گەورە بێ، بەڵکو شانازی دەکات بە عبودیەت و بەندایەتی کردنی بۆ خوای گەورە،

تەنانەت فریشتە نزیکەکانیش لە خوای گەورە ئەوانیش خۆیان بەگەورە نازانن و ڕەتی ناکەنەوە کە عەبدو بەندەی خوای گەورە بن، هەر کەسێك عیبادەتی خوا ڕەت بکاتەوەو خۆی بە گەورە بزانێت ئەوە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت هەر هەموویان کۆ دەکاتەوە و سزایان ئەدات﴿١٧٢﴾ بەڵام ئەو کەسانەی کە ئیمانیان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە ئەوە خوای گەورە ئەجرو پاداشتی خۆیان بەتەواوی ئەداتەوە هیچیان لێ کەم ناکات، خوای گەورە فەزڵی زیادەی خۆیان پێ ئەبەخشێ و چاکەی زیاتریان لەگەڵدا دەکات بەڵام ئەوانەی کە عیبادەتی خوای گەورە ڕەت ئەکەنەوە و خۆیان بەگەورە ئەزانن لە ئاست عیبادەت و پەرستنی خوای گەورە، ئەمانە خوای گەورە سزایەکی زۆر بەئێش و ئازاریان ئەدا، جگە لە خوای گەورە نابینن کەسێك دۆست و سەرخەرو یارمەتیدەرو پشتیوانیان بێ و ڕزگاریان بکات لە ئاگری دۆزەخ﴿١٧٣﴾

لەگەڵ چاکردنەوەی تەواوی بیر و باوەڕەکانی نەسرانی لەگەڵیدا ئەگەر گوێی بۆ نەگیرا ئەوا تووشی سزای سەخت دەبنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا چونکە زۆر زیادە ڕەوییان دەکرد لە بەرانبەر حەزرەتی (عیسا)ی کوڕی مەریەم دا هەر بۆیە خوای موتەعال مرۆڤ بوونی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) ڕادەگەیەنێت، کە وەک ئادەم مرۆڤە وەکو ئەوە ژیان و مردنی واتا لە ڕەگەزی جیاوازتر نییە، چۆن ئادەم لە دایک بووە، (عیسا)ی کوڕی مەریەمیش هەر لە دایک بووە هەمان قۆناغ و زەمەن مرۆڤی پێغەمبەر ناسراوە.

خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴿٥٩﴾﴾ آل عمران

واتە: نموونەی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەلای خوای گەورە وەکو نموونەی ئادەم وایە کە خەلقی کرد لە خۆڵ، ئیتر بۆچی باوەڕ بە (عیسا) ناهێنن خۆ ئەوەتا باوەڕتان بە ئادەم هەیە پاشان پێی فەرموو ببە یەکسەر دروست بوو ﴿٥٩﴾

خوای پەروەردگار لە ڕووی ئەقڵانییەوە ئاراستەی کۆمەڵگەی جیهان دەکات تا ڕۆژی قیامەت، دەفەرموێت کە خاوەنی زەوی و ئاسمان و هەموو سیستەمی ئەم گەردوونەیە، یاسای بۆ ڕێکخستووە هەموو بەدیهێنراوەکانی تێدا بەدی هێناوە، ئیتر پێویستی بەچییە بە مرۆڤێک کە بیکاتە کوڕی خوا، پەنا بە خوا، کاتێک کە پێغەمبەرانی ناردووە بۆ پێداویستی ئێمەی مرۆڤ نەکو خوای موتەعال پێویستی پێی بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴿١١٦﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴿١١٧﴾﴾ البقرة

واتە: جوولەکە وتیان: خوای گەورە کوڕی هەیە کە وتیان: عوزێر کوڕی خوایە، گاورەکان وتیان: خوای گەورە کوڕی هەیە کە (عیسا) کوڕی خوایە، عەرەبە کافرەکان ئەیانووت: مەلائیکەت کچی خوایە پەنا بەخوای گەورە پاك و مونەززەهی بۆ خوای گەورە، خوای گەورە زۆر لەوە گەورەترە کە پێویستی بە منداڵ بێت، بەڵکو هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەمووی موڵکی خوای گەورەیە تەنانەت عوزێرو (عیسا) و مەلائیکەتیش هەموویان عەبدی خوای گەورەن، هەموویان عیبادەت بۆ خوای گەورە ئەکەن و ملکەچن بۆ فەرمانی خوای گەورە(١١٦) خوای گەورە داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە کە پێشتر بەم شێوازە نەبووە، خوای گەورە بیەوێ هەر بڕیارێك بدات و هەر شتێك دروست بکات لەبەر تەواوی دەسەڵاتی تەنها ئەفەرموێت: ببە یەکسەر ئەو شتە دروست دەبێت(١١٧)

ئەمەش بەو واتایە نییە تەنها ئەهلی کیتاب بانگەشەی ئەم جۆرە بیرو باوەڕە بەتاڵ و کوفر و خورافیانە بکەن، بەڵکو تێکەڵاو بەدینەکەیان بووە لە لایەن بت پەرستەکانەوە کە لە ڕابردوودا بت پەرست بوون، چۆن هاوەڵدانەرانی عەرەب فریشتەکانیان بە کچی خوا دەزانی پەنا بە خوا، خوای موتەعال کە حاڵەتەکەمان بۆ دەست نیشان دەکات دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًاۚ أَشَهِدُواْ خَلۡقَهُمۡۚ سَتُكۡتَبُ شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ(١٩)﴾ الزخرف

واتە: ئەو فریشتانەش کە لە حەقیقەتدا بەندەی خوای گەورە بوونەو عیبادەتیان بۆ خوای گەورە کردووە، ئەمان ئەیانووت: ئەمانە کچی خوان، ئایا کاتێك خوای گەورە فریشتەی دروست کردووە ئەمان ئامادەی دروست کردنیان بوونە تا بزانن ئەمانە مێن، ئەم شایەتییەیان لە پەڕاوی کردەوەکانیان ئەنووسرێ و لە ڕۆژی قیامەتیشدا پرسیاریان لێ ئەکرێ دەربارەی(١٩)

هەروەها لە جێگای تردا دەست نیشانی حاڵەتەکەمان بۆ دەکات وەڵامەکەی لەگەڵدا دەنێرێت، تا پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر بۆیان ڕوون بکاتەوە دەفەرموێت: ﴿فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَلِرَبِّكَ ٱلۡبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلۡبَنُونَ(١٤٩) أَمۡ خَلَقۡنَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمۡ شَٰهِدُونَ(١٥٠) أَلَآ إِنَّهُم مِّنۡ إِفۡكِهِمۡ لَيَقُولُونَ(١٥١) وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ(١٥٢) أَصۡطَفَى ٱلۡبَنَاتِ عَلَى ٱلۡبَنِينَ(١٥٣) مَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ(١٥٤) أَفَلَا تَذَكَّرُونَ(١٥٥) أَمۡ لَكُمۡ سُلۡطَٰنٞ مُّبِينٞ(١٥٦) فَأۡتُواْ بِكِتَٰبِكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ(١٥٧) وَجَعَلُواْ بَيۡنَهُۥ وَبَيۡنَ ٱلۡجِنَّةِ نَسَبٗاۚ وَلَقَدۡ عَلِمَتِ ٱلۡجِنَّةُ إِنَّهُمۡ لَمُحۡضَرُونَ(١٥٨) سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ(١٥٩) إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ(١٦٠) فَإِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ(١٦١) مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ بِفَٰتِنِينَ(١٦٢) إِلَّا مَنۡ هُوَ صَالِ ٱلۡجَحِيمِ(١٦٣) وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٞ مَّعۡلُومٞ(١٦٤) وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلصَّآفُّونَ(١٦٥) وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلۡمُسَبِّحُونَ(١٦٦) وَإِن كَانُواْ لَيَقُولُونَ(١٦٧) لَوۡ أَنَّ عِندَنَا ذِكۡرٗا مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ(١٦٨) لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ(١٦٩)﴾ الصافات

واتە: ئەی محمد ﷺ تۆ پرسیار لە کافرانی تا قورەیش بکە وەکو بەرهەڵستی کردن و نکوڵی کردن، ئایا ئەوان بۆچی ئەڵێن: مەلائیکەت کچی خوای گەورەیە، لەکاتێکدا بۆ خۆیان ڕازی نابن کچیان ببێت و کچ زیندە بەچاڵ ئەکەن، ئایا خوای گەورە کچی هەیەو ئەوان کوڕیان هەیە! چۆن بە شتێك بۆ خۆیان ڕازی نابن ئەیدەنە پاڵ خوای گەورە؟﴿١٤٩﴾ یاخود ئایا ئەگەر مەلائیکەت کچ بن، ئێمە کاتێك مەلائیکەمان دروست کردووە ئەوان ئاگادار بوونەو بینیویانە، چۆن ئەزانن مەلائیکەت کچە﴿١٥٠﴾ نەخێر ئەمە تەنها درۆ هەڵبەستن و بوهتانێکەو لە بوهتانکردندا ئەوان ئەڵێن:﴿١٥١﴾ خوای گەورە منداڵی بووە، بە دڵنیایی ئەوان درۆ ئەکەن﴿١٥٢﴾ ئایا خوای گەورە کچی هەڵبژاردووە بەسەر کوڕدا لە کاتێك ئێوە خۆتان بە کچ ڕازی نین﴿١٥٣﴾ ئەوە چیتانەو چۆن بڕیارێکە بۆ خوای گەورەی ئەدەن ﴿١٥٤﴾ ئەوە بۆ بیر ناکەنەوەو پەندو ئامۆژگاری وەرناگرن لەسەر پووچەڵی و بەتاڵی ئەو قسەیەی خۆتان﴿١٥٥﴾ یاخود بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراتان هەیە لەسەر ئەم قسانەی کە ئێوە ئەیکەن﴿١٥٦﴾ ئەگەر بەڵگەیەك و کتابێکی ئاسمانیتان هەیە ئەم شتانەی تیا نووسراوەتەوە بیهێنن ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن،﴿١٥٧﴾ ئەیانووت: خوای گەورە لەگەڵ جنیەکاندا نەسەب لە نێوانیاندا هەیە (وَالْعِيَاذُ بِالله) ئەیانووت: ژن و ژنخوازی لە نێوانیاندا هەیە، خوای گەورە داوای جنی کردووە، جنیان داوەتەوە خوای گەورەو مەلائیکەتیش لەو بووە لە کاتێکدا کە جنیە کافرەکانیش ئەزانن ئامادەی ئاگری دۆزەخ و سزای خوای گەورە ئەبن لەسەر ئەم درۆ هەڵبەستنانە﴿١٥٨﴾ پاك و مونەززەهی بۆ خوای گەورە لەو وەسفانەی کە ئەوان ئەیدەنە پاڵ خوای گەورە کە خوای گەورە پاك و بێگەردە لەوەی کە خێزان یان منداڵی هەبێت﴿١٥٩﴾ تەنها بەندە دڵسۆزەکانی خوای گەورە ئامادەی سزای خوای گەورە نابن، یاخود ئەو وەسفانە نادەنە پاڵ خوای گەورە بەڵکو بەتاك و تەنها خوای گەورە ئەپەرستن و خوای گەورە بە پاك ڕائەگرن لە هەموو وەسفێك کە شایانی خوای گەورە نەبێت﴿١٦٠﴾ ئێوە خۆتان و خواکانتان﴿١٦١﴾ ناتوانن کەس گومڕا بکەن و کەس شوێنتان ناکەوێت﴿١٦٢﴾ تەنها مەگەر کەسێك خۆی بەردەوام بێ لەسەر کوفرو خۆی بیەوێ بچێتە دۆزەخەوەو دۆزەخ هەڵبژێرێ﴿١٦٣﴾ فریشتەکان ئەڵێن: هیچ کەسێك لە ئێمە نییە تەنها شوێنی دیاریکراوی خۆمان هەیە لە ئاسماندا خوای گەورەی لێ دەپەرستین و ئەو شوێنە تێناپەڕێنین﴿١٦٤﴾ ئێمە هەموومان پۆل پۆل ڕاوەستاوین لە ئاسمان عیبادەتی خوای گەورە ئەکەین، هەروەکو چۆن باوەڕدارانیش لە نوێژەکاندا پۆل پۆل ڕائەوەستن و عیبادەتی خوای گەورە ئەکەن﴿١٦٥﴾ ئێمە تەسبیحات و نوێژو عیبادەت و زیکری خوای گەورە ئەکەین، واتە: ئێمە کچی خوای گەورە نین بەڵکو بەندەی ملکەچ و گوێڕایەڵی خوای گەورەین﴿١٦٦﴾ هەر چەندە

موشریکان ئەیانووت:﴿١٦٧﴾ ئەگەر کتابێکمان هەبوایە وەك ئەوەی بۆ ئوممەتانی پێشتر هاتووە وەك تەورات و ئینجیل﴿١٦٨﴾ ئەوە ئێمەش ئەبووینە بەندەی دڵسۆزی خوای گەورەو بە دڵسۆزی عیبادەتی خوای گەورەمان ئەکردو کوفرمان نەئەکرد﴿١٦٩﴾

پاشان بۆ ئەوەی عەرەب بە گشتی و ئەهلی کیتاب بزانن، کە محمد ﷺ هاتووە بەندەیەکە لە بەندەکانی خوای موتەعال، ئەوەشی ئێوە بە دەمتاندا دێت هەمووی درۆ و بوختانە لە بەرانبەر خوای موتەعالدا کە کوڕ و شەریکی بۆ بڕیار ئەدەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١ قَيِّمٗا لِّيُنذِرَ بَأۡسٗا شَدِيدٗا مِّن لَّدُنۡهُ وَيُبَشِّرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا حَسَنٗا ٢ مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدٗا ٣ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا ٤ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٖ وَلَا لِأٓبَآئِهِمۡۚ كَبُرَتۡ كَلِمَةٗ تَخۡرُجُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبٗا ٥﴾ الكهف

واتە: حەمدو سەناو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم قورئانە پیرۆزەی دابەزاندۆتە سەر عەبدی خۆی کە محمدە ﷺ و هیچ گێڕی و خواری و کەمو کووڕی و نوقستانی و جیاوازییەکی تیا نییە نە لە لەفزدا نە لە مانادا﴿١﴾ بەڵکو لەوپەڕی دامەزراوی و ڕێکیدایەو هیچ گێڕی و خوارییەکی تیانیە و باڵادەستە بەسەر کتێبە ئاسمانییەکانی پێشتردا، تا ئاگاداری کافران بکاتەوە بە سزایەکی سەخت لەلایەن پەروەردگارەوە، ئەگەر ئیمان نەهێنن موژدە بدات بەو باوەڕدارانەی کە کردەوەی چاك ئەکەن کە ئەجر و پاداشتێکی چاکیان بۆ هەیە کە بەهەشتە﴿٢﴾ لەناو ئەو ئەجرو پاداشتە باشەدا لە بەهەشتدا بۆ هەمیشەیی ئەمێننەوە هیچ پچڕانێکی بەسەردا نایەت و نافەوتێ﴿٣﴾ ئاگاداری ئەو کەسانە بکاتەوە کە ئەڵێن خوای گەورە منداڵی بۆ خۆی بڕیار داوە وەکو جوولەکەو گاورو هەندێك لە موشریکان﴿٤﴾ کە هیچ زانیارییەکیان نییە بەم شتە نە خۆیان نە باوك و باپیرانیان و هیچ بەڵگەیەکی ڕاستیان نییە، بەڵکو لە گومڕایی خۆیاندا وا ئەڵێن ئەم وشەیە زۆر گەورەیە کە لە دەمیان دێتە دەرەوە کە بوهتان بۆ خوای گەورە ئەکەن، هیچ شتێك ناڵێن تەنها درۆ نەبێ ئەمە درۆیەکەو ئەیکەن و هیچ بواری ڕاستی تیانییە﴿٥﴾

هەروەها بەشێکی تر لە وتەی موشریکەکان باس دەکات خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ٦٩ مَتَٰعٞ فِي ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ٧٠﴾ یونس

واتە: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەو کەسانەی درۆ بۆ خوای گەورە هەڵئەبەستن و درۆ ئەدەنە پاڵ خوای گەورە، ئەوانە ڕزگارو سەرفراز نابن نە لە دونیا نە لە قیامەت﴿٦٩﴾ لە دونیادا لەوانەیە هەندێك بۆ خۆیان ژیان بەسەربەرن، بەڵام دواتر گەڕانەوەیان بۆ لای خوای گەورەیە، پاشان سزای سەختیان پێ ئەچێژین بەهۆی ئەو کوفرەی کە ئەیانکرد و ئەیانووت: خوای گەورە منالی هەیە﴿٧٠﴾

زۆرینەی ئایەتەکانی مەککە چارەسەری کێشەی بیروباوەڕە لەسەر ئەو پرسە ئەدوێت و ئاڕاستەی ئوممەتی موسڵمان دەکات بە گشتی، لە لایەکی تریشەوە هەمووی بەرپەرچێکی ئەقڵانی و لۆژیکی پوختە بۆ مرۆڤەکان کە خوای موتەعال پێویستی بە هاوبەش و کوڕ و کچ نییە، ئەوەی کە زیاتر قورئان جەختی لە سەر دەکاتەوە مرۆڤ بوونی (عیسا)ی کوڕی مەریەمە و دایکێتی کە ئافرەتیکی پاک و بەڕێزە، بەڵام مرۆڤ وەکو هەموو مرۆڤەکانی تری سەر زەوی خەوتوون و ژیاون و چوونەتە بازار بۆ پێداویستی کڕین و فرۆشتنیان کردووە، ئەو سێ پێکهاتەیەی کە فەلسەفەکەی کۆنی میسری دایڕشتبوو لە کۆندا، پاشان نەسرانییەکان کردیانە ئایینی حەزرەتی (عیسا) دوای چەند سەدەیەک کە بە خوا دەڵێن خواش پێکهاتووە لە ( (عیسا) و ڕۆحی قودس و خودی الله)

خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ ٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ۗ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾﴾ المائدة

واتە: بەدڵنیایی ئەو کەسانە کافر بوون کە ئەیانووت: بەڕاستی خوای گەورە (عیسا)ی کوڕی مەریەمەو (عیسا) خوایە، ئەمانە کافرن، ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: کێ توانای بەسەر خوای گەورەدا هەیە و ئەتوانێ ڕێگری لە خوای گەورە بکات ئەگەر بیەوێ (عیسا)ی کوڕی مەریەم و مەریەمی دایکیشی لەناوبدات؟ ئەی کە مەریەم مرد کێ هەبوو بتوانێ مردنی لێ بگەڕێنێتەوە؟ یان کە ئێوە ئەڵێن: (عیسا) کوژراوە ئەگەر ئەمە خوا بوایە چۆن خوا ئەکوژرێ؟! چۆن خوا لە خاچ ئەدرێ؟! چۆن خوا ناتوانێ بەرگری لە خۆی بکات؟! نەك ئەمانە بەڵکو ئەگەر هەرچی لەسەر ڕووی زەوی هەیە خوای گەورە بیەوێ هەموویان لەناو بدات، کێ هەیە ڕێگری لە خوای گەورە بکات و مەنعی خوای گەورە بکات؟! بە دڵنیایی کەس نییە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیان دا هەیە هەمووی موڵکی خوای گەورەیە خوای گەورە ئەوەی ویستی لێ بێت دروستی دەکات، خوای گەورە تواناو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە﴿١٧﴾

پاشان خوای موتەعال وەکو فلاشێک بۆ نەساراو یەهوود وتەکانی حەزرەتی مەسیح-یان بۆ دەگێرێتەوە و دەفەرموێت: ﴿وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٞ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ۝٧١ لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ وَقَالَ ٱلۡمَسِيحُ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۖ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ۝٧٢ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ۝٧٣ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝٧٤ مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ۝٧٥﴾ المائدة

واتە: وایانزانی کە خوای گەورە تاقیان ناکاتەوەو سزایان نادات لەسەر ئەم شتە، بۆیە خۆیان کوێر کرد لە ئاست بینینی حەق و هیدایەتدا، خۆیان کەڕ کرد لە ئاستی بیستنی حەق و هیدایەتدا، سەرپێچی ئەحکامەکانی تەوراتیشیان ئەکرد و پێغەمبەرانیان ئەکوشت دوای ئەوە کاتێك کە تەوبەیان کرد خوای گەورە تەوبەی لێیان قبوڵ کرد دیسانەوە زۆرێك لەوان خۆیان کوێرو کەڕ کرد لە ئاست بینین و بیستنی حەقدا، خوای گەورە زۆر بینایە بە کردەوەکانی ئێوەو هەموو کردەوەکانتان ئەبینێت۝٧١ بەدڵنیایی ئەو کەسانە کافر بوون کە ئەیانووت: خوای گەورە (عیسا)ی کوڕی مەریەمە کە ئەیانووت: خوای گەورە تێکەڵ بووە لەگەڵ (عیسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ)-دا خوای گەورەش ڕەددیانی دایەوە بەوەی فەرمووی: (عیسا عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ) فەرمووی: ئەی بەنی ئیسرائیل ئێوە عیبادەتی الله بکەن، عیبادەتی من مەکەن کە الله پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە، منیش هەر عەبدی خوام و عیبادەتی خوای گەورە ئەکەم ئێوەش لەگەڵ مندا عیبادەتی خوای گەورە بکەن، ئەمە هەر قسەی (عیسا)یە (عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ) هەر کەسێك شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار بدات و من بکاتە شەریك بۆ خوای گەورە یان هەر کەسێکی تر بکاتە شەریك بۆ خوای گەورە ئەو کەسە ستەمکارو موشریکانە هیچ کەسێك نییە کە پشتیوانیان بێ و لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان بکات۝٧٢ بەدڵنیایی ئەو کەسانە کافربوون کە ئەیانووت: سێ خوا هەیەو خوای گەورە یەکێکە لە سێ خوایەکە کە مەبەستیان زاتی پیرۆزی (الله) و (عیسا) و مەریەم بوو، ئەم ئایەتە لەسەر گاورەکان دابەزی ئەوان وا دەڵێن لە کاتێکدا کە هیچ خواو پەرستراوێك نییە بەحەق شایەنی پەرستن بێ تەنها زاتی پیرۆزی الله نەبێت، ئەگەر واز نەهێنن لەو قسەو کوفرانەی کە ئەیکەن، ئەو کاتە کافران تووشی سزایەکی زۆر بەئێش و ئازار ئەبن لەلایەن خوای گەورەوە۝٧٣ ئەوە بۆ تەوبە ناکەن و بۆ لای خوای گەورە ناگەڕێنەوەو داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە ناکەن بۆ ئەو هەموو بوختانەی کە بۆ خوای گەورەتان هەڵبەستووە و خوای گەورەتان لە خۆتان تووڕە

کردووە لە کاتێك ئەگەر ئێوە تەوبە بکەن، خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بەڕەحم و بەزەییە﴿٧٤﴾ (عیسا)ی کوڕی مەریەم هیچ شتێك نەبووە نە خوا بووەو نە کوڕی خوا، بەڵکو تەنها پێغەمبەری خوا بووە، چەندەها پێغەمبەرانی تریش لە پێش (عیسا)وە ڕۆیشتوونە و مردووون، دایکیشی ڕاستگۆ بووە کە هەردووکیان خواردنیان ئەخوارد سەیر بکەو بزانە چۆن ئێمە ئایەتەکانی خۆمانیان بۆ ڕوون ئەکەینەوە، پاشان تەماشا بکەن ئەمان چۆن لە حەق لائەدەن لەدوای ئەم ڕوون کردنەوەیەش﴿٧٥﴾

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴿١١٨﴾﴾ المائدة

واتە: خوای گەورە بە (عیسا)ی کوڕی مەریەم ئەفەرمووێت: کاتێك کە بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان یان لە ڕۆژی قیامەتدا، ئایا تۆ بە خەڵکیت وتووە من و دایکم بکەن بە دوو خواو لە غەیری خوای گەورە ئێمە بپەرستن، (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) فەرمووی: پاك و مونەزەهی بۆ تۆ ئەی پەروەردگار لەوەی کە تۆ شەریکت هەبێ یان ئێمە شەریکی تۆ بین من شتێك کە حەق و مافی من نەبێ چۆن قسەی وا ئەکەم ئەمە بۆ من نییە شتی وا بڵێم، ئەگەر قسەی وام کردبێ ئەی پەروەردگار خۆت عیلم و زانیاریت پێیە تۆ ئەزانی لە نەفسی مندا چی هەیە، من نازانم چی لە نەفسی تۆدا هەیە، هەر تۆ زانای هەموو نهێنییەکانی﴿١١٦﴾ هیچ شتێکم پێیان نەوتووە تەنها ئەو شتە نەبێ کە تۆ فەرمانت بەمن کردووە، من پێیانم وتووە ئێوە عیبادەتی (الله) بکەن کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە، تا خۆم لە ناویاندا بووم من شایەت بووم بەسەریانەوەو چاودێریانم ئەکرد، بەڵام کاتێك کە منت بەرز کردەوە بۆ ئاسمان[59]، کە منت بەرز کردەوە تۆ خۆت چاودێر بووی بەسەریانەوە و ئاگاداریان بووی، شایەت بووی بەسەریانەوە، تۆ شایەتی بەسەر هەموو شتێکدا﴿١١٧﴾ ئەی پەروەردگار ئەگەر سزایان بدەی ئەوا ئەوان بەندەی تۆن، گەر لێشیان خۆشبیت ئەوە تۆ زۆر بە عیززەت و باڵادەستی و زۆر کاربەجێی﴿١١٨﴾

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

59 - لێرە (وەفات) بەمانای مردن نایەت، بەڵکو عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ماوە و دەمێنێت تا ڕۆژی قیامەت وەکو لە چەندەها فەرموودەدا هاتووە کە خوای گەورە دایئەبەزێنێ و دەجال ئەکوژێت.

بنەمای بیروباوەڕی ئیسلامی لەسەر بنەمای کاروانی پێغەمبەران دامەزراوە، هەموو پێغەمبەران وەکو مامۆستا ئەو مەنهەج و وانەی خۆیان پێشکەش کردووە بۆ ژیانی مرۆڤەکان، تا بنەمای بیر و باوەڕیان دابڕێژن، چونکە مرۆڤ ئەگەر موشریک بوو پەنا بە خوا، هەموو کردەوەکانی بەتاڵ دەبێتەوە، هیچی وەرناگیرێت، بێجگە ئەوەش کە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکرێت، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: داوای شەفاعەتم کرد بۆ ئوممەتەکەم لە ڕۆژی قیامەت دا، خوای پەروەردگار پێی بەخشیم، بەپشتیوانی خوا هەڵدەستم بە ئەنجامدانی ئەو شەفاعەتە بۆ هەموو ئوممەتەکەم، ئەم شەفاعەتەش ئەوانە ناگرێتەوە کە هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار داوە، بە پێچەوانەوە شەفاعەتەکە بۆ ئەوانەیە کە هیچ هاوبەش و شیرکێکیان بڕیار نەداوە.[60]

لەبەر ئەوەی سێ بەشی قورئان ڕاستەوخۆ باسی عەقیدەیە، بەشەکانی تریش کە پێکاهووە لە باسی پێغەمبەران ڕەوشت و شەریعەت، ئەو بەشانەش هەمووی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هەر دەچنەوە خانەی بیرو باوەڕی ئیسلامی، لە فەرموودەی قودسی دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوای موتەعالەوە دەگێڕێتەوە، ئەو کەسەی کە هاوبەش و شەریک بۆ خوای موتەعال دابنێ واتا جنێوی بە خوای پەروەردگار داوە.[61]

هاوبەش دانان هەروا ئاسان نییە، ئەگەر نموونەیەک وەربگرین هەرچەندە خوای موتەعال لەسەر هەموو نموونەیەکەوەیە، هیچ کەس لەم ژیانەدا ڕازی نابێت نزیکترین کەسی لە ماڵ وسەروەت و سامانیدا ببێتە هاوبەش وشەریکی هەروا بە هەوانتە، لە کاتێکدا خۆی خاوەنی سامان و ماڵ و پارەی خۆیەتی نایبەخشێتە کەسێکی تر.

خوای موتەعال کە هاوشێوەی نییە و هیچ لە زاتی بەرزی ناچێت، ئاخر چۆن دەبێت مرۆڤ و مانگاو بت و دارو بەرد بکەینە شەریکی؟ ئیتر چۆن تورە نابێت لە کاتێکدا خاوەنی ئەم گەردوونەیە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّوْ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّٱصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ۝ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّـٰرُ ۝﴾ الزمر

[60] - لكلِّ نبيَ دعوةٌ مستجابةٌ ، فتعجّل كلُّ نبيَ دعوتَه ، وإني اختبأتُ دعوتي شفاعةً لأمتي ، فهي نائلةٌ من مات منهم لا يشركُ بالله شيئًا./ أخرجه البخاري (٦٣٠٤)، وأحمد (٨٩٥٩) مختصراً، ومسلم (١٩٩)، والترمذي (٣٦٠٢)، وابن ماجه (٤٣٠٧).

[61] عن عبدِ الله بن عباس رضي الله عنه أن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: قال الله عز وجل: كَذَّبَني ابنُ آدم ولم يكنْ له ذلك، وشتمني ولم يكنْ له ذلك، أما تكْذيبه إياي فقوله: لنْ يعيدني كما بدأني، وليس أوّل الخلقِ بأهون عليّ منْ إعادتِه، وأمّا شَتْمه إيّايَ فقوله: اتخذ اللّه ولدا، وأنا الأحد الصمد، الذي لم يلدْ ولم يولدْ ولم يكنْ له كفوا أحد./رواه البخاري.

واتە: ئەگەر خوای گەورە بیوستایە منداڵێك بۆ خۆی بڕیار بدات، ئەوە لەناو دروستکراوانی ئەوەی کە خۆی ویستی لێبوایە هەڵیئەبژارد، پاك و مونەززەهی بۆ خوای گەورە، خوای گەورە پێویستی بە منداڵ نییە، دروستکراو چۆن ئەبێ بە منداڵی خالق و دروستکار هەر خوای گەورەیە کە تاك و تەنهایە و زۆر باڵادەستە﴿٤﴾ خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە بە حەق، بێهودە و بێ حیکمەت دروستی نەکردووە شەو بە دوای ڕۆژدا ئەهێنێت و بە تاریکی شەو ڕۆژ دائەپۆشێ، بە ڕووناکی ڕۆژ شەو دائەپۆشێت و بەخێرایی بە دوای یەکدا دێن خۆر و مانگی ژێربار کردووە بۆ بەرژەوەندی ئێوە، هەر یەکێك لەمانە ئەڕۆن بۆ کاتی دیاریکراوی خۆیان کە کۆتایی هاتنی دونیایە، بزانن هەر خوای گەورەیە زۆر بە عیززەت و لێخۆشبووە﴿٥﴾

ژیانی حەزرەتی (عیسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) بۆ پێغەمبەری نازدار صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕوونکردنەوەی زیاتری دایە ئوممەتەکەی کە یەکتاپەست بن، سێ ساڵ ژیانی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی (عیسا) کوڕی مەریەم، پانتاییەکی فراوانی بیر و باوەڕی گرتەوە، چۆن دەکرێت پێغەمبەرێک کە ژیانی ئاسایی مرۆڤی بووە بکرێتە خوا، کە بە قۆناغی منداڵی تێپەڕیوە، پێداویستی هەبووە شیری خواردووە و پاشان خۆی پیس کردووە، دایکی پاکی کردۆتەوە، وردە وردە گەورە بووە، وەکو هەموو منداڵانی تر برسی بووە تینووی بووە، سەرما و گەرمای بووە، پێداویستی هەبووە، ئاخر ناکرێت و نابێت کەسێک ئەوەندە موحتاج بێت بە دایکی و دەورو پشتی و پێداویستی هەبێت بۆ خۆی، ئەمەچۆن دەبێتە خوا؟!

چۆن دەکرێت خوا بە دەستی مەخلوق لە سێدارە و لە خاچ بدرێت، گوایە لەبەر خاتر تاوانەکانی مرۆڤ، ئەمە چ ئەقڵانییەک و مەنطقێک (لۆژیک) قبوڵی دەکات، پاشان زیندووو بێتەوە بڕوات و دیار نەمێنێت؟!

هەموو ئەوانەی کە باس کرا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەیویست ئاراستەی نەساراکانی بکات لە وەفدی نەجران دا تا تێبگەن کە (عیسا) کوڕی خوا نییە و پێغەمبەرە.

## پێغەمبەر محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دیمەنی ڕۆژی دوایی

هیچ ئایینێک لە ئێستادا هێندەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گرنگیان بە قیامەت نەداوە، بۆ نموونە لە تەوراتی حەزرەتی (موسا عَلَيْهِ السَّلَامُ) زیاتر مێژووی (موسا) و باسێکی کەم لە مێژووی پێغەمبەرانی ڕابردوو پاشان باس و طقوسەکانی یەهوود دەکات، بە دوایدا هەر سفرێکی تری پێغەمبەران یان مەلیکەکان هەموو باسی مێژوویەکی پوخت و گێڕانەوەی شێوە ڕاویە لە سەر ژیانی کەسایەتی دووەم یان خودی پێغەمبەرەکە، تا دەگاتە سفری زەکەریا، پاشان ئینجیل، نەک هەر باسی ڕۆژی دوای بە ڕوونی نەکردووە، بەڵکو هانی

خەڵکی ئەدات بۆ تاوان بەو پێیەی کە (عیسا)ی کوڕی مەریەم خۆی لە خاچ داوە بۆ ڕزگار بوونی مرۆڤ لە تاوانەکانیان، پەنا بە خوا کە درۆیەکەی زۆر گەورە و بوختانێکی زۆر نابەجێیە.

بە پێچەوانەی هەموو ئایینە دەستکاری کراوەکانی دونیا و ئایینە دروستکراوەکانی تری جیهان، ئیسلام گرنگییەکی زۆری داوە بە قیامەت و پرسەکانی بە گشتی، جا لە ڕێگای قورئانەوە بێت کە ئایەت و سورەتەکان یەکجار زۆرن، هەوەها لە فەرموودەش دا ئەوەندە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ جەختی لەسەر کردۆتەوە کە لە کتێبەکانی تایبەتی لەسەر نووسرا وە بە چەندین بەرگ.

هۆکاری باسی زۆری ئەم پرسە خودی ئامانج و مەبەستی ئایینەکەی لەسەر دامەزراوە، چونکە هەرچی بانگەوازی و جیهاد و نووسینی کتێب و وتار و ...هتد، هەمووی لەبەر ئەوەیە کە دوو پرسی گرنگ بزانن، پرسی یەکەم ناسینی خوای پەروەردگار بە پێناسە و سیفاتی، پرسی دووەم گەڕانەوەیە بۆ لای خوای موتەعال لە ڕۆژی قیامەتدا، چۆن ئەم گەردوونە سەرەتای هەیە، ئاواش کۆتایی دێت، لە هەمووی گرنگتر چۆن ژیانی ڕابردووی پێغەمبەری خوا ﷺ دەزانین بۆمان باسکراوە لە سیرە و کتێبی فەرموودە و پاشان مێژووەکاندا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان شێوە ژیانی خۆی بۆ باس کردووین لە ڕۆژی قیامەت و کار و ئەرکی چییە، تەنانەت ناونیشانی خۆی پێ بەخشیوین ئەگەر کارێکمان پێی هەبوو یاخود پرسیارمان هەبوو دەتوانین بەو ناونیشانە بیدۆزینەوە، دەفەرموێت: یان لای میزانم یان لای پردی (الصراط) یان لەسەر حەوزی کەوسەر، لەم سێ جێگایەدا لەو ڕۆژە سەختەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدۆزینەوە.

لە هیچ کام لە ئایینەکاندا بەو شێوەیە باسی ڕۆژی قیامەت نەکراوە کە ڕووداوەکانی چۆن ڕوو ئەدەن، لە کاتێک دا قورئان زۆر بە وردی باسی کردووە، بگرە زیاتر باسەکانی کۆتایی کراوە تا باسەکانی بەدیهاتن، لە قورئاندا وردەکاری زۆر هەیە لە باسی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ دا لە ڕۆژی قیامەتدا لە شەفاعەت و چوونە ناو بەهەشت و ئەهلی ئەعراف و دەرهێنانەوەی مرۆڤە تاوانبارەکان لە دۆزەخ دا، هەموو ئەمانە لە سیرەی قیامەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دا دەبینیتەوە. لە کاتێکدا هیچ پێغەمبەرێک بەو شێوەیە بۆ گەلەکەی باسی نەکردووە، پێدەچێت وەکو موژدەدانێک بە پێغەمبەر محمد ﷺ لە لایەن ژیانی پێغەمبەرانی ترەوە کە دێت، بەجێیان هێشتبوو لە ڕووی ڕوونکردنەوەی زیاتر لە لایەن پێغەمبەر محمد ﷺ -ەوە تەنانەت خودی هەموو ئایینەکانی تر جا چ ئاسمانەکان بێت یاخود دەستکردەکان، هەموو ئەو پرسە ناڕاستەوخۆ لە خودی ئیسلام وەردەگرن.

هەموو ئەو باسە لە نموونەی سورەتی ( النازعات)دا کۆدەکەینەوە کەخوای گەورە لەو سورەتەدا دیمەنێکی ڕووداوەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا﴾

وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا (٢) وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا (٣) فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا (٤) فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا (٥) يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ (٦) تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ (٧) قُلُوبٞ يَوۡمَئِذٖ وَاجِفَةٌ (٨) أَبۡصَٰرُهَا خَٰشِعَةٞ (٩) يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرۡدُودُونَ فِي ٱلۡحَافِرَةِ (١٠) أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا نَّخِرَةٗ (١١) قَالُواْ تِلۡكَ إِذٗا كَرَّةٌ خَاسِرَةٞ (١٢) فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ (١٣) فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ (١٤) هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ (١٥) إِذۡ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوًى (١٦) ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ (١٧) فَقُلۡ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ (١٨) وَأَهۡدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخۡشَىٰ (١٩) فَأَرَىٰهُ ٱلۡأٓيَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰ (٢٠) فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ (٢١) ثُمَّ أَدۡبَرَ يَسۡعَىٰ (٢٢) فَحَشَرَ فَنَادَىٰ (٢٣) فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ (٢٤) فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ (٢٥) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰٓ (٢٦) ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا (٢٧) رَفَعَ سَمۡكَهَا فَسَوَّىٰهَا (٢٨) وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا (٢٩) وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ (٣٠) أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا (٣١) وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا (٣٢) مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ (٣٣) فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ (٣٤) يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ (٣٥) وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ (٣٦) فَأَمَّا مَن طَغَىٰ (٣٧) وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا (٣٨) فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ (٣٩) وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ (٤٠) فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ (٤١) يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَا (٤٢) فِيمَ أَنتَ مِن ذِكۡرَىٰهَآ (٤٣) إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ (٤٤) إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخۡشَىٰهَا (٤٥) كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَهَا لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوۡ ضُحَىٰهَا (٤٦)﴾ النازعات

واتە: خوای گەورە سوێند ئەخوات بە فریشتەکان کاتێك کە زۆر بە توندی و بەهێز ڕۆحی بەندەکان لەوپەڕی لاشەیان دەرئەکێشن، مەبەست پێی ڕۆحی کافرانە(١) خوای گەورە سوێند ئەخوات بەو فریشتانەی کە ڕۆحی باوەڕداران بە گورج و گۆڵی دەرئەکەن و ڕادەکێشن بەبێ ئەوەی کە ئازارێکی زۆریان پێ بگات وەکو ڕوحی کافران(٢) خوای گەورە سوێند ئەخوات بەو فریشتانەی کە بەخێرایی فەرمانی خوای گەورە لە ئاسمانەوە دائەگرن بۆ زەوی، وتراوە: مەبەست لەمانە مردنە یان ئەستێرەکانە، یان کەشتییەکانە، بەڵام تەواوتر ئەوەیە مەبەست پێی فریشتەکانە(٣) خوای گەورە سوێند ئەخوات بەو فریشتانەی کە پەلە ئەکەن لە ئیمان هێنان و بەڕاست داناندا، یاخود پەلە ئەکەن لە گەیاندنی ڕۆحی باوەڕداران بە بەهەشت (٤) خوای گەورە سوێند ئەخوات بەو فریشتانەی کە کاروباری ئەم بوونەوەرە هەڵئەسووڕێنن بە فەرمانی خوای گەورە، فەرمانی خوای گەورە لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی دائەگرن(٥) ڕۆژی قیامەت کاتێك کە ئیسرافیل فووی یەکەم ئەکات بە کەڕەناو شەیپووردا دونیا تێکئەچێ و زەوی ئەهەژێت(٦) بەدوای ئەودا فوو کردنی دووەم دێت کە دروستکراوەکان هەموویان زیندووو ئەبنەوەو لە

گۆڕەکانیان دەرئەچن، بەرەو ساحەی مەحشەر بەڕێ ئەکەون.(٧) لەو ڕۆژەدا دڵەکان هەمووی شڵەژاو و ترساون کاتێك کە ئەو دیمەنە ترسناکانەی ڕۆژی قیامەت ئەبینن(٨) چاویان شۆڕو زەلیلەو ناتوانن چاو بەرز بکەنەوە لەبەر ترسناکی ئەو دیمەنانەی کە لە ڕۆژی قیامەتدا هەیە(٩) کافرانی قوڕەیش بەدووریان ئەزانی کە زیندووبوونەوە هەبێت و ئەیانووت: ئایا ئێمە لە دوای ئەوەی کە خراینە ناو گۆڕەوەو لاشەمان ڕزی سەرلەنوێ زیندووو ئەکرێینەوە؟!(١٠) ئایا لە دوای ئەوەی کە ئێمە ئێسقانەکانمان لەناو خۆڵدا ڕزی سەرلەنوێ دروست ئەکرێینەوەو زیندووو ئەکرێینەوە؟!(١١) وتیان: ئەگەر ئەمەی محمد ﷺ دەیڵێت: ڕاست بێت و زیندووبوونەوەو لێپرسینەوە هەبێ ئەمە دۆڕاندنێکی ڕاستەقینەیەو ئێمە ئەدۆڕێین، لەبەر ئەوەی لە دونیادا ئیمانمان نەهێناوەو کردەوەی چاکمان نەکردووەو خۆمان بۆ ئامادە نەکردووە(١٢) خوای گەورە ئەفەرمووێ: ئەم ڕۆژە بەدوور مەزانن، چونکە تەنها یەك هاوار کردن و فوو کردنێکە کە ئیسرافیل فوو ئەکات بە کەڕەنادا، سەرەتاکان و کۆتاییەکان هەموویان لەبەر دەستی خوای گەورەدا زیندووو ئەبنەوەو لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەکرێت(١٣) هەر هەموو خەڵکەکە لە ساحەی مەحشەردا لەسەر زەوییەکی تەخت کۆئەبنەوە لەبەر دەستی خوای گەورە بۆ لێپرسینەوە(١٤) ئایا هەواڵ و بەسەرهاتی (موسا) پێغەمبەرت بیستووە؟(١٥) کاتێك کە خوای گەورە بانگی لە (موسا) کرد لە کێوە پاك و پیرۆزەکەدا(١٦) ئەی (موسا) بڕۆ بۆ لای فیرعەون لەبەر ئەوەی فیرعەون توغیان و سەرکەشی کردووەو سنووری بەزاندووە لە کوفر کردن و شەریك دانان و چەوساندنەوەی خەڵکی و زوڵم و ستەمدا(١٧) پێی بڵێ ئایا ئەتەوێ خۆت پاك بکەیتەوە لە شەریك دانان بۆ خوا و لە تاوان و زوڵم و ستەم بەوەی کە ئیمان بێنی(١٨) ڕێنماییت بکەم بۆ پەرستنی خوای گەورەو بەتاك و تەنها خوای گەورە بپەرستی و شەریکی بۆ دانەنێی؟ ترسی خوای گەورە بچێتە دڵتەوەو بەتاك و تەنها لە خوای گەورە بترسی بۆ ئەوەی دڵت نەرم بێت؟(١٩) (موسا) موعجیزە هەرە گەورەکەی نیشاندا بۆ ئەوەی کە ئیمان بێنێ و موسڵمان بێ، مەبەست لە موعجیزەکە گۆچانەکەی بووە، یاخود کە دەستی دەرکردایە سپی ئەبوو دەدرەوشایەوە، یاخود حوججەو بەڵگەی بۆ هێنایەوە بۆ ئەوەی کە موسڵمان بێت(٢٠) بەڵام فیرعەون لە جیاتی ئەوەی ئەو حەقە بەڕاست دابنێ بەدرۆی زانی، سەرپێچی (موسا)ی کردو هیچ سوودێکی لە بانگەوازی (موسا) نەبینی(٢١) پاشان پشتی لەو حەقە هەڵکردو وەڵامی نەدایەوەو هەوڵ و کۆششی کرد بۆ کۆکردنەوەی ساحیران(٢٢) ئەو کاتە سەربازەکانی کۆکردەوە، یاخود هەموو ساحیران و جادووگەرانی کۆکردەوەو بانگی کردن: هەر هەمووتان کۆببنەوەو ئامادەبن بۆ

ڕووبەڕووبوونەوەی (موسا) و خەڵکەکەیشی کۆکردەوە﴿٢٣﴾ وتی: من پەروەردگاری هەرە بەرزی ئێوەم، نەمزانیوە جگە لەمن پەروەردگارو خوایەکی ترتان هەبێت﴿٢٤﴾ خوای گەورەش تۆڵەی لێ سەندو لە دونیاو قیامەتدا کردی بە پەندو عیبرەت بۆ هەموو ستەمکاران و کافرانی تر﴿٢٥﴾ بەڕاستی ئەمە پەندو ئامۆژگارییە بۆ هەر کەسێك کە بترسێ و ترسی خوای گەورەی لەدڵدا بێت﴿٢٦﴾ ئایا دروستکردنی ئێوە سەختترو قورسترە یاخود دروستکردنی ئەو ئاسمانانە کە خوای گەورە دروستی کردوون؟ ئاسمانێك کە بە چاوی خۆتان ئەیبینن کە چەندێك گەورەیە، خوای گەورە دروستی کردووەو لە بان سەری ئێوە ڕایگرتووە ئایا ئەمە قورسترو سەختترە یاخود دروستکردنەوەی ئێوە لە دوای مردن؟ بێگومان درووستکردنی ئاسمانەکان گەورەترە، ئیتر بۆ باوەڕ بەوە ناکەن کە خوای گەورە لە دوای مردن توانای هەیە سەرلەنوێ زیندووتان بکاتەوە﴿٢٧﴾ ئاسمانی لە بان سەرتان وەکو بینایەك بەرز کردووەو ڕێك خستووە﴿٢٨﴾ شەوەکەی تاریك کردووە بۆ ئەوەی تیایدا پشوو بدەن ڕۆژەکەیشی ڕووناك کردووە بۆ ئەوەی بگەڕێن بەدوای بژێوی و ڕزقی خوای گەورەو بازرگانیدا﴿٢٩﴾ لە دوای ئەوەیش زەویشی ڕاخستووە﴿٣٠﴾ لەو زەویەشدا ئاوی دەرکردووە وەکو دەریاو زەریاو ڕووبارو دەریاچەو کانی و کارێزو بیرەکان گژو گیاو لەوەڕیشی بۆ ئاژەڵەکانتان دەرکردووە﴿٣١﴾ شاخەکانیشی وەکو سنگ و مێخ بە ناخی زەویدا داکوتیوە بۆ ئەوەی کە ئەو زەوییە جێگیرو چەسپاو بێت و نەجووڵێت و نەهەژێت﴿٣٢﴾ ئەمانە خواردنن بۆ خۆتان و ئاژەڵەکانیشتان بۆ ئەوەی لەسەر زەویدا سوود ببینن خوای گەورە ئەو شتانەی بۆ ژێربار کردوون﴿٣٣﴾ کاتێك کە بەڵاو موسیبەتە هەرە گەورەکە دێت کە هاتنی ڕۆژی قیامەتە کە لە هەموو بەڵاو موسیبەتێك گەورەترو سەختترو قورسترە ﴿٣٤﴾ لەو ڕۆژەدا کاتێك کە قیامەت هات هەموو مرۆڤێك بیر ئەکاتەوەو ئەزانێت کە کردەوەی چاك یان خراپ چی کردووە هەمووی بەبیردا دێت، لەبەر ئەوەی ئەبینێ ئەوەی کە لە دونیا کردوویەتی فریشتەکان هەر هەموویان نووسیوەو پاراستووە لە نامەی کردەوەکانیدا﴿٣٥﴾ دۆزەخیش دەرئەکەوێ و خەڵکی بەچاوی خۆیان ئەیبینن﴿٣٦﴾ ئەو کەسەی لە دونیادا کوفری کرد بێت بە خوای گەورەو تاوان و سەرکەشی کرد بێت و سنووری بەزاند بێت﴿٣٧﴾ ژیانی دونیای پێشخستبێ بەسەر قیامەت و دینەکەیداو لە حەرام نەگەڕابێتەوە﴿٣٨﴾ ئەوە بە دڵنیایی دۆزەخ شوێنی گەڕانەوەی ئەوانەو لە دۆزەخدا ئەمێننەوە﴿٣٩﴾ بەڵام کەسێك لە دونیادا ترسا بێت لە ڕاوەستان لەبەر دەستی خوای گەورەو زانیبێتی ڕۆژێك ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە لە ترسی خوای گەورە قەدەغەی نەفسی خۆی کردبێ لە هەواو ئارەزوو و جڵەوگیری کردبێت﴿٤٠﴾ ئەوە بە دڵنیایی شوێنی گەڕانەوەی ئەوان بەهەشتە، لەبەر

ئەوەی لە دونیا خۆیان پاراستووە خوای گەورە لە قیامەت پاداشتیان ئەداتەوە بە بەهەشت(41)

ئەی محمد ﷺ پرسیارت لێ ئەکەن کەی ڕۆژی قیامەت دێت؟ (42) ئەی محمد ﷺ تۆ هیچ زانیارییەکت پێ نییە سەبارەت بە هاتنی ڕۆژی قیامەت، پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام پرسیاری لێدەکرا سەبارەت بە کاتی هاتنی ڕۆژی قیامەت تا خوای گەورە ئەم چەند ئایەتەی دابەزاند(43) ئەوپەڕی زانیاری هاتنی ڕۆژی قیامەت لای خوای گەورەیەو جگە لە خوای گەورە هیچ کەسێکی تر نازانێ کەی ڕۆژی قیامەت دێت(44) تەنها ئیشی تۆ ئەوەیە هەر کەسێك لەو ڕۆژە بترسێ تۆ ئاگاداری بکەیتەوەو بیانترسێنی لە سزای خوای گەورە لەو ڕۆژەدا(45) لە ڕۆژی قیامەت کاتێك کە خەڵکی لە گۆڕەکانیان بەرز ئەبنەوەو بەرەو ساحەی مەحشەر بەڕێ ئەکەون و دەیبینن وا ئەزانن لە دونیادا نەژیاون تەنها نیو ڕۆژ نەبێ (عَشِیَّةً) واتە: لە نیوەڕۆوە بۆ خۆر ئاوابوون یاخود لە خۆرکەوتنەوە تا نیوەڕۆ، واتە: ئەگەر خەڵکی لە دونیادا سەد ساڵ ژیابێتن لە ڕۆژی قیامەتدا وا ئەزانن تەنها نیو ڕۆژ ژیاون، واتە: دونیا زۆر هیچ و بێنرخە، بۆیە نابێت مرۆڤ لەم دونیا کەمەدا خۆی تاوانبار بکات، ئەو قیامەتە هەمیشەییە بدۆڕێنێ بەهۆی دونیایەکی کەم و فانییەوە کە کۆتایی دێت، والله أعلم(46)

دیمەنەکان زۆرن، هەرچەندە لە سیرەت دا باس نەکراوە، بەڵکو خانەی بۆ جیاکراوەتەوە لە باسی هاتنی قیامەت و نیشانەکانی، بەڵام ئەم باسە بۆیە لەم کتێبەکەدا کرایەوە، بەشێکی زۆر گرنگە لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ و ئوممەتەکەی خەسڵەتێکی تایبەتیە بە پێغەمەر محمد ﷺ کە پرسی قیامەت لای هیچ کام لە پێغەمبەرانی ڕابردوو وەکو پێغەمبەر محمد ﷺ ڕوونیان نەکردۆتەوە و جەختیان لەسەر نەکردۆتەوە بەپێی ئەوەی کە ئێستا لەبەر دەستمان دایە.

## فیتنەی دەجال

پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی ڕاگەیاندا کە پێغەمبەران گەلەکانیان ئاگادار کردۆتەوە لە فیتنەی دەجال لە (نوح)-ەوە (عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) تا جەنابی حەزرەتی محمد ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شتێکتان لە بارەی دەجالەوە پێ دەڵێم کە هێچ پێغەمبەرێک ئەو نیشانەی نەفەرمووە، واتە: چاوێکی دەر پەڕیوەتە دەرەوە (أعور) لە نێو چاوی نووسرا وە کافر، خاوەنی باخ و باخات و ئاگرە، خوای موتەعال هێز و توانایەکی پێبەخشیوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: بانگەشەی خوایەتی دەکات، بەڵام بزانن خواکەتان چاوی نوقسان نییە دەرپەڕیبێت.

تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا کەسێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد لە یەهوودی شاری مەدینە بوو ناسرابوو بە ٠(ئیبن صەییاد) گوایە باس لە پەنهانی و هەواڵی غەیب دەکات، حەزرەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ چەند هاوەڵێکی کە عومەری کوڕی خەتتابی تێدابووە چوون، فەرمانی کرد کە بە نهێنی بڕۆنە سەری تا بەخۆی نەزانێت، لەگەڵ خزمەتکارەکانی لە لای قەڵاکانی یەهوود یاری دەکرد، پێغەمبەر ﷺ لە دواوە کێشای بە سەر شانیاو فەرمووی ئەی ئیبن صەییاد شایەتومان دێنی کەمن پێغەمبەری خوام، ئەویش وتی: شاهێدی ئەدەم کە تۆ پێغەمبەری و نەخوێندەواری، ئەم وشەی ( الأمی) بە واتای نەخوێندەوار دێت، بەڵام مانایەکی تریش هەڵدەگریت کە بە واتای تایبەتی بە خەڵکی عەرەب!

لە دوای تەواو بوونی قسەکانی وتی بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی تۆ بڕوا دەهێنێت کەمن پێغەمبەری خوام؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( من ئیمانم هێناوە بە خوا و پێغەمبەرەکەی) لێرەدا مەبەستێکی لە پشتەوە بوو، هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی خودی خۆیەتی، بەڵام بۆ ئەوەی زیاتر ئیبن صەییاد بدوێنێت و قسەی لەگەڵ بکات و قسەی لێ دەربهێنیت لە درۆکانی، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ( چی دەبینیت؟) ئیبن صەییاد وتی: هەواڵی درۆ و ڕاست پێدەگات! ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کەواتە ( کارەکانت لێ تێکەڵ بووە خۆشت نازانی چییە! پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شتێکم لێشاردوویتەوە دەزانی چیە؟! ئیبن صەییاد وتی: تەماویە، واتا بۆم نادۆزێتەوە وەکو دووکەڵ وایە! ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەر شۆڕ بە و دەمت داخە (بە شێوەیەکی شاکاندن)، پاشان فەرمووی: تواناو هێزت نییە و ئەوەی لاتە تەنها تواناو هێزێکی کاهین ساحیرەکانە شتیان لێ تێکەڵ دەبێت، زۆرجار ڕاست دەردەچێت زۆرترین جاریش درۆ.

ئیمامی عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ با لە گەردنی بدەم و ڕێگام بەرێ؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر دەجال بێت تۆ ناتوانیت بکوژێت، خۆ ئەگەر دەجالیش نەبێت کوشتی هیچ خێرێکی نییە.

لێرەدا کە پێغەمبەر ﷺ بە نهێنی چووە سەری و لە دواوە کێشای بە پشتیدا بە هاوەڵانی سەلماند کە هیچ دەربارەی غەیب نازانێ، پاشان هچی پێنەکرا لەبەردەم هاوەڵاندا ونەهێشتی بکوژرێت، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر دەجال بێت وا ناو و ناوبانگی دەرچووو بوو کە دەجالە، ئەوا عومەر تۆ ناتوانیت بیکوژیت، دەبێت (عیسا)ی کوڕی مەریەم بیکوژێت.

دەشێت سیستەمەکانی ئەمڕۆ هەموو دەجال بن، ئاوی سارد و فێنکیان سوتێنەر بێت، بە جوانی ڕووکەشی ژیار و شارستانیەتیان، هەڵبخڵەتێین و تێکەڵ ببین بە تاوان، جا چ لە ڕوی سیستەمەکانی سەرمایەداری وەکو ئابووری، ڕیبا و سیستەمی دیموکراسی وەکو پەراوێزخستی

حوکمی خوای گەورە....هتد گێڕانەوەی سیستەمە بنەڕەتیەکە بە پیاوانی وەکو محەمەدی مەهدی و (عیسا)ی کوڕی مەریەم دەگەڕێتەوە، هەموو ئەمانە ئاماژەیە بۆ سیستەمی دەجال، هەروەها ئەم هەموو سیستەمانە لە کەسێکدا کۆبێتەوە بە ناوی خودی ئیبلیس بێت کە بە تەواوەتی دەستی گرتووە بە سەر شارستانیەتەکانی ڕۆژ ئاوا دا، خودی ئیبلیس لە ژیاندایە، خوای گەورە ماوەیەکی بۆ دیاری کردەوە ئەویش دەبێت لەناو بچێت، کە دەشێت بە دەستی حەزرەتی (عیسا) لە ناو بچێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیانیدا ئاماژەی کردووە بەم جۆرە فیتنانەی کە ئەمڕۆ لە بەرچاوماندایە و هەستی پێ دەکەین و تێیدا دەژین لە ناو دەجالەکانی عەولەمەداین.

### هەواڵی ڕابردوو لە لایەن قورئان و پێغەمبەر ﷺ

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ هەروەکو چۆن هەواڵی پەنهانی و داهاتووەکانی پێ ڕاگەیاندنین لە ڕێگای وەحییەوە، هەروەها هەواڵی ڕابردوویشی بۆ باسکردوین، کە ئەوەش بەشێکە لە زانیاری غەیبی، ڕاستە لە ڕابردوودا ڕوویداوە، بەڵام کەس نەیزانیوە، یاخود دانراوەو ڕوونکردنەوەی نەبووە لەوانە ڕووداوەکانی (جورەیجی عابید) یاخود ئەو عابیدەی بەنی ئیسرائیل کە بە کافری مرد، واتا لە عابیدییەوە بۆ کافری یان ڕووداوی ( کەچەڵ و گول و کوێرەکە) یان ڕووداوی سێ کەسەکەی کە لە تاو لێزمەی باران دەچنە ئەشکەوت و بارانی زۆر وادەکات لافاو بەرد و شاخەکە دەڕوخێنێت و بەردەمی ئەشکەوتەکە دەگرێت، بێجگە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووداوگەلێکی زۆری تر هەیە کە لە قورئاندا باسکراوە لە هەواڵی ڕابردووان و خوای موتەعال و پێغەمبەرەکەی وەکو مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە، بەڵام پڕ لەوانەن.

### ڕووداوی جورەیجی عابد

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:-سێ منداڵ لە کۆرپەیدا دواون و ئاخاوتنیان کردووە، یەکەم (عیسا)ی کوڕی مەریەم کە لە بەشەکانی پێشوودا باسمان کردووە، دووەم کەسێکی خواناس و زاهید کە خۆی ساغ کردبووەوە بۆ بەندایەتی بەناوی ( جورەیج)، ژوورێکی لە قوڕ بۆ خۆی دروست کرد بوو لەو جێگایەکدا بەندایەتی دەکرد، بەو جێگا دەوترێت ( صەومەعە)، لە ناو گەلی ئیسرائیلدا ئافرەتێکی زیناکاری بەناوبانگ هەبوو، بەزیناکارەکانی وت کە زینایان لەگەڵیدا کردبوو، ئەڵێن چی جورەیجی ڕاهیتان بۆ هەڵبخەڵەتێنم، دیارە وەکو مەرج لەگەڵیاندا ئەنجامی داوە، (چونکە هەموو تاوانبارێک لە پڕۆژەی شەیتاندا کار دەکات)، هاتە لای جورەیج و ناز و خۆبادانی کرد، بەڵام جورەیج گوێی پێنەداو پشتی تێکرد، پاشان ئافرەتە زیناکەرەکە کە دەڵێن ناسراوە بە (یابوس)، چوو لەگەڵ شوانێک لەو ناوچەیەدا زینای کرد شوانەکە لە نزیک (صەومەعە) کەی جورەیج پشووی ئەدا، ماوەیەکی پێچوو ئافرەتەکە سکی

پڕبوو لە شوانەكە، كەچی بوختانی كرد و وتی: لەگەڵ جورەیج دا خەوتووم ئەو سكی پڕ كردووم منداڵی ئەوە، كە منداڵەكە لە دایك بوو خەڵكی شار هەموو كۆبوونەوە، بۆ سەرزنشت و بەرد بارانی جورەیجی عابد، ئەویش هاتە دەرەوە لەماڵە قوڕینەكەیدا خەڵكەكە بەردیان تێدەگرت و ماڵە قوڕینەكەیشیان ڕووخاند!

جورەیج پرسی چی ڕوویداوە؟ ئەوانیش وتیان ئەو منداڵە تۆ خاوەنیتی و زینات لەگەڵ ئەو ئافرەتە كردووە، زۆریان لێ دا و قسەی ناشرینیان زۆ پێوت، جورەیج وتی: كوا منداڵەكە؟!

منداڵەكەیان بۆ هێناو، هەڵسا نوێژی كرد و دوعای كرد، جورەیج چووە لای كە بە پەنجەی ئاماژەی بۆ كرد و وتی: ئەی منداڵ تۆ كوڕی كێیت؟!

یان وتی سوێندت ئەدەم بە خوا باوكت كێیە، ( بەم شێوەیە لە ڕیوایەتی موسلیم و بوخاریدا هاتووە)، یان دەڵێت بە زەدەخەنەوە دەستی هێنا بە سەر منداڵەكەداو فەرمووی: باوكت كێیە؟!

منداڵەكەش كەوتە قسەو وتی: باوكم شوانەكەیە!

ئیتر هەموو خەڵكەكە چوونە لای جورەیج و ماچیان كرد و داوای گەردەن ئازادییان لێ كرد، وتیان: ماڵەكەت لە ئاڵتون بۆ دروست دەكەین، ئەویش ڕازی نەبوو، وتی: وەكو خۆی لە قوڕ بۆم دروست بكەنەوە.[62]

منداڵی سێ یەم: كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی دواوە و ئاخاوتنی كردووە، دەفەرموێت: منداڵێك شیری دایكی دەخوارد و تەنانەت ڕاوی فەرموودەكە ئەبو هورەیرەیە، دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەی خستبووە دەمی لاسایی منداڵەكەی بۆ دەكردینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: مندڵەكە شیری دەخوارد، سوارێكی جوانخاسی جل و بەرگ پاك و ڕێك و پێك بە ئەسپەكەیەوە تێپەڕی، دایكەكەی وتی: خوایە منداڵەكەم وەكو ئەو سوارە دەرچێت، منداڵەكەی مەمكی دایكی بەردا و وتی، خوایە هەرگیز

---

62 - قد قص علينا خبره - نبينا ﷺ في الحديث الذي رواه البخاري و مسلم عن أبي هريرة عن النبي ﷺ قال : لم يتكلم في المهد إلا ثلاثة ، عيسى ابن مريم ، وصاحب جريج ، وكان جريج رجلا عابدا ، فاتخذ صومعة فكان فيها، فأتته أمّه وهو يصلي ، فقالت : يا جريج ، فقال : يا رب أمي وصلاتي ، فأقبل على صلاته ، فانصرفت ، فلما كان من الغد أتته وهو يصلي ، فقالت : يا جريج ، فقال : يا رب أمي وصلاتي ، فأقبل على صلاته ، فانصرفت ، فلما كان من الغد أتته وهو يصلي ، فقالت : يا جريج ، فقال : أي رب أمي وصلاتي ، فأقبل على صلاته ، فقالت : اللهم لا تمته حتى ينظر إلى وجوه المومسات ، فتذاكر بنو إسرائيل جريجا وعبادته ، وكانت امرأة بغي يُتَمثَّلُ بحسنها ، فقالت : إن شئتم لأفْتِنَنّه لكم ، قال: فتعرضت له فلم يلتفت إليها، فأتت راعيا كان يأوي إلى صومعته ، فأمكنته من نفسها ، فوقع عليها ، فحملت ، فَلما ولدت قالت : هو من جريج ، فأتوه فاستنزلوه، وهدموا صومعته ، وجعلوا يضربونه ، فقال : ما شأنكم ، قالوا : زنيت بهذه البغي فولدت منك ، فقال : أين الصبي ، فجاءوا به ، فقال : دعوني حتى أصلي ، فصلى ، فلما انصرف أتى الصبي فطَعَنَ في بطنه ، وقال: يا غلام ، من أبوك؟ قال : فلان الراعي ، قال : فأقبلوا على جريج يقَبلونه ويتمسحون به، وقالوا : نبني لك صومعتك من ذهب ، قال : لا ، أعيدوها من طين كما كانت ، ففعلوا . ابن كثير، ص ٤٨٠-٤٨١

وەکو ئەو نەبم، پاشان مەمکی دایکی گرتەوە، دایکی سەرسام بوو پێی، پاشان بەلای ئافرەتێکی دیکەدا تێپەڕی بە قامچی لێیان ئەدا و ئەشکەنجە ئەدرا، دایکە کە وتی پەروەردگارە منداڵەکەم هەرگیز وا لێ نەکەیت، واتا وەکو ئەو ئافرەتە قامچی بخوات، دایکە تووڕە بوو و وەکو بە منداڵەکەی بڵێ ئەوە تۆ لەکەیەوە فێری قسە کردن بوویت، تۆ شیاوی بۆ ئەوەی دوعات بۆ بکەم بە توڕەییەوە، هەموو ئەو باسەکەی دووبارەکردەوە لە سوارەکەو کە دایکی دوعای بۆ کرد وەکو ئەو بێت کوڕەکەی و پاشان کوڕەکە وەکو ئافرەتە کۆیلەکە لێدان ئەخوات، منداڵەکەی وتی دایکە، ئەو سوارە یەکێکە لە زاڵمەکان و دڵ ڕەقەکان، جا بۆیە وتم خوایە هەرگیز وەکو ئەوەم لێ نەکەیت، ئەو ئافرەتە کۆیلەیەش تاوانبارکراوە بە زینا و دزی، نە زینای کردووە نە دزیش، جا ئەو کە دەڵێت ( حسبي الله)، لەبەر ئەوەی مەزڵوم بوو پاداشتی وەردەگرت لەسەر ئازاردانەکەی.[63]

## ڕووداوی سێ کەسەکە، کاتێک چوونە ناو ئەشکەوتەکە

بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبن عومەرەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی لە کاتێکدا سێ کەس بە یەکەوە دەڕۆیشتن، لە پڕ بارانێکی بەلێزمە لێی داکردن چوونە ئەشکەوتێک، لە پڕ دەرگای ئەشکەوتەکەیان لێ گیرا بە تالێرە بەردێک، پاشان بە یەکتریان وت: سوێند بە خوا ڕزگارمان نابێت لێرەدا مەگەر بە ڕاستی کارێکمان لە پێناوی خوادا ئەنجامدا بێت، ئەو ڕاستگۆیی و نییەت پاکییە ببێتە هۆکاری ڕزگاربوومان.

یەکێکیان وتی: خوای پەروەردگار؛ کەسێک لە لامدا کارێکی دەکرد، پاشان کارەکەی جێشێت، لەلام و ڕۆیشت، کرێکەی ڕۆژانەی سێ ( صاع) بووە واتا نزیکە (١١) کیلۆ دانەوێڵە، منیش دانەوێڵەکەیم بۆ چاند و پاشان بەرهەمەکەیم کۆکردەوە، مانگایەکم پێ کڕی کە ماوەیەکی پێچوو کرێکارەکە هات داوای حەقی ڕۆژەکەی خۆی کرد منیش لە ترسی زاتی بەرزت لە جیاتی کرێکەی کە سێ ( صاع) بوو مانگەکەم دایە، زاتی بەرزت ئاگاداری کە لە پێناوی زاتست ئەو کارەم کردووە تا لێم ڕازی بیت، ڕزگارمان بکە لێرەدا.

خوای گەورە بەردەکەی بۆ جوڵاندن کەمێک، زانیان کە ڕاستگۆییەکەیان بەرهەمی دەبێت لەم دونیایەدا.

بۆیە دووەم کەسیان وتی: خوای پەروەردگار؛ زاتی بەرزت دەزانێت کە خاوەنی دایک و باوکێکی پیر بووم، هەموو شەوێک بە جامێک لە شیری مەڕەکانم بۆ دەهێنان، شەوێکیان هەندێک دواکەوتم کە هاتمە لای دایکم و باوکم خەوتبوون، منیش حەزم نەکرد لەخەو

---

[63]- بوخاری و موسلم، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

خەبەریان بکەمەوە لە خزمەتیاندا وەستام تا هەڵسان لەخەو لەبەرەبەیاندا، منداڵەکانی خۆشم چاوەڕانم بوون کە شیریان بۆ بەرم، بەڵام بۆ ڕازیکردنی زاتی بەرزت، تا ئەوانم تێر نەکرد نەچووم، ئەو کارەشم لە پێناوی زاتی بەرزت کرد جا تکادەکەم ڕزگارمان بکە لێرەدا.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: بەردەکە جوڵا و ئاسمانیان لێ دەرکەوت.

سێیەمیان وتی: خوای پەروەردگار؛ زاتی بەرزت دەزانێ من خاوەنی کچە مامێکم بووم، زۆرم خۆش دەویست چەند جار هەوڵم دا لەگەڵیدا بخەوم ئەو ڕازی نەبوو، تا جارێکیان ١٠٠ دینارم دایە و ڕازیم کرد، کاتێک هات و خۆی ئامادەکرد کە لەگەڵیدا ڕابوێرم بخەوم و لە نێوانی قاچیدا بووم، بەڵام لە زاتی بەرزت ترسام و وازم لێ هێنا و تەنانەت ١٠٠ دینارەکەشم بۆ بەجێ هێشت. خودایە ئەگەر ئەوەم لە پێناوی زاتی بەرزت کردووە ڕزگارمان بکە لێرەدا خوای پەروەردگار ڕزگاری کردن لە ناو ئەشکەوتەکەدا.[64]

## هەواڵی سێ کەسەکە؛ کەچەڵ و گول و کوێرەکە

بوخاری و موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:

سێ کەس لە گەلی ئیسرائیل یەکێکیان کەچەڵ و ئەوی تریان کوێر و کەسی سێیەم گول، بووە.[65]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[64]- قال الإمام البخاري: حدثنا إسماعيل بن خليل، أخبرنا علي بن مسهر، عن عبيد الله بن عمر عن نافع، عن ابن عمر أن رسول الله ﷺ قال: بينما ثلاثة نفر ممن كان قبلكم يمشون، إذا أصابهم مطر فأووا إلى غار فانطبق عليهم، فقال بعضهم لبعض: إنه والله يا هؤلاء لا ينجيكم إلا الصدق، فليدع كل رجل منكم بما يعلم، أنه قد صدق فيه .

فقال واحدا منهم: اللهم إن كنت تعلم أنه كان لي أجير عمل لي على فرق من أزر، فذهب وتركه، وإني عمدت إلى ذلك الفرق فزرعته، فصار من أمره أني اشتريت منه بقرا، وأنه أتاني يطلب أجره، فقلت: اعمد إلى تلك البقر فسقها، فقال لي: إنما لي عندك فرق من أرز، فقلت له: اعمد إلى تلك البقر فإنها من ذلك الفرق فساقها، فإن كنت تعلم أني فعلت ذلك من خشيتك ففرج عنا، فانساخت عنهم الصخرة .

فقال الآخر: اللهم إن كنت تعلم كان لي أبوان شيخان كبيران، وكنت آتيهما كل ليلة بلبن غنم لي، فأبطأت عنهما ليلة، فجئت وقد رقدا، وأهلي وعيالي يتضاغون من الجوع، وكنت لا أسقيهم حتى يشرب أبواي، فكرهت أن أوقظهما، وكرهت أن أدعهما فيستكنا لشربتهما، فلم أزل أنتظر حتى طلع الفجر، فإن كنت تعلم أني فعلت ذلك من خشيتك ففرج عنا، فانساخت عنهم الصخرة حتى نظروا إلى السماء .

فقال الآخر: اللهم إن كنت تعلم أنه كانت لي ابنة عم من أحب الناس إلي، وإني راودتها عن نفسها فأبت إلا أن آتيها بمائة دينار، فطلبتها حتى قدرت فأتيتها بها فدفعتها إليها، فأمكنتني من نفسها، فلما قعدت بين رجليها، قالت: اتق الله ولا تفض الخاتم إلا بحقه، فقمت وتركت المائة دينار، فإن كنت تعلم أني فعلت ذلك من خشيتك، ففرج عنا، ففرج الله عنهم فخرجوا.

[65]- (گول) بە کەسێک دەوترێت کە تووشی نەخۆشی پێست دەبێت، پێستی بۆنی دێت، بەو کەسە دەڵێن گول.

خوای گەورە ئەم سێ کەسە تاقی دەکاتەوە و تووشی خۆشی و شەڕیان دەکات، خوای پەروەردگار فریشتەیەک دەنرێت بۆ لای هەر سێ یان، هەڵبەت بە جیاوازی، یەکەم جار فریشتەکە دەچێتەوە لای گولەکە، دەڵێت ئاواتت چییە تا خوای موتەعال بۆت بهێنێتە دی؟ لە وەڵامدا دەڵێت: ڕەنگی پێستێکی جوان باشم بداتێ، خەڵکی بێزم لێ دەکەنەوە و ناتوانم تێکەڵ بە خەڵکی بم. فریشتەکە بە دەستی مەسحی لاشەی کرد کەسە گولە نەخۆشەکە چاک بوویەوە، جوانترین ڕەنگ و پێستی پێ درا لە لایەن پەروەردگارەوە.

فریشتەکە پرسی ئەی سەروەت و سامان چیت دەوێت؟ ئەویش وتی: وشتر! فریشتەکە وشترێکی ئاوسی پێ بەخشی و پێی وت خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ماڵ و سامانت.

پاشان فریشتەکە هاتە لای کەچەڵەکە و پێی وت چی ئارەزووتە، تا خوای موتەعال پێت ببەخشێت؟ داوای قژێکی جوانی کرد کە چیتر خەڵکی گاڵتەی پێ نەکەن و بتوانێت بڕواتە ناو کۆمەڵگە، دەستی هێنا بە سەریدا مووەکانی پڕ بووەوە و ڕوخسارێکی جوانی پێبەخشی خوای موتەعال، پاشان پرسی ئەی سەروەت و سامان چیت حەز لێیە؟!

کەچەڵەکە وتی مانگام دەوێت، فریشتەکە بە فەرمانی خوای موتەعال مانگایەکی ئاوسی پێ بەخشی و فەرمووی خوای گەورە ماڵ و سامانت پڕ بەرەکەت بکات.

فریشتەکە هاتە لای کوێرەکە و هەمان گفتوگۆی دووبارە کردەوە ئەویش داوای چاوساغی کرد تا دنیای ڕووناکی پێ ببینێت، فریشتەکە دەستی هێنا بە چاویدا و بە فەرمانی خوای موتەعال چاک بوویەوە، خەڵکی بینی و پاشان پرسی سەروەت و سامانت چی دەوێت، ئەویش داوای مەڕی کرد، فریشتەکە مەڕێکی ئاوسی پێ بەخشی.

خوای گەورە بەرەکەتی خستە ناو ماڵ و سەروەتی هەر سێ لایان هەریەکە بوونە خاوەنی دۆڵێکی پڕ لە وشتر و مانگا و مەڕ.

پاشان خوای گەورە لە شێوەی گولەکە خۆیدا کەسێکی بۆ نارد، وتی من کەسێکی هەژارم ڕێگام هەڵەکردووە و لەسەفەرەکەمدا هیچ پێویستییەکم پێنەماوە و کەسم نییە ڕووی تێبکەم، خوای پەروەردگارم هەیە و پاشان تۆ ئەگەر هاوکارم بیت، جا داوات لێ دەکەم بە ناوی ئەو کەسەی کە ئەو شێوە و ڕووکەشە جوان و پێستە ناسکەی پێ داویت و ماڵ و سەروەتی زۆری پێ بەخشیویت وشترێکم پێببخشە بۆ ڕێگاکەم با هاوکارم بێت؟!کەسە گولەکە چاک بووەکە وتی توانام نییە و هاوکاری ترم زۆر لەسەرە، ئینجا هەژارەکە وتی: وەکو بڵێت نەتناسم، تۆ پێشتر کەسێکی پیس و نابووت بوویت، خەڵکی بێزیان لێت دەکردەوە؟!

هەژار و زەبوون بوویت خوای گەورە دەوڵەمەندی کردی؟

ئینجا کەسە گولە چاکبووەکە وتی: نەخێر من باو و باپیرانم، هەر خاوەن گەورەیی بوون لەو گەورانەوە ئەم سەروەتەم بۆ ماوەتەوە!

کەسە هەژارەکەش وتی: ئەگەر درۆزن بوویت و درۆت کرد، خوای پەروەردگار وەکو جارانت لێ بکاتەوە، وەکو جارانی لێ هاتەوە!

پاشان هاتە لای کەچەڵەکە لە شێوەی کەچەڵی خۆیدا، دیارە مەبەستی لە فریشتەکە بە فەرمانی خوای گەورە چۆتە لایان، بە کەچەڵەکەی وت کە هەژارە و لێی قەوماوە، بەڵکو مانگایەکی پێ ببەخشێت، ئەویش هاوشێوەی کەسە گولەکە وەڵامی دایەوە، بە خیل بوو درۆیکرد و هیچ هاوکاری هەژاری نەدەکرد و وتی لە باو باپیرانم بۆمان ماوەتەوە، تا لە کۆتاییدا ئەویش هەژار و کەچەڵ کەوتەوە.

هاتە لای کەسی سێیەم کە کوێر بوو چاک بوویەوە، لە شێوەی کوێردا هات و وتی: کوێر و هەژارم و لێ قەوماوم کەس شک نابەم، بێجگە خوای پەروەردگار پاشان تۆ هاوکاریم بکە، سوێندت ئەدەم بەو کەسەی کە چاوی چاک کردوویتەوە بەڵکو مەڕێکم پێ ببەخشیت بۆ ئەوەی لەسەفەرەکەمدا سوودی لێ وەربگرم.

کوێرەکە دەڵێت من کوێر بووم خوای پەروەردگار ساغی کردمەوە، هەژار بووم دەوڵەمەندی کردم، بڕۆ بە ئارەزووی خۆت چیت دەوێت بڕۆ بیبە و هەڵبژێرە بە ئارەزووی خۆت ئەوەی دەیبەیت ڕێگریت لێناکەم، لە پێناوی خودا دەیبەخشم پێت.[66]

---

[66]- روى البخاري ومسلم من غير وجه: عن همام بن يحيى، عن إسحاق بن عبد الله بن أبي طلحة، حدثني عبد الرحمن بن أبي عمرة أن أبا هريرة حدثه أنه سمع رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقول: إن ثلاثة في بني إسرائيل: أبرص، وأعمى، وأقرع، بدا الله أن يبتليهم، فبعث الله إليهم ملكا، فأتى الأبرص فقال له: أي شيء أحب إليك؟

فقال: لون حسن وجلد حسن، قد قذرني الناس، قال: فمسحه فذهب عنه، فأعطي لونا حسنا وجلدا حسنا .

فقال: أي المال أحب إليك؟

قال: الإبل، أو: قال البقر - هو شك في ذلك أن الأبرص والأقرع قال أحدهما: الإبل، وقال الآخر: البقر - فأعطي ناقة عشراء، فقال : يبارك لك فيها .

قال: وأتى الأقرع فقال له: أي شيء أحب إليك؟

قال: شعر حسن، ويذهب عني هذا، قد قذرني الناس، فمسحه فذهب، وأعطي شعرا حسنا .

قال: فأي المال أحب إليك؟

قال: البقر، فأعطاه بقرة حاملا، وقال: يبارك لك فيها .

قال: وأتى الأعمى فقال: أي شيء أحب إليك؟

قال: يرد الله إلي بصري فأبصر به الناس، قال: فمسحه فرد الله إليه بصره .

قال: فأي المال أحب إليك؟

قال: الغنم فأعطاه شاة والدا، فأنتج هذان وولد هذا، فكان لهذا واد من الإبل، ولهذا واد من البقر، ولهذا واد من الغنم .

⇐ ==

## ئەمانەتیی کەسێک لە گەلی ئیسرائیل

بوخاری دەگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پیاوێک خانوویەکی کڕی، ئەو کەسەی زەوی خانوویەکەی کڕی بوو لە ناو خاکیماڵەکەی دا کوپەیەک لە ئاڵتونی دۆزییەوە، بردییەوە بۆ خاوەنی ماڵەکەی کە پێشتر لێی کڕی بوو، پێی وت: ئەمەم لەناو زەوی و خاک و خۆڵی ماڵەکەمدا دۆزیوەتەوە، ئەمە ماڵی من نییە، من تەنها خانووەکەم لێ کڕیویت، فرۆشیارەکە دەڵێت: من ماڵ و زەویەکەم پێ فرۆشتوویت بە هەرچییەک لە ناویدا بووە، کڕیارەکەش دەڵێت، من زەوییەکەم کڕیوە لێت، نەک کوپە ئاڵتوونەکە.

دەچنە لای کەسێک کە حوکمیان بکات، حاکمەکە دەڵێت: ئەگەر کچ و کوڕتان هەیە بیدەنە یەکتری، ئەو کوپە ئاڵتونە لە بووک و زاوەیەکە خەرج بکەن.[67]

ئیمام ئەحمد لە ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە پێغەمبەری ﷺ خوا فەرمووی لە باسی پیاوێکی گەلی ئیسرائیل، پێوستی بە (١٠٠٠ دینار) قەرز بوو بۆ ماوەیەک کەسێ لە گەلی ئیسرائیل پارەکەی دایە بە قەرز. کەسەکە وتی شاهید بهێنە با شاهێدی بدەن لە نێوانماندا، قەرز وەرگرەکە وتی خوای گەورە با شاهێد بێت لە نێوانماندا، پاشان قەرزدەرەکە وتی: دەی باشە کەسێک بهێنە با ببێتە کەفیل لە نێوانماندا، ئەویش وتی: خوای گەورە کەفیل بێت، ئەویش خوای گەورە کەفیلە، وتی: ڕاستت کرد و پارەکەی هەمووی پێدا تەنها خوای گەورە ئاگادار بوو لە نێوانیاندا.

ئەو کەسەی کە قەرزەکەی وەرگرت پەڕیەوە لە دەریا و چووەتە ئەو جێگایەی مەبەستی بوو کارەکەی خۆی ئەنجام داو ویستی بگەڕێتەوە کەشتی دەست نەکەوت، تا لە مەوعیدی خۆیدا پارەکە بداتەوە خاوەنەکەی، کەسەکە دارێکی هێنا و هەڵیکۆڵی، (١٠٠٠ دینارەکە)ی

---

ثم إنه أتى الأبرص في صورته وهيئته فقال: رجل مسكين تقطعت بي الحبال في سفري، فلا بلاغ اليوم إلا بالله ثم بك، أسألك بالذي أعطاك اللون الحسن، والجلد الحسن، والمال , بعيرا أتبلغ عليه في سفري .

فقال له: إن الحقوق كثيرة، فقال له: كأني أعرفك، ألم تكن أبرص يقذرك الناس، فقيرا فأعطاك الله عز وجل .

فقال : إنما ورثت هذا المال كابرا عن كابر، فقال: إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت .

وأتى الأقرع في صورته وهيئته فقال له مثل ما قال لهذا، فرد عليه مثل ما رد عليه هذا، فقال: إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت .

وأتى الأعمى في صورته وهيئته ، فقال: رجل مسكين وابن سبيل، وتقطعت بي الحبال في سفري، فلا بلاغ اليوم إلا بالله ثم بك، أسألك بالذي ردَّ عليك بصرك، شاة أتبلغ بها في سفري، فقال: قد كنت أعمى فرد الله إلي بصري، وفقيرا فقد أغناني، فخذ ما شئت فوالله لا أجهدك اليوم بشيء أخذته لله عز وجل .

فقال: أمسك مالك فإنما ابتليتم فقد رضي الله عنك، وسخط على صاحبيك.

67- عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: اشترى رجل من رجل عَقَارًا، فوجد الذي اشترى العَقَارَ في عَقَارِه جَرَّةً فيها ذهب، فقال له الذي اشترى العقار: خذ ذهبك، إنما اشتريت منك الأرض ولم أَشْتَرِ الذهب، وقال الذي له الأرض: إنما بِعْتُكَ الأرض وما فيها، فتحاكما إلى رجل، فقال الذي تحاكما إليه: أَلَكُمَا ولد؟ قال أحدهما: لِي غلام، وقال الآخر: لي جارية قال: أنكحا الغلام الجارية، وأنفقا على أنفسهما منه وتَصَدَّقَا.

خستە ناوی و لەگەڵیدا نامەیەکی نوسی بۆ هاوڕێکەی، پارەکەشی خستە ناو دارەکە کە هەڵیکۆڵی بوو ١٠٠٠ دینارەکەی تێخستبوو، دارەکەی خستە ناو دەریاکە و لە خوای گەوە پارایەوە دەسی کرد بە دوعا کردن وتی:

ئەی پەروەردگارم زاتی بەرزت دەزانێت کە ١٠٠٠ دینارم لە کەسێک وەرگرت داوای شاهیدی و کەفیلی لێکردم زاتی بەرزتم کردە شاهێد و کەفیل، ئەویش ڕازی بوو، وا بە دوای کەشتییەکدا دەگەڕێم کە لەسەر دەریا هەڵم بگرێت و پارەکەی بدەمەوە، بەڵام بۆ ئەوەی پەیمانەکەی خۆم بەرمە سەر، ئەوا پارەکەم هەڵداوەتە ناو دەریاکە، بەڵکو بگاتەوە دەستی.

ئەو کەسەش کە قەرزەکەی دابوێ ڕۆژانە لەسەر پەیمانەکەیان دەهاتە سەر کەناری دەریاکە چاوەڕوانی قەرزکەی دەکرد، بەڵام دیار نەبوو، پاشان لە کەنار دەریاکە دارێکی دۆزیوە هەڵی گرتەوە ویستی بۆ سووتاندن بەکاری بهێنێت کاتێک هاوسەرەکەی چێشت لێ دەنێت، کە دارەکەی هەڵگرت و لەکاتی شکانی دارەکە بۆ سووتاندن، بینی هەڵکۆڵاوە و ١٠٠٠ دینارەکە و نامەیەکی کابرای تێدایە، کە حاڵ و گوزەرانەکەی خۆی تێدا باس کردووە.

پاش ماوەیەک کابرای کە قەرزەکەی کرد بوو هات و ١٠٠٠ دینارەکەی بۆ هێناوە، سوێندی بۆ خوارد کە بەردەوام لە هەوڵی بەدەست خستنی کەشتی بووە، بەڵام دەستی نەکەوتووە بۆیە درەنگ کەوتووە.

خاوەن قەرزەکە وتی ئەی مەگەر بۆت نەناردوومەتەوە؟!

قەرزارەکە دەڵێت: ئەی ئەوە نیە بۆت باس دەکەم، کەشتیم دەست نەکەوتووە ئیتر چۆن بۆت بنێرمەوە؟

خاوەن قەرزەکە دەڵێت: خوای پەروەردگار قەرزەکەی بۆ داویتەوە لە ناو دارێکدا من پارەکەی خۆم وەرگرتۆتەوە، ١٠٠٠دینارەکەی ترماڵی خۆتە و بۆ خۆت دەگەڕێتەوە و من پارەی خۆمم وەرگرتۆتەوە.[68]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[68]- القصة رواها البخاري في صحيحه عن أبي هريرة رضي الله عنه عن رسول الله صلى الله عليه وسلم )أنه ذكر رجلا من بني إسرائيل , سأل بعض بني إسرائيل أن يُسْلفَه ألف دينار , فقال : ائتني بالشهداء أشْهِدُهُم , فقال : كفى بالله شهيدا , قال :فأتني بالكفيل , قال : كفى بالله كفيلا , قال : صَدقت , فدفعها إليه إلى أجل مسمى , فخرج في البحر , فقضى حاجته , ثم التمس مركبا يركبها يقْدَمُ عليه للأجل الذي أجله , فلم يجد مركبا , فأخذ خشبة فنقرها فأدخل فيها ألف دينار , وصحيفةً منه إلى صاحبه , ثم زجّجَ موضعها , ثم أتى بها إلى البحر , فقال : اللهم إنك تعلم أني كنت تسَلّفْتُ فلانا ألف دينار , فسألني كفيلا ,فقلت : كفى بالله كفيلا , فرضي بك , وسألني شهيدا , فقلت : كفى بالله شهيدا , فرضي بك , وأني جَهَدتُ أن أجد مركبا أبعث إليه الذي له , فلم أقدر , وإني أستودعُكَها , فرمى بها في البحر حتى ولجت فيه, ثم انصرف , وهو في ذلك يلتمس مركبا يخرج إلى بلده , فخرج الرجل الذي كان أسلفه ينظر لعل مركبا قد جاء بماله , فإذا بالخشبة التي فيها المال , فأخذها لأهله حطبا, فلما نشرها , وجد المال والصحيفة , ثم قَدم الذي كان أسلفه , فأتى بالألف دينار , فقال : والله ما زلت جاهدا في طلب مركب لآتيك بمالك فما وجدت
<==

مەملەکەتی هەژدەیەم:

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لە سیرەتی موبارەکیدا زۆرێک لەم باسانەی بۆ هاوەڵە بەڕێزەکانی و ئوممەتەکەی گێڕاوەتەوە، تا ببێتە پەند و عیبرەت و وانەیەک کە مرۆڤەکانی لەسەر پەروەردە دەبێت بە چاکە و باشترین شێوە، هەروەکو چۆن قورئان باسی گەلانی ڕابردووی بۆ کردووین بە هەمان شێوە سوننەت کە وەحییە وتەی پێغەمبەرە ﷺ، باسی گەلانی ڕابردووی بۆ کردووین.

## ژیانی گەلانی ڕابردوو لە قورئاندا بۆ پێغەمبەر ﷺ

بێجگە ژیانی پێغەمبەران و واقعی ژیانیان خوای موتەعال بۆ پێغەمبەر ﷺ و ئوممەتەکەی گێڕاوەتەوە لە ژیانی ڕابردووی گەلان لە بارەی ژیار و شارستانیەت و چۆنیەتی پەروەردەوە جا چی لە ڕووی کۆمەڵگەوە بێت یاخود پەروەردەی خێزانی و منداڵ، هەروەها لە بارەی دەسەڵاتەوە بە هەر دوو بەشەکەی زاڵم و دادپەروەر.

هەموو ئەم باسانە کاریگەری تەندروستی خۆی هەیە لەوانەیە ئەو پەند و عیبرەتانە نموونەی ئەو باسانە زۆرە لە قورئاندا ئاماژە بە هەندێکی دەکەین لەوانە: هاوەڵانی ئوخدود، لوقمانی حەکیم، شارستانییەتی سەبەئی خاوەن باخ و باخاتەکان، سوپای فیل کە ناسراوە بە سوپای ئەبرەهە...هتد.

هەموو ئەم باسانە مەدلولاتی تایبەتی هەیە لە مێژوودا، کە قورئان بۆی زیندووو کردووینەتەوە، بۆ نموونە ئەو ڕەوشتەی کە حەزرەتی لوقمان فێری کوڕەکەی دەکات، هەر هەمان ڕەوشت و بیرو باوەڕەیە کە ئێمـەش لە ڕۆژگاری ئەمرۆماندا ئاواتە خوازین فێری نەوە و منداڵەکانمانی بکەین، هەمان ئازایەتی دایک و منداڵێکە لە جینۆسایدی خەڵکی ئوخدودا، کە فێر دەبین مردن بە دەستی زاڵمان بردنەوەیە و سەربەرزییە.

هەموو باسەکانی تری قورئان ڕووداوەکانی وزە و توانایەکی بێ وێنەیە بۆ شوێنکەوتووانی سیرەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

## نموونەی خاوەن باخ و باخاتەکان

خوای پەروەردگار کە ئەم باسەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە لە سورەتی القلم دا، خەڵکی قوڕەیش خۆیان باش لە مێژووەکە شارەزابوون، دەیانزانی ڕووداوەکە چۆن بوو، چۆن ڕوویداوە، بۆیە خوای پەروەردگار بیری خستنەوە کە ئێوەی قوڕەیش بە سەروەت و سامان و

---

مرکبا قبل الذي أتيت فيه , قال : هل كنت بعثت إلي بشيء , قال : أخبرك أني لم أجد مركبا قبل الذي جئت فيه , قال : فإن الله قد أدى عنك الذي بعثت في الخشبة , فانْصَرِفْ بالألف الدينار راشدا. ئەم فەرموودەیە لە بوخاریدا بە موعەلەقی هاتووە و لای بوخاری لاوازە.

ماڵ منداڵتاندا دەنازن، لە ڕێگای ئەو سەروەت سامانەتان دەستدرێژی دەکەن و زوڵم و زۆرداری دەکەن. نموونەی خاوەن باخەکانتان لەبیرە کە خوای پەروەردگار تووشی چ بەڵا و موصیبەت و ئیبتیلای کردن، بە هۆکاری تاوانباری خۆیان؟

خوای پەروەردگار باسی ڕووداوێک دەکات کە زۆر بەربڵاوە لە ناو قورەیش دا، خوای موتەعال دەفەرموێت: إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُواْ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْاْ مُصْبِحِينَ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُواْ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُواْ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْاْ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓاْ إِنَّا لَضَآلُّونَ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ﴿٢٨﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ﴿٣٠﴾ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴿٣٣﴾ القلم

واتە: ئێمە کافرانی مەککەمان تاقیکردەوە بە برسێتی و نەبوونی کە پێغەمبەر ﷺ دوعای لێ کردن، هەروەکو چۆن هاوەڵانی باخەکەمان تاقیکردەوە کاتێك لە دوای وەفاتی باوکیان سوێندیان خوارد ئەبێ بەرهەمی باخەکەمان بڕنین لە بەرەبەیانی زوودا پێش ئەوەی کە هیچ کەسێك ئاگاداربێ و بەخەبەر بێ بۆ ئەوەی فەقیر و هەژار نەچێ و داوایان لێ نەکات﴿١٧﴾[69] نەشیان وت (إن شاء الله)، یاخود بە گومانی خۆیان فەقیر و هەژارانیان لێ بێ بەش کرد﴿١٨﴾ ئەمان شەو ئەو بڕیارەیانداو خەوتن، لەلایەن خوای گەورەوە ئافەت و بەڵایەك یان ئاگرێك دای لە باخ و بێستانەکەیان و هەر هەمووی سووتاند﴿١٩﴾ وەکو شەوی تاریکی لێهات، وەك ئەوەی کە بەرهەمی ڕنرابێت و هیچ شتێکی پێوە نەمابێت﴿٢٠﴾ بەیانی زوو ئەمان لە خەو هەڵسان و بانگیان لە یەکتری کرد﴿٢١﴾ وتیان: لە بەرەبەیانی زوو بکەونە ڕێ بۆ لای بەرهەم و باخەکەتان ئەگەر ئەتانەوێ ئێوە باخەکە بڕنن﴿٢٢﴾ ئەوان کەوتنە ڕێ بەڵام بە نهێنی و چپەچپ لە نێوان خۆیاندا

---

[69]- هاوەڵانی باخەکە سێ برا بوونە لە دێیەك بوونە ناوی (ضهروان) بووە دوو (فەرسەخ) واتە: شەش میل لە (صەنعا)ی پایتەختی (یەمەن)هوە دوور بووە، یاخود وتراوە: لە (حەبەشە) بووە، ئەمانە باوکێکی چاکیان هەبووە کە باخ و بێستانی هەبووە کە جۆرەها میوەو بەروبوومی هەبووەو ساڵانە کردوویەتی بە سێ بەشەوە: بەشێکی لە ڕێی خوا کردووە بە خێرو زەکاتی لێداوە، بەشێکیشی بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی داناوە، بەشێکیشی بۆ بنەتۆو و مەسرەفەکەی بۆ ساڵی داهاتوو هەڵگرتووە، کە باوکیان مرد ئەمان وتیان: باوکمان لە هەڵەدا بووەو نەزان بووە کە ئەم ماڵەی ئاوا لێ کردووە، ئێستا بەرهەمەکە کەمە و ماڵ و منداڵمان زۆرەو بەشمان ناکات، ویستوویانە فەقیرو هەژاری لێ بێبەش بکەن، کە ئێستا خوای گەورە باسی بەسەرهاتەکەیان ئەکات.

قسەیان ئەكرد بۆ ئەوەی كەس دەنگیان نەبیستێت و شوێنیان نەكەوێت﴿٢٣﴾ وتیان: ئەبێ ئەمرۆ بە نهێنی بڕۆین بە شێوازێك كە هیچ فەقیر و هەژارێك هەستمان پێ نەكات﴿٢٤﴾ ڕۆیشتن بە تەنها خۆیان جیا كردەوە لە قەومەكەیان و وا ڕۆیشتن كە بەهێزو بەتوانان و توانایان هەیە لەسەر ڕنینەوەی باخەكەیان﴿٢٥﴾ كاتێك كە باخەكەیان بینی بەرهەم و جوانی و سەوزی نەماوەو ڕەش بووە وتیان: ئێمە ڕێگەمان هەڵەو ون كردووەو ئەمە باخی ئێمە نییە، نەیانزانی كە باخەكەی ئەوانەو خوای گەورە سزای داون و بەڵایەكی ناردۆتە سەری و هیچی نەهێشتووە﴿٢٦﴾ دواتر دڵنیابوون كە ئەمە باخەكەی خۆیانەو ڕێیان هەڵە نەكردووە، بەڵام خوای گەورە بێ بەشی كردوون لە بەرهەمەكەی لەبەر نیەت خراپی خۆیان﴿٢٧﴾ ئەوەی كە لە هەموویان ژیرترو عاقڵترو باشترو چاكتر بوو وتی: ئایا من پێم نەووتن بڵێن: (إن شاء الله) و (إن شاء الله) بكەن، ئێستایش پەشیمان ببنەوەو داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بكەن هەر باشە﴿٢٨﴾ ئەوانیش پەشیمان بوونەوە و وتیان: پاكی و مونەززەهی بۆ پەروەردگارمان لە هەموو كەموكوڕییەك لەو خراپەیەی كە ئێمە كردمان، بەڕاستی ئێمە ستەممان لە خۆمان كرد كە نییەتمان خراپ بوو نییەتمان وابوو بەشی فەقیر و هەژاری لێ نەدەین﴿٢٩﴾ هەندێكیان ڕوویان كردە هەندێكیان و لۆمەو گلەیی و گازاندەیان لە یەكتری ئەكرد﴿٣٠﴾ وتیان: هاوار بۆ خۆمان بەڕاستی ئێمە دەستدرێژی و سنووربەزاندن و سەركەشیمان كرد﴿٣١﴾ وتیان: ئێمە تەوبەمان كردو پەشیمان بووینەوەو بۆ لای خوا گەڕاینەوە، بەڵكو خوای گەورە بۆمان بگۆڕێ بە باشتر، وتراوە: دوای پەشیمان بوونەوەو تەوبە كردنیان خوای گەورە باشتری پێ بەخشیون ئێمە دەمانەوێت بۆ لای خوای گەورە بگەڕێینەوە و بەڵكو خوای گەورە لێمان ببورێ و لێمان خۆشبێ و بە باشتر باخەكەمان بۆ بگۆڕێ﴿٣٢﴾ خوای گەورە ئەفەرمووێ: سزای ئێمە بەم شێوازەیە بۆ كەسانێك كە سەرپێچی بكەن و مافی فەقیرو هەژار نەدەن، چۆن سزای هاوەڵانی باخمان دا ئاوایش سزای كافرانی مەككە ئەدەین، بەڵام بە دڵنیایی سزای ڕۆژی قیامەت زۆر لەمە گەورەترو سەختترە ئەگەر بزانن﴿٣٣﴾

لە ڕێگای دەقە قورئانییەكانەوە، وەكو جەنابی سەید قطب دەفەرموێت: خەڵكێكی زۆر سەرەتای كاڵ فام بوون، لە جێگا و لادێیەكدا بوون كە زۆر دوور بوون لە ئاوەدانی شارەوەو سادە بوون، هەر ئەم جۆرە لە مرۆڤ كە زۆر سادە و نەخوێندەوارن تووشی سەرەڕۆیی و دەمەدەمێ و ئینكاری دەبن، چونكە لە ناخیاندا هیچ جۆرە بیرو باوەڕ و مەبدەئێک نییە تا پشتی پێ ببەستن و بێ عەقیدەن.

خاوەنی باخەكە لە ڕابردوودا كەسێكی خواناس و خێر و خێراتی زۆری كردووە، وا ئێستا باخەكە كەتۆتە ژێر دەستی وەرەسە ئەوانیش بڕیار ئەدەن كە بەشی هەژارانی لێ نەدەن بەم

نیەتە خراپ و پیسەوە بڕیار ئەدەن کە بەرهەمی باخەکەیان لە بەرەبەیاندا بچنن کە هەژاران خەوتون و ناگەڕێن بە دوای قوتیاندا.

ئەوان بەو نیەتەوە خەوتن، بەڵام خوای گەورە نە وەنەوز ئەدات و نە دەخەوێت، خوای گەورە لەو شەوەی کە ئەوان بۆ بەرەبەیان چاوەڕوانن بەرهەمەکە بچننەوە بزانین چی ڕوو ئەدات؟!

هەروەکو بزوێنەیەکی تاریکی شەو لە شێوەی سێبەردا کە ناسکترین ماددەیە سێبەرەکە دەبێتە خێو و هەژدیها و باو بۆران و ئەوانیش لە خەودان، یەکتر هەڵدەسێنن بۆ پاراستنی بەشەکانیان لە بەروبوومی باخەکە فریای بکەون زوو هەڵسن بڕۆن بەروبوومەکە کۆبکەنەوە تا هەژاران بەخەبەر نەهاتوون، زۆر دڵسۆزی یەک بوون لە چروکی و پیسکەییاندا! پاشان لە شێوەیەکی زۆر گاڵتە ئامێز بە ئەقڵی خۆیان دەچپێنن بە گوێ یەکتری داو بە یەکتری دەڵێن خێراکەن تا هەژار و بێدەرەتانەکان هەڵنەساون لە خەو، نەیانزانیووە لەو شەودا، نەک هەژاران سوودی لێ وەرناگرن بەڵکو خۆشیان سوودی لێ وەرناگرن، خەڵکیان لێ مەحروم دەکرد وا خۆیانی لێ مەحرووم بوون! لەگەڵیدا نیەت پیس و سەرکەش و نەگبەت بوون و سەر لێشێواو بوون، سزاکەشیان لە جۆری کارەکەیانە، بەشی هەژاریان نەدا خۆشیان لێی بێبەش بوون.

ئەوەش کۆتایی عاقیبەتی خەڵکی چروکو خۆویست و پیسکەیە، بێجگە لەم جۆرە سروشتانە، سروشتی باش و پاکیان تێدایە کە پێشتر ئامۆژگاری کردوون، لێرەدا مانای ( أوسطهم) بە واتا باشترین و ئاقڵترین و خاوەن ئامۆژگاری دێت، پێشتر ئامۆژگاری کراون، بەڵکو حوججەیان لەسەر بووە و بۆیان ڕوون بۆتەوە، ئینجا کە زانیان تاوانبارن و خوای پەروەردگار تۆڵەی لێکردنەوە، ئەوە کەوتنە لۆمە کردنی یەکتری، بەڵام ئاماژەیەکی زۆر گرنگە بۆ قورەیش کە لە کۆتاییدا خوای گەورە بە پێغەمبەر دەفەرموێت: ئەوەی کە ڕوویداوە کوفری نیعمەتی دونیایە، تۆڵەیان لێ سەندراوە، بەڵام تۆڵەی قیامەتت زۆر ترسناکە هەموو ئەوانەی لە ڕابردووردا، خوای گەورە خستییە بەرچاوی قورەیش کە هەوڵدەن بگەڕێنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەیان، لە دوای ئەوانیش ئەم سوننەتە بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت.

## ژیانی شارستانییەتی سەبەء

سەبەء یەكێكە لە شارستانیەتە كۆنەكانی عەرەب، بە هۆكاری فارس و گەلی ئیسرائیل توانرا ئەو ناوچەیە ئاوەدان بكرێتەوە، خودی ناوچەكەش سروشتی بە هارە و جوان و پڕ ئاو و بەرەكەتی باران بووە لە یەمەنی ئێستادا ئەو شارستانییەتە دامەزراوە.

گەلی فارس گەلێكی كۆنەو خاوەنی مێژووی دێرینی ژیان و شارستانییەتە، گەلی ئیسرائیل چوونەوە ئەو ناوچەیە بە هۆكاری خێزانی بەڕێزی حەزرەتی (سولەیمان) بەلقیس خاتوون، كەواتە ژیار و شارستانیەتەكە لەو ناوچەیە زۆر گەورەو پێشكەوتوو بووە، كە خوای موتەعال بە نموونەی ئایەت باسی دەكات لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُواْ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُواْ لَهُۥ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُواْ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُواْ وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴿١٧﴾ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ ٱلْقُرَى ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَٰهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَ سِيرُواْ فِيهَا لَيَالِىَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُواْ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾﴾ سبأ

واتە: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كرا ئایا (سەبەء) زەوییە یان ئافرەتە؟ فەرمووی: بنچینەی هۆزەكانی عەرەب لە یەمەن دەگەڕێتەوە بۆ ئەم دە كەسە، (سەبەء) پاشا و هۆزێك بوونە لە یەمەن شوێنی نیشتەجێ بوونیان (مەئریب) بووە، نێوان (مەئریب و صەنعا) سێ قۆناغ بووە، ئێستا ناوچەیەكە لە یەمەن ئەمیش نیشانەو بەڵگەی دەسەڵات و توانای خوای گەورە بووە كە دوو باخیان هەبووە لەلای ڕاست و لەلای چەپیانەوە كە جۆرەها بەروبوومی هەبووە، خوای گەورە ئەفەرمووێت: بخۆن لەو ڕزق و ڕۆزییەی كە پەروەردگار پێی بەخشیوون و سوپاسی خوای گەورەشی لەسەر بكەن شارو وڵاتێكی خۆش لەبەر زۆری دارو بەرهەم و خۆشی ئاو و هەوایان تەنانەت وتراوە مێش و مەگەزو كێچ و ئەو شتانەشیان نەبووە، پەروەردگارێكی زۆر لێخۆشبوو بۆ تاوانەكانتان﴿١٥﴾ ئەمانە بە گشتی لە باشووری یەمەندا بوون، خاكەكەیان زۆر بە پیت و بەرەكەت بووە، تا ئەمڕۆش ئاسەواری ماوە زۆر پێشكەوتوو بوون، تەنانەت بە پلەكانی شارستانیەت دا سەركەوتبوون تا ئەو ڕادەیەی سوودیان لە ئاوی باراناو وەردەگرت و لە نێوانی دوو شاخدا كۆیان دەكردەوە بەنداوێكیان بۆ دروستكردبوو، بە ناوی (مەئرەب) (سد مئرب) زۆر سوودیان لەم سامانە سروشتییە وەردەگرت﴿١٦﴾ ئەو باخ و باخاتەی لایڕاست و چەپیان هەمووی ئاماژەیە بۆ بە پیت و بەرەكەتی ناوچەكەیان، هەموو ئەم ئایەت و جوانیانە لەسەریان بوو كە شوكرانەی خوای موتەعالی لەسەر بكەن﴿١٧﴾ هەموو ئەم باسانە بۆ قوڕەیش بوو، قوڕەیش زۆر

باش شارەزابوو لە مێژوو دەیزانی باو باپیرانی خۆیان لەو جێگایە دابوون، جا خوای موتەعال ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو پیت و بەرەکەت و سەرداری خێر و فەڕە لە کاتی سەبەء دا پێیان بەخشراوە، وا ئەم جارە بە شێوەیەکی تر زۆر لەو خێر و بەرەکەتە زیاتریان پێ بەخشراوە ئەویش هاتنی محمد ﷺ، بە هەرحاڵ خوای گەورە دەفەرموێت: لەو ڕزق و ڕۆزییەک کە پێتان بەخشراوە بخۆن، بەڵام سوپاسگوزاریش بن، لەسەر زەوی خێر و بێری داونەتێ لە ئاسمانیش خوایەکی غەفورو ڕەحیمیش هەیە داوای لێ خۆش بوونی لێ بکەن﴿١٨﴾ لە دوای سەرپێچییان خوای گەورە بۆی گۆڕین بە وشکانی لە جیاتی ئەو هەموو باخ و باخاتانە بۆ کردن بەداری دڕک و داڵ و سدر کە تەنانەت لە گەڵاکردنیش دا لاوازە و دڕکی زۆرە، بەڵام تا ئەوکاتەش هەر لە ناو ماڵەکەیاندا بوون، ئەگەرچی ڕزق و ڕۆزیان کەم بوو هەندێکیان، بەڵام زۆرینەیان لە دوای زەمین لەرزە و کەوتنە خوارە و هەرەسی خاک و داڕمانی زەوی بەنداوی مەئرەب ڕووخا و زۆرێک لە ناوچەکە بوو بە ئاو، دواتر بەشێکی زۆر لە ماڵەکانیان مابوو بۆ پشودان ئەگەرچی ڕزق و ڕۆزیان زۆر سەخت بوو بوو، بەشێکیان چوونە مەککە و مەدینە و بە حیجازدا بڵاو بوونەوە، هەندێکیان چوونە شام لەوێ بوونە نەسرانی﴿١٩﴾

بەهەرحاڵ خوای گەورە لەم ئایەتانە لە سورەتی سبأ-دا، باسی بنەڕەتی عەرەب دەکات زۆر کەم کەس هەبوون لە ناو عەرەبدا شارەزابن لە مێژوودا، مێژووی بەربڵاوی عەرەب بەو ناوچانەدا نەزانراو بوو، یا پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو کردارێکی هەڕەشەی وەحییە و بیرخستنەوەکە دوور نییە، هەمان ئاکاممان ئەبێت ئەگەر نەگەڕێینەوە بۆ لای ئایینی ئیسلام.

عەرەب نەک هەر دەشتەکی و گەڕۆکی بازرگانی بوون، بەڵکو مێژووی خۆشیان لە بیر کرد بوو، تا ئیسلام هات دووبارە مێژووەکەی بیرخستنەوە و لێی ئاگاداربوونەوە.[70]

## لوقمانی داناو حەکیم

خوای گەورە هەڵیبژاردووە لە قورئاندا بە کەسێکی حەکیم و دانا، حیکمەتەکەشی لە شوکر و سوپاسگوزاریدا بوو هەمیشە، سەرچاوەی حیکمەتەکە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە.

دەڵێن پێغەمبەر بووە، هەروەها دەڵێن کەسێکی خواناس و بیروباوەڕ پاک و ئەولیای خوا بووە لە پیاو چاکانی خوایە، زۆرینەی ئەهلی زانست و ئیسلامەتی لە سەر ڕای دووەمن، کە پیاو چاک بووە پێغەمبەر نەبووە، هەندێک دەڵێن حەبەشی بووە، هەندێکی تر دەڵێن خەڵکی

[70]- سەرەنجی خوێنەر ڕادەکێشین بۆ زانیاری زیاتری ئەم باسە و پادشاکانی عەرەب کە ناسراون بە ( توببەع)، هەروەکو چۆن پادشای فارس پێیوتراوە ( کیسرا) و پادشای ڕۆم ( قەیسەر)، پادشای حەبەشە ( نەجاشی) بە عەرەبیش وتراوە ( توببەع)، هەموو بە ورد و درێژی لە بەرگی یەکەمی کتێبی(مەملەکەتی نوور) باسکراوە، کە عەرەب کێیە و مێژووی چۆن دەستی پێ کردووە.

ئەسوان بووە لە میسر، هەندێکی تر دەڵێن قازیی (قاضی) گەلی ئیسرائیل بووە، بۆ ئەم وتانە بەڵگەی ئەوتۆ لەبەر دەست نییە کە خەڵکی کوێیە، بەڵام خەڵکی هەر جێگاو شوێنێکە قورئان بۆ ئێمەی باس کردووە کە خاوەنی حیکمەت و دانایی بووە. خوای گەورە هەڵیبژاردوە و لە قورئاندا بۆی باسکردووین، کۆی گشتی حیکمەتەکەشی لە سوپاسگوزاریدا کۆبۆتەوە، حیکمەتی سوپاسگوزاری خوای موتەعال بۆ خودی مرۆڤەکانە، چونکە خوای موتەعال دەوڵەمەندە و پێویستی بە سوپاسگوزاری مرۆڤ نییە، بەڵکو سوپاسگوزارییەکەش بۆ خۆ نزیک کردنەوەیە و عیبادەتە بۆ خۆمان و پاداشتی لەسەر وەردەگرین.

خوای موتەعال دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾﴾ لقمان

واتە: بەدڵنیایی ئێمە حیکمەت و زانیاری و تێگەیشتن و پێکان لە وتەو کاربەجێیمان بە لوقمان بەخشی، خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە کە شوکرانەبژێری خوای گەورە بکات لەسەر ئەو بەخششانەی کە پێی بەخشیووە، هەر کەسێکیش شوکرانەبژێری خوای گەورە بکات ئەوە سوپاسی خۆی کردووەو سوودەکەی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە، هەر کەسێکیش کوفرانەی نیعمەتەکانی خوای گەورە بکات و نکوڵی لێ بکات ئەوە بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر دەوڵەمەندو بێ پێویستییە لەوەی کە سوپاسی بکەی، زۆر سوپاسکراوە لە لایەن هەموو دروستکراوەکانی ترەوە﴿١٢﴾ کاتێك لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی خۆی ئەکرد پێی فەرموو: ئەی کوڕی خۆم شەریك و هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار مەدە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە تاك و تەنها و بێ هاوەڵە بەڕاستی شەریك دانان بۆ خوا گەورەترین زوڵم و ستەمە کە کرابێت﴿١٣﴾ ئێمە ئامۆژگاری مرۆڤمان کردووە کە چاکەکار بن لەگەڵ دایك و باوکیاندا ئەو دایکە ئەو منداڵە لەناو سکیدا هەڵئەگرێ، لاوازی لەسەر لاوازی تا منداڵەکە گەورەتر بێ دایکەکە زیاتر لاواز ئەبێ، دوو ساڵیش شیری پێ دەدات و دوای دوو ساڵ لە شیر ئەیبڕیتەوە، سوپاسی من بکە و سوپاسی

دایك و باوکیشت بکە، سەرەنجام و گەڕانەوەیشتان هەر بۆ لای منە ‌ئەگەر دایك و باوکەکە هەوڵ و کۆششیان لەگەڵدا دایت بۆ ئەوەی کە شەریك بۆ من دابنێی لە کاتێکدا تۆ هیچ زانست و زانیارییەکت نییە کە خوای گەورە شەریکی هەبێ، ئەوە تۆ لەو شتەدا بە قسەیان مەکە و گوێڕایەڵییان مەکە، بەڵام لە دونیادا چاکەکاربە لەگەڵیاندا ئەگەر موشریکیش بوون تۆ هەر لەگەڵیاندا چاکە بکە، تەنها بە قسەیان مەکە، تۆ شوێنی ئەو کەسانە بکەوە کە بۆ لای من گەڕاونەتەوە لە بەندە چاکە باوەڕدارەکان پاشان گەڕانەوەو سەرەنجامتان هەر بۆ لای منە، من هەواڵتان پێ ئەدەم کە لە دونیا ئێوە چ کردەوەیەکتان کردووە ‌ئەی کوڕی خۆم ئەگەر بێتوو تاوانێك بکەی بە کێش و ئەندازەی گەردێکی بچووك لە تۆوی دانەوێڵە ئەوەندە بچووك بێ کە هەر کێشی نییە، ئەگەر لەناو تاوێرێکیشدا بیکەیت، واتە لە شوێنێکی تاریك و پارێزراویش ئەو تاوانە بکەی یان لە ئاسمانە فراوانەکاندا بێت یاخود لە تاریکی زەویدا بێت، ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەیهێنێت و لێپرسینەوە لەگەڵ خاوەنەکەیدا ئەکات، چونکە هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە بە دڵنیایی هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە و خوای گەورە زانیارییەکی زۆر وردی هەیە ‌ئەی کوڕی خۆم نوێژەکانت ئەنجام بدە لە کاتی خۆیدا بە ڕوکن و واجبات و خشوعەوە، فەرمان بە چاکە بکە، ڕێگری و قەدەغەی خراپە بکە، ئارام بگرە لەسەر ئەو بەڵا و موسیبەت و ناخۆشییانەی کە ڕووبەڕووت ئەبێتەوە، بە دڵنیایی ئەمانە لە کارە گرنگ و چاکەکانە ‌لە کاتی قسە کردندا ڕووت لە خەڵکی وەرمەگێڕە، لەخۆبەگەورە زانین و بەکەم زانینی ئەواندا، بە لووتبەرزی و فەخر و شانازی کردنەوە بەسەر زەویدا مەڕۆ و لووتبەرز مەبە، بە دڵنیایی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێ کە خۆیان هەڵئەکێشن و لووتبەرزن و فەخر و شانازی بەسەر خەڵکیدا ئەکەن ‌لە ڕۆیشتنیشدا بە لووتبەرزییەوە مەڕۆ، بەڵکو بە هێمنی و ئارامی بڕۆ نە زۆر خێرابە نە زۆر هێواش بە بەڵکو مامناوەندی گورجوگۆڵ بە، دەنگیشت با نزم بێت و خەڵکی بێزار مەکە بە دەنگبەرزی، بە دڵنیایی ناخۆشترین دەنگ دەنگی گوێدرێژەکانە ‌

ئەم باسە کە سەرەتا بە حیکمەتی شوکرانە بژێری لوقمان دەست پێدەکات و هەرکەسێکیش ڕەصیدی سوپاسگوزاری بەهێز بێت ئەوا لە سوود و قازانجی خۆیەتی، خوای موتەعال بە زات و سیفاتی بەرزی خۆی سوپاسکراوە و دەوڵەمەند و بێنیازە و پێداویستی بە هیچ مرۆڤێک و دروستکراوێکی نییە.

پاشان لێرەوە وێنای ئامۆژگاری لوقمان لە بەشی دووەمی دوا باسی دانایی بۆ کوڕەکەی و باس پرسێکی زۆر گەورە دەکاتەوە کە باسی تەوحیدە.

ئامۆژگارییە لە نێوان کوڕ و باوک دا، ئەوەی لەسەر باوک پێویستە تەنها ئامۆژگارییە، ئەم باوکە بەڕێزە ڕێگری لە کوڕەکەی دەکات لە شەریک دانان، پاشان عیللەتی شیرکەکەی بۆ ڕوون دەکاتەوە کە زوڵم کردنە لە نەفسی خۆی و حەقی خوای پەروەردگار کە خالقی گەردوونە و هاوشێوەی نییە و تاک و تەنهایە دوو جار ڕوونی دەکاتەوە، جاری یەکەم عیللەتەکەی جاری دووەم بە گەورەی کارەکە و سزاو عەزابی.

ئەمەش هەمان ڕاستییە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی دەکردەوە بۆ خەڵکی قوڕەیش، لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو باوکێک بۆ نەوەکانی کە پرسی شەریک دانان ڕوون دەکاتەوە، ئەگەرچی کارەکە زۆر گەورەیە و خوای گەورە لە پێناویدا پێغەمبەرانی ناردووە، جیهادی لەسەر فەزر کردووە و خوێنی لەسەر ڕژاوە، بەڵام سەرەتای کارەکە و ڕوونکردنەوەی پرسەکە کە دژی تەوحیدە، دەبێت ئامۆژگاری بێت، ئەگەرچی گەلەکەش دەمەدەمێ و موجادەلەی دەکەن لەسەر باسی پرسەکە سکاڵا لە پێغەمبەر ﷺ دەکەن، چونکە مەبەستی لە پشتەوەیە لە لایەن قوڕەیشەوە، ترسەکەش ئەوەیە ڕایاندەماڵێت لە هەموو دەسەڵات و حوکم و سوڵطانێک، یەکسانی دروست دەکات، چینایەتی ناهێڵێت، هەروەها دەسەڵات لە خەڵکییەوە دەگەڕێتەوە بۆ خوای خەڵکی.

لێرەدا دوو پرسی گرنگ دێتە ئاراوە، یەکەمیان پەروەردەی کۆمەڵگەی قوڕەیش بە یەکتاپەرستی دژی شەریک دانان، پرسی دووەم پەروەردەکردنی منداڵەکان بۆ ئەوەی جارێکی تر کۆمەڵگە موشریک و خراپ دروست نەبێتەوە.

ئامۆژگاری لوقمان بۆ کوڕەکەی کە فەرمانی پێ دەکات موشریک نەبێت ئەم دڵسۆزیە بۆ کوڕە لە باوک هەرچی گومان و شوبهەیە لە ناوی دەبات هیچ جۆرە چەواشەکارییەک هەڵناگرێت، چونکە هەرچی باوک هەیە خۆشی و شادی بۆ کوڕەکەی دەوێت، خودی پرسی تەوحیدیش حەقیقەتێکی ڕاستییە لە ئەزەلەوە کە خوای موتەعال و تەنهایە، جا لەسەر زمانی خەڵکانێک لە کۆنەوە ڕوونکراوەتەوە، ئەگەر حەکیم و دانا بوو بێتن یان پێغەمبەران و شوێنکەوتوانی. ئەم باوکە بۆ کوڕەکەی خێری تەواوی دەوێت پاشان پەیوەندی خۆشەویستی دروست دەکات، ئەمەش کاریگەری زۆر گەورە دروست دەکات لەسەر دڵ و دەروونی منداڵ.

لە سێبەری ئەم ئامۆژگارییانەدا شێوە و هەڵسوکەوتێک و پەیوەندییەکی یەکجار پڕسۆز و خۆشەویستی دروست دەبێت لە نێوان باوک و دایک و منداڵەکاندا، خوای موتەعال لەچەند جێگادا ڕاسپاردە و فەرمانی تەواوی کردووە بە گوێڕایەڵی دایک و باوک، پێغەمبەری ئازیزیش لە سوننەتدا فەرمانی پێ کردووە، چونکە ئازارێکی زۆر ئەچێژن دەبەست پەروەردەکردن و بەخێوکردنی منداڵەوە، بە تایبەت دایک کە منداڵەکەی بە سک هەڵدەگرێت پاشان لە دایک دەبێت هەمووی ئازارە، ئەم منداڵە لە کۆرپەییەوە ماوەی چەندین ساڵ سەرپەرشتی دەکات تا

دەکەوێتە سەر پێی خۆی، پارێزگاری لە خۆی دەکات، ئازار و ئەشکەنجەی ئەم منداڵە هەرگیز دایک و باوک سکاڵای لەسەر ناکات، بەڵکو خۆشحاڵ دەبێت، (حافظ ابوبکر بزار) لە مەسەندەکەیدا دەگێڕێتەوە: بەئیسنادەوە لە بوریدەی باوکییەوە کەسێک طەوافی دەکرد لە حەوشی کەعبەدا و دایکی کرد بووە کۆڵ بە پێغەمبەری خوا ﷺ -ی فەرموو ئایا حەقی دایکم داوەتەوە؟!

لە وەڵامدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر؛ بەڵکو حەقی ئازارێک و شەونخوونی و نارەحەتیەکیشی بۆ نەگەڕاندۆتەوە کە لە کاتی هەڵگرتنی بە سک یان ئەوکاتەی لەدایک بوویت.[71]

خوای گەورە پەیوەندی حەقی دایک و باوکی بە سوپاسگوزارییەوە بەستووەتەوە، لە دوای حەقی خوای موتەعال کە بەندایەتی کردنە ڕاستەوخۆ حەقی دایک و باوک دێت، ئەمەش خوای موتەعال بە ڕەصیدی قیامەت و پاراستنی خێر و چاکە دێت لە قیامەت ( الي المصير)، پێچەوانەکەشی وتنی وشەی ( ئۆف)ە بەرانبەریان لە تاوانی گەورەیە، بەڵام ئەم هەموو حەق و پاراستی کەرامەتەیان پەیوەستە بە بیروباوەڕ و عەقیدەوە ئەگەر هەوڵیاندا کە فێری شیرک و خراپەکاریت بکەن ئەوە گوێیان بۆ ناگیرێت، بەڵام مرۆڤ دەبێت هەر بە ئەدەب و خاوەن ڕەوشت بێت لەگەڵیاندا، خاوەن حورمەت و ڕێز بیت لە ئاستیاندا ئەگەرچی دایک و باوکیش کافر بن، بەڵام لەم ژیانە کورتەدا دەبێت مافی ئەوەیان بۆ بگەڕێتەوە کە دایک و باوکتن.

لە دوای ئەم بەشەی کە لوقمانی دانا و حەکیم ئامۆژگاری ڕێز و مافی دایک و باوکی کرد بۆ کوڕەکەی، پاشان وەسیەتێکی تری گرنگ دێتە پێشەوە ئەویش پەیوەستکردنی هەموو ئەم کارانەیە بەقیامەتەوە، جا بچووکترین کردەوە تا گەورەترین ڕەفتار لای خوای موتەعال ون نابێت و هەمووی پارێزراوە لە دۆسیەی مرۆڤەکاندا لە ڕۆژی لە دایکبوونیان تا کاتی ژیانیان بۆ ناو گۆڕ.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

71- عن أبي بردة أنه شهد ابن عمر رضي الله عنهما، ورجل يماني يطوف بالبيت، حمل أمه وراء ظهره يقول:إني لها بعيرها المذلل ... إن أذعرت ركابها لم أذعرثم قال :يا ابن عمر، أتُراني جزيتها؟ قال: لا، ولا بزفرة واحدة.

## پێش کۆتایی ئەم مەملەکەتە

لێرەدا بەو ئەندازەیە دەوەستین لەسەر ژیانی حەزرەتی محمد ﷺ کە ئەستەمە مرۆڤ بتوانێت بە قەڵەم و کاغەز و وتن باس و وەسفی پێغەمبەران و لەسەرووی هەموویانەوە پێغەمبەری ئازیزمان محمد ﷺ پێناسە بکات و بتوانێت حەقییان بدات.

بۆ زیاتر شارەزابوون لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕەوشتی و هەڵسوکەوتی تەواوکەری ئەم باسە لە کتێبی مەملەکەتی نووردایە کە بە چوار بەرگ کۆمانکردۆتەوە، لێرەوە ڕاستەوخۆ بڕۆ بۆ ئەو مەملەکەتە تا بتوانیت زیاتر و زیاتر ئاشنا بیت بە ژیانی ئەو سەروەرە.

ئەمڕۆ کە ڕێکەوتی (٢٠٢٤/٨/٢٨) چوارشەممە کۆتایی بەم کتێبە هات

داواکارم لە خوای پەروەردگار لێم وەربگرێت و بیکاتە توێشی قیامەتم، خوازیارم لە تۆی خوێنەر لە دوعا و پاڕانەوەی خێر بێ بەشم نەکەیت، تکا دەکەم هەڵەکانیشم بۆ بگەڕێننەوە.

خوای موتەعال لە تاوان و هەڵە و کەم و کورتییەکانم خۆش بێت. آمین

مژدەی ئەوەش دەدەین بە خوێنەرانی ئازیز کەوا بەرهەمی داهاتوو کتێبی مەملەکەتی خیلافەت دەبێت پشیوان بە خوای گەورە.

ئەوی ئەمڕۆ بە دەوری تەختیایە هەلهەلەی مەخلووق
لە دەوری نەعشیا سبحەی دەبینێ وەلوەلەی مەخلووق

بە پەل پەل کردنی سبحەی ئەگەر ببووایە باوەڕیان
دەبوو قەت بەم حەدە نەبووایە بۆ دنیا پەلەی مەخلووق

دەخاتە فکری ئەهلی مەعریفەت شێوەیی جەجاڵ الحق
دەبینی بەعزە ئەشخاسێ بە دوویا خەرگەلەی مەخلووق

وەها پڕ فیتنە بوو عالەم کە ئیبلیسێکی وەک ئیبلیس
نەماوە مەممەنی غەیری کڵێشە و کەڵکەڵەی مەخلووق

لە پەردەی جیلوەیەکتا ڕووغمایە شۆری سەد مەحشەر
نیقابێ لا دە لەو چیهرە، ببینە زەلزەلەی مەخلووق

بە ئاوی تێ گەیشتین ئێمە دنیا، هەر سەرابێ بوو
هەموو دەشچن بە خنکان و لە وشکیشە مەلەی مەخلووق

لە سووقی دەهردا دووکانی هەر کەس موددەتی عومرە
گوهەر دانە بە پشکڵ دانە مەحوی، مامەڵەی مەخلووق

سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز
٢. تەفسیری ئاسان
٣. تەفسیری ڕێبەر
٤. کتێبی پیرۆز، جوولەکە، ئوردزکس، کاتولیک، پرۆتستانت، جۆری تەفسیری
٥. في ظلال القران- سيد قطب
٦. التفسير العظيم- ابن كثير- تحقيق المباركفوري
٧. صفوة التفاسير- الصابوني
٨. مێژووی کۆنی ئەوروپا- جۆن هیدست
٩. لەگەڵ پێغەمبەران دا- عفيف عبدالفتاح الطبارة- وەرگێڕانی: کاوە هاوڕاز
١٠. العلم و بناء الأمم- د. راغب السرجاني
١١. صحيح البخاري- الإمام البخاري
١٢. صحيح مسلم- الإمام مسلم
١٣. أطلس القران- د. شوقي ابو خليل
١٤. قصص الأنبياء- عمرو خاليد
١٥. البوصلة القرانية- د. أحمد خيري العمري
١٦. البداية والنهاية- إبن كثير
١٧. قصص الأنبياء - ابن كثير- تحقيق عبدالقادر الأرناؤوطي
١٨. قصص الأنبياء وأخبار الماضين- ابن كثير- تحقيق: محمد بن أحمد كنعان
١٩. تأريخ الطبري- الإمام الطبري
٢٠. الكامل في التأريخ- ابن الأثير
٢١. تفسير الجلالين- الجلالين
٢٢. المشترک الأنساني- د. راغب السرجاني

٢٣. اللؤلؤ والمرجان- البخاري و مسلم

٢٤. تأريخ العرب قبل البعثة- د. جواد علي

٢٥. قصة الحضارة- ويل ديورانت

٢٦. التعبير رؤية- ابن القتيبهديناوري

٢٧. قصص القرآنية- محمود المصري

٢٨. مێژووی میزۆپۆتامیا ( بلاد مابين النهرين)، وێب سایتی زانكۆی نەوریج، سێ لینكی گرنگ كە باوەڕ پێكراوە لە ڕووی زانستەوە لە خوێندنی باڵای وڵاتی نەرویج

A. NDLA. NO

B. SNL.NO.

C. Forskning No.

٢٨. كيف بدء الخلق- د. عمر و شريف

٢٩. الموسوعة الكاتوليكية (١٩١٢) (the name of mary)

٣٠. مريم أم المسيح، موقع سنة

٣١. حياة الأنبياء ( نوح- عيسى) د. عدنان إبراهيم

٣٢. شانامەی فیردەوسی، حكم ابوالقاسم فردوسی

٣٣. رحلة العقل، د. عمر و شريف

٣٤. Arth Berry ( 1898) A short History of Astronomy

٣٥. Alexander was born the sixth of (تقويم اليونان القديم)

٣٦. ويكيپيديا

٣٧. TIO Stabell كۆلێژی زانستی ئایینی ئۆسلۆ/ مەنهەج

٣٨. Hvem er hvem? كۆلێژی زانستی ئایینی ئۆسلۆ/ مەنهەج

٣٩. أمير الظلام- المؤلف الشيطان!!

٤٠. كۆمەڵێک زانیاری کۆکراوەتەوە لە پێگەکانەوە، لە جێگای خۆیدا ئاماژە بە سەرچاوەکان کراوە

٤١. پرێستی زیندانی ئیولەشمۆ، سەرچاوەی سەرەکی بوو بۆ بە دەست هێنانی ڕاست و دروستی باوەڕی کاتۆلیک و پرۆتستنات و ئوردۆکس، ماندووبوونی جێگای دەست خۆشییە بە ڕاستگۆیانە هاوکارم بوو

٤٢. الأحاديث القدسية: کۆکراوەی فەرموودە قودسییەکانی مۆطأ- مالک، صحيح البخاري، صحيح مسلم، جامع الترمذي، سنن النسائي، سنن أبي (داوود)، سنن إبن ماجه

٤٣. رياض الصالحين- إبی زكريا النووي

٤٤. تأريخ قديم- احمد السواحلي

## پێرست

**MAKWAN KERÎM**

MEMILEKETÎ PÊXEMBERAN - BERGÎ SÊYEM

مەملەکەتی

# پێغەمبەران ٣

ژیانی پێغەمبەرانم نە نوسیوە تا لە شەوانی بێ کارەبای و نەبونی شەحن لە موبایلەکەت، کات بەسەر بردن بیخوێنیتەوە، نوسیومە تا شۆڕشێک دروست بێتەوە لە هەموو بوارەکاندا، شۆڕشی فیکری بیر و باوەڕ، شۆڕشی سیاسی و سەربازی، بۆ هەڵسانەوەمان نوسیومە، بۆ رامانم نەنوسیوە، بەڵکو بۆ کارپێکردن نوسیوومە، بۆ ئەو ڕەوەندەم نوسیوە کە دێت، بۆ ئەو جیلەی کە سەر لە نوێ یەکتاپەرستی و جیهاد و قەڵەم و خوێندنەوە کارکردن وەکو یەک تەماشا دەکەن و ژیان و شارستانییەت دروست دەکەنەوە.


کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی




Cover Design: **Braw** Al-Najjar

لقی یەکەم: هەولێر - بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەللاف

٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤

M.Ktebxana

نرخ: ١٧٠٠٠